

حتَّى يُغَيِّروا ما بِأَنفُسِهِم

نوسینی

عـەمر خـــالید

# گۆڕانی دەروونەکان



وەرگێڕانی:

حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

چاپی یەکەم

[illegible]١٠

عەمر خالید

# حتى يغيروا ما بانفسهم

## ﴿گۆڕانی دەروونەکان﴾

وەرگێڕانی: حسێن محمود هەڵەبجەیی

چاپی یەکەم

٢٠١٠ز

ناوی کتێب: ﴿ حتی یغیروا ما بانفسهم﴾..گۆڕانی دەروونەکان
نووسەر: عەمر خالید
وەرگێڕانی: حسێن مەحمود هەڵەبجەیی
نۆبەتی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠١٠ز
تیراژ: ١٠٠٠دانە
دیزاینی بەرگ: فەرهاد فایەق
چاپخانە: چوارچرا
ژمارەی سپاردن: ( ١٧٠٤ )ی ساڵی (٢٠١٠)ز وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشەکی :-**

سوپاس بۆ خوای جیهانیان .... صەلات و سەلام بۆ سەر پێشەنگی پەیامبەران .... پێشەوامان محمد ﷺ ئەو نێردراوەی کە ڕەحمەتە بۆ جیهان .... وە بۆ سەر هەموو یار و یاوەرانی ، وە ئەوانەی بە چاکەکاری شوێنی دەکەون تا ڕۆژی دوایی ....

پاشان ...

ئەو ڕووداو و مەینەتیانەی ماوەیەکە تێی دەپەڕێنین ، وە بە تایبەتی جیهانی ئیسلامی تێی دەپەڕێنێ ، نەتەوەکەمانی خستۆتە تیاچوون و مەینەتیەوە ..... دەروونەکان سەریان لێ شێواوەو نازانن بەرەو چ ئاراستەیە بڕۆن .... ئازار ... و دەردی سەری هەموانی گرتۆتەوە .... وامان لێهاتووە حەیران ماوین و کەسی هۆشمەندیش سەرگەردان بووە .

دەبێ لەم مەینەتیەدا چی بکەین بۆ ئەم نەتەوەیە ؟ چی پێشکەش بە خۆمان بکەین ؟ گۆڕانکاری لە کوێوە دێت ؟

تەسلیمی بێ ئومێدی مەبن .... دەست لە کارکردنەکانتان هەڵمەگرن .... هێشتا ئومێد ماوە ... بەڵێ .... ئومێد ماوە تیاماندا .... لە هەریەکەماندا .... پێویستە ڕابین و ڕابوون بەر پابکەین .... پێویستە لە ناو ئەم نەتەوەیەدا ڕۆڵمان هەبێت ....

پێویستە هەریەکێکمان ڕۆڵی هەبێت بەرامبەر بە موسڵمانان لەم جیهانەدا ..... هەریەکە لە بواری پسپۆڕیەکەیدا ..... هەریەکەشمان توانای ئەوەی هەیە ....

تۆش هەروەها توانای ئەوەت هەیە هەستیت بە شتێك ..... شتێك پێشكەش بكەیت كە ئەم نەتەوەیە بەرەو پێشەوە بەریت ..... پێویستە بوەستیت بە هەڵوێستەیەكی موسڵمانانە ، كە ئیسلامەكەی و خاكی موسڵمانانت خۆش بوێت .

دەرمانی ئەم نەتەوەیە لە ناوخۆیدایەتی .... چۆن ؟ كاتێ دڵەكان دەكرێنەوە بۆ ئیسلام ئەو كاتە بیكەن بە دەستوری خۆیان و ڕێبازی ژیانیان .....

با بگەڕێین بە كتێبەكەی خوای گەورەدا كە دەستوری ئەم نەتەوەیەیە و بە دوای دەرماندا بگەڕێین بەڵكو بیبینینەوە ...

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنینەوە ((إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى)) واتە ( بێگومان خوای گەورە ، هیچ گەل و نەتەوە یەك ناگۆڕێت هەتا ) .... بۆچی پەروەردگارا؟ .... ئایا گۆڕانكاری ئەستەمە ؟ (( هەتا )) .... ئەی پەروەردگار .... مەرج هەیە بۆ گۆڕانكاری ؟ .... بەڵێ ((حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ)) واتە (( هەتا خۆیان خۆیان نەگۆڕن )) .

كەواتە ئومێد لە ئارادایە و ئەستەم نیە .... ئەوە ووتەی خوای جیهانیانە ... ئەو خوایەی یاساكانی گەردوونی داناوە .... ئەو یاسایەی ئێستا لە ژیانماندا پێویستمان پێیەتی دەستورێكە لە پەروەردگارەوە .... گۆڕانكاریش لە لایەن خوای پەروەردگارەوە دێت ..... بەڵام بە مەرج .... ئەو مەرجە چیە ؟ ئەوەیە كە ئێمە – پشت بە خوا– دەست بكەین بە گۆڕانكاری ناخی خۆمان ....... ئەو گۆڕانكاریە چۆن دەبێت ؟ لە خۆمانەوە ..... لە ناخمانەوە ..... ئەویش بە گەڕانەوە و دەست گرتن بە كەشتی خوای گەورەوە ، گەڕانەوە بۆ لای بە ملكەچی .... كاركردن بۆی بە دڵ و بە گیان تا ببینە یەك نەتەوە .... لە واز هێنان لە خراپە و ، متمانە بە خوا .... وە هیچ گومانێكی خراپ لە ناخماندا بەرامبەر بە موسڵمانان هەڵنەگرین ، وە بە لێبڕان و دروستانە و دڵسۆزیەوە كاربكەین .... وە ڕێز لە بەهای كات بگرین و كاربكەین بۆ سەرخستنی موسڵمانان .... وە چەسپاوبین لە كاتی مەینەتی و جیهاد لە پێناوی خوادا .... وە لە ژیانماندا ئامانجێكمان هەبێت .... كاربكەین بۆ بەدیهاتنی بە زانست و بە كارو بە چەسپاوبوون .

ئەوە بەڵێنە لـە خوای گەورەوە (حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ) خوای گەورەی بەڵێنەکەی دەباتە سـەر .... بڕوام پێبکەن .... زۆر نابات ئەم نەتەوەیە سەروەری و کەرامەتی خۆی بەدەست دێنێتەوە ، زاڵ دەبێت بە سەر عەرشی ئەم زەمانەدا ....

ئەم کتێبە پەیامێکی ئومێد بەخشە وە بەرنامەی کارکردنە شیکردنەوەیەکی ڕامیاری نیە ...... بە دواداچوونی ڕووداوێك نیە لـە ڕووداوەکان ..... وە ڕیپۆرتاژێکی ڕۆژنامەنووسی نیە... بەڵکو پەیامێکە لە دڵەوە ..... لـە عەقڵ و ویژدانەوە ..... بۆ دڵانێك کە تینوون تا پاراوبن و تێر ئاو بن لـە کانیاوی ئیسلام ....

و آخِرُو دَعْوانا أنِ الْحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِين .... وَ الصَلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيدِ المُرْسَلِين ....

دەخوازین لـە خوای گەورە دڵێکی سالم و زمانێکی ڕاستگۆ و کردەوەیەکی وەرگیراومان پێ ببەخشێ ... وە ڕێنومایمان بکات بۆ گوفتارو کرداری چاك تەنها ئەو کۆمەکمانە و باشترین کۆمەکە .....

دەخوازین لـە پەروەردگارمان کە ئەم کردەوەیەمان لێ وەربگرێت کە تەنها لـە بەر ڕەزامەندی خوای گەورەیە .... وە بیخاتە سەر ترازووی چاکەکانمان لـە ڕۆژی دواییدا .... ئامین .

براتان

عەمر خالید

مانگی صَفَر /١٤٢٤ ك

# ﴿ملكەچی بۆ خوای گەروە﴾

## ملكەچی ئەوپەڕی خواپەرستیە:

ملكەچی بۆ خوای گەروە لە گرنگترینی ئەو پەرستشانەیە كە لە خوای گەورە نزیكمان دەخاتەوە و ملكەچی زیادەڕەوی كردنە لە هەست كردن بە هەژاری و پێویستی بوون بە پەروەردگار.....

ملكەچی ئەوەیە كە پەنا بەریتە بەر قاپی خوای گەورە و داوای كۆمەكی لێ بكەیت ، بە دڵت و بە ڕۆحت و بە گیانت هاوار بكەیت ، بگریت بە زەلیلی لە بەردەم خوای بە تواناادا ... دەست بۆ پێویستیەكانت درێژ بكەیت تا دەتوانیت ، فرمێسك بڕێژیت .... هەر خانەیەك لە خانەكانی جەستەت و هەر هەناسەیەكی گیانت داوای ڕزگاری بكات .... لەوەی كە خاوەنی تەوقی ڕزگاركردنە ....

ملكەچی دووعا كردنە بە ئازارەوە .... بە خشوعەوە ....

الله ..... ئای ئەو ووتانە كە جوانن ئەگەر هەست بە ماناكانیان بكەیت .....

لە گەڵمدا ڕابمێنە لە مانای ڕاستەقینەی ملكەچی ...... ملكەچی ئەو پەڕی پەرستشە لە نارەحەتیەكان و مەینەتیەكان و كارەساتەكاندا .

ئەگەر خوای گەورە لە هەستانی ئەم شەودا تەماشای كردین و هەموو دەستەكان بەرزبوونەوە بە ملكەچیەوە ..... ئەوە ئومێد لە ئارادا هەیە ... بەڵام یەكەم جار پێویستە فێری ببین و هەست بە ماناكەی بكەین .

ئایا دەزانی ملكەچی پەرستشی سەرگەردانێكی حەیرانە .... با فێر ببین چۆن لە بەردەم قاپی خوادا خۆمان زەلیل بكەین و بڵێین .... پەروەردگارا .... پەروەردگارا ..... ، باوەك كەسێك بیڵێین كە كەشتیەكەی لە ناوەڕاستی دەریایەكدا تێك شكابێت و هیچیشی بە

دەستەوە نەمابێت بێجگە لە پارچە تەختەیەك نەبێت خەریكە بە خوێناوی دەریاكە دەتوێتەوە و شی دەبێتەوە .

ئایا گوێت لە دەنگی بووە چۆن لە نێوان ئەو شەپۆلانەدا هاوار دەكات ... دوور لە خەڵكی ... چاوەكانی بەرزبۆتەوە بۆ ئاسمان... دڵیشی لە گەڵ هەر ووتنێكی : پەروەردگارا ... پەروەردگارا ... خەریكە دەوەستێت ... ئا ئەوەیە ملكەچی .

## ئایەتەكان و ملكەچی .

خوای گەورە ﷻ دەفەرموێ : ((وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَـٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَـٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾)) الانعام /٤٢-٤٣

واتە : (( سوێند بێت ، بێگومان ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بۆ گەلانی پێش تۆ ، ( ئەی محمد ﷺ) وە تووشی نەبوونی هەژاری و نەخۆشی و ترس و نارەحەتیمان كردن ، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە و پەشیمانی دەربڕن ( ملكەچی بنوێنن ) دەی بۆ نەپارانەوە كاتێ سزای ئێمەیان بۆهات ، بەڵام دڵیان ڕەق بوو ، وە شەیتان ئەو كردەوە خراپانەی بۆ ڕازاندنبوونەوە كە دەیانكرد ) .

– ئەوان كاتێ تووشی نارەحەتی دەبوون كاریان دەكرد ، ئایا وەكو ئەوان بین ؟ ئەگەر ئەمڕۆ نەگەڕێینەوە ، ئەی كەی بگەڕێینەوە ئەی نەتەوەی ئیسلام ؟ پێویستە لە هەموو ئان و ساتێكدا ملكەچ بین و بگەڕێینەوە ... با تەماشای حاڵی خۆمان بكەین ، چی هاتووە ، بە سەر نەتەوەكەمان لە جەنگ و مەینەتی ....

﴿ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾﴾

واته : ﴿(( ئەی محمد ﷺ )) بلّێ : ئایا کێ ئێوه ڕزگار دەکات لە تاریکیەکانی ووشکانی و دەریایی ، کە هاوار و نزای لێ دەکەن بە ئاشکراو نهێنی ( ئەڵێن ) سوێند بە خوا ئەگەر لەم مەترسیە ڕزگارمان بکات ، ئەوا بێگومان لە سوپاسکارانی خوا دەبین ، بلّێ : هەر خوا ئێوه ڕزگار دەکات لەو مەترسیە ، لە هەموو بەلاّو نارەحەتیەك ، پاشان ئێوه هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن﴾

الله ..... تەماشای ووتەی جوانی پەروەردگار بکە ... گەر ملکەچ بین بۆ خواو بگەڕێینەوه بۆ لای لە هەموو نارەحەتیەك دەربازمان دەبێت .... پشت بە خوا وەکو ئەوانە نابین کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسیان دەکات . کاتێ خوای گەورە ڕزگاریان دەکات هاوەڵ بڕیار دەدەن بۆی .... دەمێنینەوه لە سەر باوەڕمان بە پەروەردگار .

((وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ))

واته : (( ئێمە بۆ هەر گوندو شارێك پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت ، دانیشتوانیمان تووشی نەبوونی و کەم دەرامەتی کردووه ( بە زیان و نەخۆشی ) تا لە پەروەردگار بپاڕێنەوه و پەشیمان ببنەوه )) .

((أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ ))

واته : (( ئايا خەڵكی ئەو شارانە ترسيان نەبوو ، لەوەی سزای ئێمەيان بۆ بێت لە شەودا . كاتێك خەوتوون ..... ، ئايا خەڵكی ئەو شارانە ترسيان نەبوو ، لەوەی كە سزای ئێمەيان بۆ بێت ، لە چێشتەنگاودا لە كاتێكدا ياری و گاڵتە دەكەن )).

ئەم ئايەتە گوزارش لە سزا دەكات بۆ كەسێك كە ملكەچ نيە لە بەردەم قاپی خوای گەورەدا ..... ئازيزانم ئەگەر خوای گەورە سزای خەڵكی بدات لە سەر بێئاگاييان كارێكی ئاسان نيە و دەبێ بەرگەی بگرين .

وە كەس ڕزگارمان ناكات لێی تەنها ئەو شتە نەبێ كە ئەوانەی پێش ئێمەشی ڕزگاركردووە .ئەويش ملكەچی و گەڕانەوەيە بۆ لای خوای گەورە ... ياسای : مەرج و وەڵامەكەی .

(( وَلَوْ رَحِمْنَـٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَـٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ ))

واتە ئەگەر ڕەحم بەوان ( بت پەرستای قورەيش ) بكەين ، وە ئەو ناخۆشی و بەڵايەی لە سەريان بوو لايبەين ( بريتی بوو لە برسێتی بۆ ماوەی حەوت ساڵ ) ، بێگومان لە سەركەشی خۆياندا ڕۆدەچوون و بە سەرگەردانی دەمێننەوە ، بەڕاستی ئێمە ئەوانمان تووشی سزاو ئازار كرد ، بەڵام ئەوان لە بەرامبەر پەروەردگارياندا نەهانا و نزا بۆ خوا دەبەن لە كاتی نارەحەتی)).

بەڵێ هەموان چاوەڕوانی موعجيزەن ، تەنانەت بە دووعاش .

دەبينين خوا سزامان دەدات و سزامان دەدا .... بەداخەوە زۆرێكيش ..... جوڵەيان لێوە نايەت بگەڕێنەوە بۆ لای خواو ملكەچ بن بۆی .

پێويستە بگەڕێينەوە بۆ لای خوا ..... چونكە خوای گەورە نارەحەتيمان بۆ دەنێرێ تا بگەڕێينەوە و ملكەچی خوای گەورە بين ، ئەگەر وانەكەين ئەوە مەينەتيەكە توندترو سەختتر دەبێت .

هەندێ جار ، پەرستشمان بير دەچێت و خوای گەورە بانگمان دەكات بۆی . ئاگاداربە نەكەی مەينەتيەكت تووش بێت و ملكەچ نەبيت بۆ خوای گەورە ... بێ ئومێد

مەبە و بێزار مەبە .... هەمیشە ئومێد بە خوا هەبوون هەیە ، ئومێد بەو زاتەی کە خاوەنی هەموو ئەم گەردوونەیە بە شتەکانیشیەوە . ئەو کەسەی هۆکارەکانی بە دەستەوەیە لە نێوان کاف و نونێکدا دەیگۆڕێت ((كُن فَيَكُونُ ))

واتە بلّێ ببە ، دەبێ .

## ملکەچی بۆ خوای گەروە پەرستشی پیغەمبەرانە

با تەماشای پێشەوامان یونس ﷺ بکەین لە سکی نەهەنگەکەدا : پێشەوامان یونس ﷺ لە سێ تاریکاییدا بەند کرابوو، تاریکایی شەو ،تاریکایی دەریا ، تاریکایی ناو سکی نەهەنگەکە . بەڵام چۆکی دانەداو و خۆی نەدا بە دەستەوە ..... زۆر بە ملکەچیەوە لە ناخی دڵیەوە هاواری کرد ((وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ )) الأنبياء/٨٧

واتە (( وە(باسی) زەننون ( یوسف ﷺ بکە کە پێغەمبەری خەڵکی نەینەوا بوو) کاتێ رۆشت بە تووڕەیی(گەڵەکەی بەجێ هێشت ) وای زانی ئێمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین ، جا لە تاریکاییەکاندا هاواری کرد(تاریکایی شەو و دەریا و ناو سکی نەهەنگ) ئەی خوایە بە ڕاستی هیچ پەرستراوێ نیە بێجگە لە تۆ ، پاکی و بێگەردی بۆ تۆ ، بێگومان من لە ستەم کاران بووم )).

تەماشاکە چۆن خوای بەخشندە و میهرەبان وەڵامی دەداتەوە و ، ڕزگار دەکات لەو خەم و نارەحەتیە :

(( فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾))الأنبياء/٨٨

واته ( ئێمەش نزاو هاواری ئەومان گیرا کرد ( یونس پێغەمبەر ﷺ ) و لـه غەم و عەفەت ڕزگارمان کرد ، هەرواش ئیمانداران ڕزگار دەکەین . )

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی بەدر تەماشای سوپای کافرانی کرد کە خۆیان و چەك و تفاقیان زۆرن ، وە تەماشای سوپای موسڵمانانی کرد کە ژمارە و چەك و تفاقیان کەمن .... ئەبیٚ هەڵوێستی چی بووبیٚ ؟ هەردوو دەستەکانی بەرزکردەوە و دەستی کرد بە دوعاکردن تا عەباکەی کەوت و سپیایی سکی موبارەکی دەرکەوت .... وە فەرمووی : (( اللهم ان تهلك هذه العصابة من اهل الاسلام لا تعبد في الارض )) واتە : (( ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەم پاڵەوانانەی سوپای ئیسلام ژێر بکەون ئەوە لـە سەر زەویدا ناپەرسترێیت )) ئەبوبەکری صدیق پێی ووت: بەسە بۆ تکا و ڕجاکردنت لـە خوای گەورە ، بێگومان پەیمانی چی پێداویت پەتەدی ) ( مسلم / ٤٥٦٣)

ئایا بینیت پێغەمبەری خوا ﷺ کاتیٚ هەستی بە لاوازی کرد چی کرد ؟ ملکەچی نواندن بەرامبەر بە خوای گەورە و و گەڕایەوە بۆ لای ..... ئێمەش ئەمڕۆ ئەو پەڕی پێویستیمان بە ملکەچ بوون بۆ خوای گەورە هەیە تا دەروومان لیٚ بکاتەوە و ڕزگارمان بکات ....

## گرنگی ملکەچ بوون و دوعاکردن لە ژیانی ڕۆژانەماندا

باشترین و مەزنترین بارودۆخیٚ کە مرۆڤی تێدا بێت ئەو کاتەیە یادی خوا دەکات ..... بەوە دەروونی پاك دەبێتەوە و ، دڵی ئارام دەبێت ، وەسوەسەی شەیتان دووردەکەوێتەوە لێی.

ئایا هەر ئەوە نیە جیامان دەکاتەوە لـە دروستکراوەکانی تر ؟ کاتیٚ کە یادی خوا دەکەین و ملکەچین بۆی ... ملکەچیی بۆ خوا ئومێد زیندوو دەکاتەوە تیاماندا و وامان لیٚ دەکاتەوە لـە بەرزترین و ڕێزدارترین پلەو پایەدابین لـە دنیاو قیامەتدا ....

ئەگەر مرۆڤ ملکەچ بوونی بۆ خوای گەورە زیاد بکات دڵی پڕ دەبێت لـە ڕووناکی و تاریکایی لـە بەرچاویدا نامێنێت ...

مرۆڤ لەم سەردەمەدا زۆر پێویستی بەوە هەیە کە پەیوەستی پەروەردگاری بێت ، لەم سەردەمی هەڵوەشانەوە و نەمانی ئاکارو ڕەوشتدا ، بە شێوەیەك شەهوەت و ئارەزوو پەنا بەخوا ژیانی مرۆڤایەتی بەرەو دۆزەخ بردووە کە باس ناکرێت .... مرۆڤ وا گومان دەبات کە ئەو شەهوات و ئارەزوانە کۆتاییان هەیە ، وە دەتوانێت بوەستێت و بەختیار بێت و بحەوێتەوە.

هیچ دەروازەیەکی ترمان نیە لەم سەردەمە نارەحەتەدا ..... ئەی لاوان .... تەنها بە گەڕانەوە نەبێت بۆ لای خوا ، و وەستان لە بەردەم قاپیەکەیدا و ملکەچی نواندن بۆی ، چونکە ملکەچی بۆ خوا ڕێگای پێغەمبەرانە لە هەموو ئان و ساتێکدا ، لە فەرمودەیەکی ( صحیح) دا کە ( الترمذي ) گێڕاویەتیەوە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (( عَرَضَ عَلي رَبي لِيَجْعَلَ لِي بطحاء مَكة ذَهَب ، قُلْتُ: يارَب أشْبَعُ يَوماً وَ أَجْوعُ يَوْماً فَإذا جُعْتُ تَضَرَّعْتُ إلَيْكَ وَ إذا شَبعت شَكَرْتُكَ وَ حَمَدْتُكَ )) ( الترمذي / ٢٣٤٧) واتە ((خوای گەورە پێشنیاری بۆ کردم کە چەمی مەککە هەمووی بکات بە زێڕ ، ووتم نا پەروەردگارم ، با ڕۆژێ تێر بم و ڕۆژێ برسی ، کە برسی دەبم ملکەچی دەنوێنم بەرامبەرت و تێریش بم سوپاس و ستایشت دەکەم .))

لە فەرموودەیەکی تردا دەشتەکیەك یەت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: فێری شەو نوێژم بکە .. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ (( الصلاة مثنى مثنى و تشهد في كل ركعتين و تخشع و تضرع و تمسكن، و تذرع ، و قنع يديك ، يقول ترفعهما الى ربك ، مستقبلا ببطونهما وجهك ، و تقول: يارب ، يارب ، و من لم يفعل ذلك فهو كذا و كذا)) الترمذي /٣٨٥) واتە ((نوێژ ، دوو ، دووە ، لە هەر دوو ڕکەعەتا تەحیات دەخوێنیت و شایەتومان دێنیت ، ملکەچی دەنوێنیت ، دەستت بلاّو دەکەیتەوە ، دەفەرموێ : بەرزی دەکەیتەوە بۆ پەروەردگارت، ناو لەپی دەستت بە ئاراستەی روخسارت و دەڵێیت: پەروەردگارا ، پەروەردگارا ، ئەوەی وا نەکات ، ئەوە وایە و وایە .))

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا کێ زیاترین کەس دەردی سەرە ؟ فەرموی (( اشد الناس بلاء الانبياء ثم الامثل فالامثل ، فيبتلى الرجل على قدر دينه ، فان كان دينه صلبا زيد بلاءه ، و ان كان دينه رقة يبتلى على قدر دينه )) الترمذي /٢٣٩٨ ) واتە (( زۆرترینی ئەو

کەسانەی تووشی نارەحەتی ( دەردی سەری ) دەبن پێغەمبەرانن ، پاشان نمونەی ئەوان و نمونەی ئەوان ، مرۆڤ بە رادەی دینداریەکەی تووشی نارەحەتی دەبێت ، ئەگەر دینداریەکەی رەق و چەسپاو بێت نارەحەتیەکانی زیاترە ، وە ئەگەر دینداریەکەی ناس و سادە بێت ، بە رادەی دینداریەکەی تووشی نارەحەتی و بەلاّ دەبێت )

تۆ تەنها نیت کە لە دەردی سەریدا بیت .... پێشتریش پێغەمبەران لەو پەڕی دەردی سەریدا بوون ، ئارامیان گرتووە و ملکەچ بوون بۆ خوا .... جارێکی تر ئەم ڕستەیە بخوێنەرەوە (( مرۆڤ بە رادەی باوەڕەکەی تووشی دەردی سەری دەبێت )) گومان دەبەم لە ئێستە بە دواوە ڕازی دەبیت بە قەدەری خواو ئارام دەگریت .... و دەوەستیت لە بەردەم دەرگاکەیدا و خۆت بە زەلیلی و ملکەچی دەنوێنی ....

## پشت کردنە قاپی خوای گەورە خۆبەزلزانینە

خۆشەویستانی بەڕێز ، دوای هەموو ئەمانە وێنای بکەن هێشتا لاوانێك هەن تەماشای ئەو کەناڵە ئاسمانیانە دەکەن کە تەنها شتە خراپەکان پەخش دەکەن ... و نوکتە بە ئینتەرنێت دەنێرن و ئافرەتان دەبینیت سەرقاڵی گوێگرتنن لە گۆرانی .

ئایا ئەوانە هەست ناکەن کە مەترسی نزیك بۆتەوە ؟

ئایا هەست بە مردن ناکەن لە هەر ساتێکدا بێت لە پڕ دێت بۆیان ؟

براو خوشکەکانم ... کوڕان و کچان ... بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و تامی شیرینی ئیمان بچێژن لە دڵەکانتانا گۆڕان بە سەر خۆتانا بێنن ، خوای گەورە گۆڕانمان بە سەردا دێنێت ، ئەو تەنگەتاوی و مەینەتی و جەنگانە بە سەرمانەوە لا دەبات .

بڕوام پێبکەن ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهاندا ڕوودەدات بە هۆی ئێمەوەیە .بە هۆی هەڵەشەیی و بە هۆی نەزانین و بە هۆی پشت کردنە قاپی خوا و بە هۆی خۆبەزلزانین و خۆ بە گەورە زانین ، هەتا کەی ؟ هەتاکەی براو خوشکەکانم لە ناو دەریای سەرگەردانی و تیا چووندا نغرۆ بین ؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بگەڕێینەوە ؟ بەڵێ بەخوا کاتی هاتووە .... هیچ ڕێگایەك نیە بۆ بەرزکردنەوەی پلەو پایەی ئەم نەتەوەیە تەنها بە گەڕانەوە نەبێت بۆ لای

خوای گەورە .. خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ﴾ الرعد (١١)

واتە (( بێگومان خوای گەورە هیچ هۆز و نەتەوەیەك ناگۆڕێت تا ئەوان خۆیان گۆڕانكاری بە سەر خۆیاندا نەهێنن .))

## ملكەچیی چارەسەرە :

بە هۆی بارودۆخی ئێستامانەوە هەست بە تەنگە تاویەكی زۆر دەكەین .... براكانمان لە هەموو شوێنێ دەمرن ...ئێمەش لە شوێنی خۆمانەوە دەترسین ، حاڵەتی ئابووریش نارەحەتە ، لاوان نازانن چی بكەن ، ئەمەیە فیتنە .... ئەمەیە كە دوژمن بیخوازێت بۆ مان .... ئەمە ئاواتی جیهانی رۆژئاوایە بۆ ئێمە ... دەیبینیت ئایا سەركەوتووە ؟ بەلاَم ئایا سەركەوتنەكەی درێژە دەكێشێت ؟ یان لێ ی دەستێنینەوە ؟ چونكە وەك نەتەوەیەكی ئیسلامخوازی مافی ئێمەیە ؟ نەتەوەیەك خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ : ((كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ)) ال عمران (١١٠) .

واتە (( ئێوە ( ئەی موسڵمانان ) باشترین گەلێك بوون ، بۆ خەڵكی هێنرابێتە دی ))

هەست دەكەین كە سەرگەردانین ... پیرۆزیەكانمان بە دەستی دوژمنەكانمانەوەیە ، ئیتر چۆن بگەڕێینەوە ؟ بەخوا هیچ رێگەیەك نیە ، تەنها گەڕانەوە نەبێت بۆ لای خواو ملكەچیش چارەسەرە ، لەوانەیە ئاسانترین شت بێت كە وەك سەرەتایەك ئەنجامی بدەین ، خوای گەورەش بە توانایە كە ناخمان بگۆڕێت بەلاَم دوای ئەوەی كە ملكەچ بین ، زەلیلی خۆمان بۆ خوا بنوێنین ...

یادی وتەكەی ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل بكەرەوە : (( وەك كەسێكی سەرگەردانی ناو دەریایەك ملكەچ بن و بگەڕێنەوە كەسێك كە هیچ شك نەبات بێجگە لە پوشێك نەبێت))

لاوێك لە ڕێگای ئیمەیڵەوە نامەیەكی بۆ ناردم ، كە دوعای ملكەچی تێدایە ، داوای لێكردم باسی بكەم . پەروەردگارا ئێمە زوڵممان لە خۆمان كرد و لێمان خۆشببە ... پەروەردگارا تۆ لە كتێبەكانتا كە ناردووتە فەرمانمان پێدەدەكەی كە بەندە ئازاد بكەین پەروەردگارا ملمان لە بەردەستایە و ئازادی بكە ... پەروەردگارا تۆ لە كتێبەكەتدا دات بەزاندووە فەرمانمان پێدەكەیت كە دەست بە ڕووی هیچ هەژارێكەوە نەنێین كە لە بەردەرگاماندا بوەستێت ، پەروەردگارا ئێمە لە بەردەم قاپی تۆدا وەستاوین و دەست مەنێ بە ڕوومانەوە ))

خوای گەورە حەز دەكات گوێی لە دەنگی بەندەكانیەوە بێت كە ملكەچیی دەنوێنن .... لە بەر ئەوە دەبینیت چەندین ڕووداو هەیە لەم گەردوونەدا و لە ڕۆژگاردا ڕوودەدەن و دێت بە سەرماندا هەتا بگەڕێینەوە بۆ لای و ملكەچ بین ... لەوانەش خۆرگیران و ...... باران بڕان و ... .

خۆشەویستانی بەڕێز با هەموو ڕۆژەكانمان بكەین بە عەرەفە بە دڵێكی ڕاستگۆیانە و ملكەچ و زەلیلەوە لە خوا بپاڕێینەوە بەڵكو ڕەحمان پێ بكات و ڕزگارمان بكات .
بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ..... بگەڕێنەوە بۆ لای خوا .... بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ڕزگارتان دەكات

# ﴿ یەكبوونی نەتەوە ﴾

## واقیعی نەتەوە :-

لە ڕاستیدا واقیعی نەتەوە واقیعێكی تاڵە ... بە تایبەتی ئەوەی بە سەرماندا هاتووە لەم چەند ساڵەی دواییدا .... لە مەینەتی زۆر ، نارەحەتترینیان دووریمانە لە خوای گەورە وە لە گەڵ داڕووخانی بەهاو ڕەوشت و ئاكار ، و دواكەوتنی تەكنەلۆژیا و زانست .... ئەنجامی ئەو مەینەتیانە چی یە ؟ وای لە زۆرێك لە لاوان كردووە كە تووشی نەخۆشیە

کۆمەڵایەتیەکان بین .... وەکو خەمۆکی ، دۆش دامان ، بێ ئومێدی ، متمانەمان بە خۆمان نەماوە ، ڕۆژئاوا بە لامانەوە وەکو نیگاو ئیلهامی لێهاتووە ، لە هەموو شتێکدا چاویان لێ دەکەین ... لە ڕۆشتن بە ڕێوە هەتا خواردنیش ..وامان لێهاتووە هەست بە لاوازی دەکەین ، با ناخی خۆمان بگۆڕین(( إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ )) ( الرعد – ١١ )

واتە:﴿ بۆ خوا هەیە فریشتەی بێشومار کە بە نۆرە بەدوای یەکدا دێن، تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەر و پشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خوا، بێگومان خوا بارودۆخی هیچ گەل و نەتەوەیەك ناگۆڕێت( لە خۆشیەوە بۆ ناخۆشی یان لە زەلیلیەوە بۆ سەربەرزی یان لە گرانیەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان ئەکرێ نەیگۆڕن و نەیکەن، کاتێکیش خوا بیەوێت بەڵایەك بەسەر هەر میللەتێکدا بێنێت(لە دەرەنجامی سەرکەشی و یاخی بوونیان) ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لە خوا فریایان بکەوێت و رزگاریان بکات﴾.

لەوانەیە بپرسن : گۆڕان چۆن دەبینن ؟ ئەو گۆڕانە چیە کە بانگەشەی بۆ دەکەین و دەیخوازین ... ؟ گۆڕان گواستنەوەیە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی باشتر لەو ، تا وەك پێشترمان لێ بێتەوە ...

## نەتەوەی ئێمە مەزنتری نەتەوەیە لە سەر زەویدا .....

ئەگەر نەتەوەیەکی تر بێجگە لە ئیسلام ئەوەی بە سەرماندا هاتووە بە سەر بهاتایە ، ئەوە هەر نەدەما .... بەڵام ئێمە هێشتا ماوین ، بەڵێ هەست بە لاوازی و نارەحەتی دەکەین ... بەڵام خوای گەورە دەفەرموێ (وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي

ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ)) (القصص /٥-٦)

واته : ( ئێمه دەمانەوێ (به چاكەی خۆمان) منەت بنێین به سەر ئەوانەی كه لاواز و ژێر دەست كرابوون لـه وولاتی ( میسردا ) وه بیانكەینه پێشەوا و بیانكەینه میراتبەرانی ( فیرعەون ) وه دەسەلاتداریان بكەین لـەو زەویەدا)

بەلێ پەروەدگارا ئێمه لاوازین ....)

خوای گەورە دەیەوێت كه ئەو كۆمەلـه كەسه لاوازه سەركەوتوو بكات .... چۆنه به لاتانەوه ئەگەر ئەو خەلكه لاوازانه مەزنترین نەتەوه بن لـەم زەویەدا ؟

خۆشەویستانی بەرێز ..... ئامانجمان ئەوەیه كه ئەم نەتەوه خێردارترین نەتەوه بێت لـه مێژوودا ... بۆچی .؟ ئایا ئەمه دەچێته بابی خۆ به زلزانین به سەر گەلانی تری سەر زەوی ؟ نا ، نه به خوا هەرگیز ! ئەم زەویه ئیسلام بۆ ماوەی (١٣٠٠) سالْ زیاتریش حوكمرانی كرد زەویش لـه ئاسایش و ئارامیدا بوو ... ژیان تێیدا زۆر زۆر لـەم ژیانەی ئێستای ئێمه خۆشتر بوو .... ئەنجامەكەشی هەموو ئاینەكان هەرگیز ئەو ئازادیەیان نەبینیبوو كه لـه سایەی ئەو ماوەیەدا بینیبوویان ، بێگومان هەندێ هەلـەش هەبوو لـەو سەردەمەدا .... لـه گەلْ ئەوەشدا ئاسوودەترین مێژوو بوو لـه ژیانی ئەم نەتەوەیەدا ...

دەی ...... با یەكبگرین و سەر لـه نوێ ئەم نەتەوەیه راپەرێنینەوه ... تا وەكو پێشووی لێ بێتەوه .... تا خۆمان بگۆرین بەلـكو خوای گەورە سەرمانخات و حالـمان بگۆرێت ....

## زۆر به سانایی یاساكه بریتی یه له (حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ)

برای ئازیزم ئێمه چیمان دەوێت ؟ وه ئومێدی چی دەخوازین ؟ دەخوازین سەروەریی بگەرێتەوه بۆ ئیسلام لـه ناو نەتەوەكاندا ..... وه ئەم نەتەوەیه وا لێ بكات پێشەنگی سەر زەوی بن ... ئایا بۆ ئەوەی كه زولـم و زۆر بسەپێنێ لـه سەر زەویدا ؟ نا ، نه به خوا بەلـكو بۆ بەختیاری مرۆڤایەتی ... خوای گەورە ئەوەی دەوێ لـەم نەتەوەیه ... بەلام ئایا

ئەشیٚ ئەوە ڕوودات ؟ بەڵێ ، بە خوا ئەشیٚ ، بە دڵنیاییەوە سەرت سوڕ دەمێنیٚ ، وە دەڵێیت : ئا لەم بارودۆخەدا !! لەم دۆش دامانەدا !! ئەم متمانەیەت لە کوێوەیە ؟ من دڵنیام چونکە بەڵگە یان یاسام بەدەستەوەیە.

ئێوەش دەڵێن : مرۆڤەکان زەمەنێکی درێژە چارەسەریان نەدۆزیوەتەوە ! وە نەیان توانی هیچ شتیٚ بگۆڕن ! بەڵیٚ ، ئەشیٚ ڕوودات .... ئەگەر بە یەك شت کاربکرێت .

دەڵێن ئێمە نەتەوەیەکی بێئاگاین لە پێگەمان لە نێوان نەتەوەکاندا بۆ سەد ساڵ دەچێت ، پێمان دەڵێیت : یەك شت ؟ بەڵیٚ یەك شت ، سوێند بە خوای مەزن ، پێویستە متمانەمان پێی هەبیٚ ، وە نەتەوە بڕوا و لێبڕانی تەواوی هەبێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارا ، یەك شت متمانەمان پێی هەبیٚ و ڕاپەڕێنیٚ (حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ) ئەوە ئایەتێکی قورئانیە ! یاسای گۆڕانە ، ئومێدە ... بەڵکو تاکە چارەسەرە بۆ دەربازبوون لەم قەیرانە کە سەدەیەك چووە بە سەریدا ....

## بەڵگە چی یە ؟

' خوای گورە کاتێك ئەم گەردوونەی دروست کرد یاساگەلێکی بۆ دانا کە حوکمی بکات ، ئەو یاسایانەش لە گەڵ مانەوەی زەویدا هەردەمێنیٚ ..... ئەو یاسایانە چین ؟ لە چ شتێکدا هەن ؟

ئەوانە کۆمەڵە یاسایەکن لە هەموو شتێکدا ، لە سروشتدا .... لە ڕێی مرۆڤدا ... لە زەویدا ... وە ئەگەر بمانەوێت پێشەنگی ئەم زەویە بکەین پێویستە ئەو یاسایانە بەکاربهێنین .... چونکە بنەمایەکن لە بنەماکانی ژیان .

برای ئازیزم .... ئەگەر کەسێك بیەوێت سەرکەوێت بە سەر شاخێکی بەرزدا و بیەوێت بفرێت ، پێی دەڵێن : بە هۆی یاسای ڕاکێشانەوە دەکەویت و ئێسك و پروسکت دەشکێت .... نەخۆش دەچێت بۆ لای پزیشك و ئەویش دەرمانی بۆ دەنوسیٚ ، پێی دەڵیٚ : ئەم

دەرمانانە بەكاربهێنە و پاش سێ هەفتە باش دەبیت ، باشە ئایا پزیشكەكە كەسێكی زۆر بلیمەتە ؟ بێگومان نەخێر ، بەڵام پزیشكەكە ئاشنایە بە یاساكانی پزیشكایەتی .

وە هەروەها یاسای نەریتی كۆمەڵایەتیمان هەیە ..... ئەوەی بەكاری بێنێ دەكەوێتە گەڕ .... ئەی ئەو یاسایە چیە ؟ بریتی یە لە ((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ )) ( الرعد – ١١)

گۆڕانكاری بكەین .... لە ئایندەدا دەبینە پێشەنگ ...

خوێنەری خۆشەویست ... با گۆڕانكاری بسازێنین ، ئەو كاتە دەبینیت خوای پەروەردگار ڕوكاری زەویمان بۆ دەگۆڕێنێ ، ئێمە هەموو ڕۆژێ دەڵێین : بۆچی حاڵمان بەم شێوەیە ؟ بۆچی سەرناكەوین ؟ ئازیزانم ، سەرناكەوین چونكە یاسایەك هەیە وەكو یاسای ڕاكێشان لە ژێرماندا بزر بووە ،تا بەكاری نەهێنین سەرناكەوین و تێك دەشكێین وەكو چۆن ئێستە دووچاری بووین ، ئەگەر ئەو یاسایەمان بەكارهێنا خوای گەورەش بارودۆخی زەویمان بۆ دەگۆڕێت ، یاساكان هۆكارن، هەڵس و كەوت دەكەین لە گەڵیاندا و ئەنجامەكانمان دەسەت دەكەوێت ...

ئایا لەم مانایە تێگەیشتیت ؟ ئەم یاسایە دروشمێك نی یە لە دروشمەكانی خەڵكی سەر زەوی ، ئەمە ئایەتێكی قورئانی یە (حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ).

## چۆن بگەین بە ئامانجمان :

ئازیزانم ، بۆ ئەوەی بگەین بە ئامانجمان پێویستە دوو هۆكار لە ئارادا هەبێ

یەكەم :– یاسا

دووەم :– توانای ڕاپەڕاندن

ئەم یاسایەش پێغەمبەر ﷺ و یاوەرانی ڕایان پەڕاندووە (٢٥) ساڵ سەركردایەتی ئەم نەتەوەیەیان كرد ،ئەوان لە تاریكستانێكدا بوون زۆر لە ئێستا خراپتر ، پێغەمبەری خوا

(٢٥) ساڵ سەرکردایەتی ئەم نەتەوەیەی کرد  و ڕووکاری زەوی پێ گۆڕی ... بۆچی ؟ چونکە یاسایان ڕاپەڕاند ...

ئەی نەتەوەی ئیسلام .... دەبێ بگەینە ئەو باوەڕە .... ڕێگای گۆڕانکاری درێژە و سەختە ، بەڵام پێویستە دەست بکەین بەو کاروانە ....

برایانم .... ئاگاداربن : نەهێڵن بێئومێدی زاڵ ببێت بەسەرتانداو هەست بە دۆش دامان بکەن ، تەنها بە گرتنە بەری یاسا ، ڕزگارمان دەبێت لەم هەموو شتە ، چونکە خوای گەورە خۆی جەختی لە سەر دەکات ، کاتێکیش دوور کەوتینەوە لەو یاسایە ، دڵەکان پیس بوون و سەرکردایەتی توایەوە ، پاشان ڕۆژئاوا هات ، بەڵام چۆن هات؟ چونکە ڕۆژئاوا بەشێکی لەو یاسایە ڕاپەڕاند ، بەڵام هەموو یاساکە نا ، لە بەر ئەوە تا ماوەیەك باڵا دەستە ، بەڵام کێ هەمیشە پێشەنگ و باڵا دەست دەبێت ؟ ئەو کەسەی هەموو یاساکە ڕاپەڕێنێت ....

## بۆ خۆت مەژی و بەسە خۆپەرستی :

یەکبوونی ئەم نەتەوەیە پێویستە بگەڕێتەوە ، لە گەڵمدا وێنای بکەن ، ئەگەر یەکبوونی ئەم نەتەوەیە بگەڕێتەوە، ئەوە دەبێت بە یەك دەست و یەك ئامێز و یەك ڕۆح ....

لە بەر ئەوە پێویستە یەکەمجار خۆمان بگۆڕین ، با واز لە مەزن ڕاگرتنی (من ) بێنین و نەریتی (بۆ خۆمان بژین) بێنین ،چونکە ئیسلام ئاینی یەك بوون و یەکتاپەرستیە ، ئەوەتا چوار ئامێزمان بۆ دادەنێ کە نەتەوەی لێ پێك دێت :

**ئامێزی یەکەم** : کە مەزنترینیانە : ئامێزی نەتەوەی ئیسلامە ... خوای گەورە دەفەرموێ :

(إِنَّ هَـٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ (الانبياء – ٩٢)

واتە : ( بێگومان ئا ئەمەیە ئاین و دینی ئێوە کە یەك ئاین و بەرنامەیە ، وە منیش پەروەردگارتانم ، کەواتە بمپەرستن)

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾﴾ (المؤمنون –٥٢)

واتە : ( بێگومان ئەمەیە ئاین و دینی ئێوە کە یەك ئاین و بەرنامەیە وە منیش پەروەردگارتانم ، کەواتە خۆتان بپارێزن لە تۆڵەم )

پاشان **ئامێزی دووەم** : ئامێزی نیشتمان و زەویە : خۆش ویستنی ئەو نیشتمانەی ئینتیمامان هەیە بۆی بەشێکە لەم ئاینەمان ، پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە مەککە دەرچوو ، تەماشای مەککەی کرد و گریا و فەرمووی (( و الله لاحب الارض الی قلبي ، و لو لا اهلك اخرجوني ما خرجت ابدا )) الترمذي –٣٩٢٥)

واتە (بە خوا خۆشەویسترین خاك و زەویت بە لای دڵمەوە ، ئەگەر دانیشتوانەکەت منیان دەرنەکردایە هەرگیز دەرنەدەچووم)

پاشان دەتخاتە **ئامێزی سێیەم** ەوە : کە بریتیە لە خێزان ، فەرمانت پێدەدات بە چاکەکردن لە گەڵ دایك و باوکتدا و بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم ...

**ئامێزی چوارەم** : کە بچوکترە ، بریتیە لە ئامێزی دراوسێ ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( مازال جبريل يوصيني بالجار حتى ظننت انه سيورثه ) ( ابو داود ٥١٥١ و الترمذي ١٩٤٢)

واتە (( جوبرەئیل ﷺ ئەوەندە باسی دراوسێی بۆ کردم وا گومان دەبرد کە دەبێتە میراتگریش ))

تەماشای ئەم ئامێزانە بکە چەند گەرمن : نەتەوەکەم ، نیشتمانەکەم ، خێزانەکەم ، دراوسێکەم ... ئایا دەزانی چۆن پەرتەوازە بووین ؟ .... هەموو ئامێزەکان دیارنەمان .... هەرکەسەمان خەمی خۆیەتی .....

لە بەرامبەردا تەماشای ڕۆژئاوا بکە چۆن بەرنگارمان بوونەتەوە .

– بازاڕی ئەورووپی هاوبەش :

– یەکیەتی ئەورووپا

–دراوی یەکگرتووی ئەورووپا ( یۆرۆ)

– یەك ڤیزا .... تەنانەت وولاّتەکەیان ناوناوە ( نەتەوە یەککگرتووەکان ) ، کاریان لە سەر ئەوە کردووە و گەشەیان پێداوە ، بەشێکیان لە یاساکە ڕاپەڕاندووە ، ئاستیان بەرزبۆتەوە ، بەلاّم هێشتا ئێمە گرنگی بە ( من ) دەدەین ، وە هەندێ لە لاوان بە دوای ئەوەدا دەگەڕێن چۆن ئازاد بن و دووربن لە کەسوکاریان ، دەیانەوێ لە گەلّ هاوڕێکانیاندا بژین . وە ئەو لاوە دەرگای ژوورەکەی دابخات و و لە بەردەم کۆمپیوتەردا دانیشێت و بە بێ ئەوەی کەس هەراسانی بکات ، ئەوە (من ) ە ... لە بەر ئەوەش نەتەوە فەوتاوە .... دروشمەکانی ئیسلام هەمووی دژی ( من ) ە

## ئاینمان ئاینی یەکبوونە

خوای گەورە لە ڕۆژێکدا پێنج جارکۆمان دەکاتەوە بۆ نوێژکردن لە مزگەوتا ، بەو شێوەیە دانیشتوانی ئەو گەڕەکە لە ڕۆژێکدا پێنج جار کۆ دەبنەوە ، وە هەروەها ڕۆژی هەینیش .

پاشان مانگی ڕەمەزانیش دێت : هەموو ئەم نەتەوەیە لە سالّێکدا (٣٠) ڕۆژ بەڕۆژوو دەبن ، و ڕۆژوو دەشکێنن ، لە هەمان ساتیشدا پارشێو دەکەن .

ئا ئەوە ئاینی ئێمەیە .... لەوە زیاتر چیمان بۆ بکات تاوەکو یەکبگرین ؟

پاشان خوای گەورە لە سالّێکدا دە ڕۆژ کۆمان دەکاتەوە تا پێکەوە حەج بکەین : پۆشاکەکان یەك جۆر و یەك ڕەنگن ، مەراسیم و ووتەکان بە یەك شێوازە هەموان دەلّێن ( لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْك ) .... تەنانەت ئاینەکەمان ناوی یەکتاپەرستیە ، بە خوا ئەگەر هەر دەولّەتێك لە دەولّەتەکان بیەوێت یاسایەك دابڕێژێت بۆ خۆی لە ئیسلام باشتر شك نابات...

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : (( المؤمن للمؤمن كالبنيان ، يشد بعضهم بعضا )) مسلم ٦٥٢٨ / و الترمذي : ١٩٢٨) واتە (( ئیماندار بۆ ئیماندار وەك دیوار وان هەموویان یەکتر دەبەستنەوە ))

ئەوە ئاینەکەی ئێمەیە ، با (من ) لە خۆمان دارنین و بلّێین : ئێمە بۆ ئەم نەتەوەین و ئامانجی من نەتەوەکەمە با لە سەر حسابی خێزانەکەشمان بێت .... چۆن دەبێ ئاینەکەمان بەو شێوەیە بێ و پەرتەوازە بین ؟

## پەروەردگارا نەتەوەکەم ..... نەتەوەکەم

تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکە ، کە نوێنەرایەتی یەکبوونی ئەم نەوەیە دەکات و دەگری و دەفەرموێ : ((يا رَبّ أُمَّتي ... أُمَّتي)) واتە:((پەروەدگارا نەتەوەکەم ، نەتەوەکەم ....)) جوبرەئیلیش ﷺ دادەبەزێ و پێی دەڵێ : ((پەروەردگارت پێت دەفەرموێ : ئێمە ئازاری نەتەوەی تۆ نایەین )) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (( إنَّ لِكُلِّ نَبِيّ دَعْوَةٌ مُسْتَجابَةٌ تعجل بها الانبياء في الدنيا ، الا انا إدَّخَرْتُ دَعْوَتي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَوْمَ القِيَامَةِ ) ( مسلم (٤٩٠ و الترمذي ٣٦٠٢) واتە : (( هەریەکێ لە پێغەمبەران خاوەنی دوعایەکی وەڵامدەرەوەن ، پێغەمبەران هەموویان لە دونیادا دوعای خۆیان کرد ، تەنها من نەبێ دوعای خۆم هەڵگرت بۆ شەفاعەتکردنی نەتەوەکەم لە ڕۆژ قیامەتدا ))

## چەند نمونەیەك لە پیاوانی ئەم نەتەوەیەمان

**جابری کوڕی عبداللە** ﷺ: هاوەڵان (١٥) ڕۆژ سەرقاڵی هەڵکەندنی خەندەقن .... بە هۆی سەختی برسێتیەوە هاوەڵان بەردیان بەستبوو بە سکیانەوە ... جابری کوڕی عبداللە ﷺ هات و ووتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی پێغەمبەری خوا لە ماڵەوە مریشك و هەندێ نانی جۆمان هەیە ...ئەی پێغەمبەری خوا وەرە با بچین نان بخۆین .... پێغەمبەر ﷺ تەماشای کرد و پێی ووت : (( هەر خۆم ؟) جابر ووتی : با پیاوێ یا دوو پیاوت لە گەڵدا بێت ... پێغەمبەر ﷺ لە سەر گردێك وەستاو فەرمووی : ( يا مَعْشَرَ المُهَاجِرين ، يا مَعْشَرَ الأنْصار ، غَداؤُنا اليَوم عِنْد جابر بن عَبْدُالله ) واتە :( ئەی گرۆی کۆچکەران ، ئەی گرۆی پشتیوانان ، نانی نیوەڕۆمان لای جابری کوڕی عبداللە یە ) جابر دەڵێ : بە پەلە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بە خێزانم ووت : فریا کەوە پێغەمبەری خوا بە خۆی و سوپاکەیەوە دێن بۆ ئێرە ....!! خێزانە ئیماندارە موسڵمانەکەشی ووتی : خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن ... ئیتر جابر گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ... پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ((ئەی جابر ، ئەمرۆ تۆ دەرگاوانی )) پێغەمبەر ﷺ نانەکەی ئامادە کرد ... جابریش دە دە خواردنی ئەدیا بە هاوەڵان و دەچوونە دەرەوە ، بەو شێوەیە هەموو سوپاکە نانیان خوارد ، پاشان جابر هاتە

ژوورەوە و ووتی : هەرکاتێك کۆمەڵێکم بەرێ دەکرد دەمووت کۆمەڵەکەی دوای ئەمان خواردنیان بۆ نامێنێ ، بەڵێ هەموویان تێریان خوارد و ددانیان پاك دەکردەوە ، جابر ووتی : پێغەمبەر ﷺ پێی ووتم ( ئەی جابر بەرەکەتی خوا برژێ بە سەرتا و بە سەر ماڵتا بۆ خواردنەکەت ) ... جابر ووتی: منیش چوومە ژوورەوە ، تەماشا دەکەم خواردنەکە هەر وەکو خۆی وایە تەنها پارچە مریشکێکی نەبێ کەمی کردبوو ( البخاری ٣٠٧٠/ مسلم ٥٢٨٣)

## عومەری کوڕی خەتاب

تەماشای کەسایەتی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بکەن ، کاتێ منداڵە بچووکەکانی دەبینی ، باوەشی پیا دەکردن تا سەریان بەریەکتر دەکەوت ، پاشان دەیووت : (( ئا بەو شێوەیە بن ... )) وە لە کاتی سەرەمەرگیدا و کاتێك خوێن لە جەستەی دەرژا چاوەکانی کردەوە تا بڵێت : ئایا خەڵکەکە نوێژیان کرد ؟؟

ئەی موسڵمانینە .... ئەوەیە یەکبوون ، خەم خواردن بۆ نەتەوە و وازهێنان لە ( من )..

## هەتیوەکانی ( جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ﷺ)

تەماشای کەسایەتی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ﷺ بکەن ، کاتێ کە شەهید کرا ، پێغەمبەر ﷺ منداڵەکانی برد و فەرمووی : (( کێ منداڵەکانی جەعفەر بەخێو دەکات ؟ یەکێك ووتی من ئەی پێغەمبەری خوا ... یەکێکی تر ووتی : من ئەی پێغەمبەری خوا ، پاشان یەکێکی تر ووتی من ئەی پێغەمبەری خوا ... گێڕەرەوەکە دەڵێ ئەو سیانە زۆر هەژارتربوون لەوانی تر !...

سەرت سوڕنەمێنێ لە کێبڕکێی ئەو سیانە لە گەڵ هەژاری و ناتەواویشیاندا چونکە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ﷺ بەهۆی ئەوەوە کە زۆر ئیسلامی خۆش دەویست و سۆزی هەبوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نابوو (باوکی هەژارەکان ) ( الترمذی ٣٧٦٦/ ابن ماجة ٤١٢٥)

وە تەماشای کۆچکەران و پشتیوانان بکە ... هەموو کۆچەکان لە مێژوودا بە خوێن دەستیان پێکردووە ... تەنها یەك کۆچ نەبێت ، کاتێ کۆچکەران کۆچیان کرد بۆ لای پشتیوانان ... پشتیوان دەهات و بە کۆچکەری دەووت : وەرە با ماڵ و کەل و پەل و خواردن بکەین بە دوو بەشەوە ...

ئەوەتا صلاح الدین ماوەیەکی درێژە پێناکەنێت ، لێیان پرسی بۆچی پێناکەنیت ؟ ووتی: چۆن پێ بکەنم لە کاتێکدا (قودس ) داگیرکراوە ... شەرم دەکەم لە خوا کە پێبکەنم ... براکانیشم لەوێ ئازار بچێژن ....

ئەی نەتەوەی ئیسلام .... ئامانج ئەوەیە بۆ ئەم نەتەوەیە بژیت ... واز لە ( من ) بێنیت .... ئەگەر بۆ خۆمان ژیاین ... ئەوە بە بچوکی دەژین ، وە ئەگەر بۆ نەتەوەکەمان ژیاین ... ئەوە تەمەنەکانمان درێژ دەبێتەوە بە تەمەنی هەموو مرۆڤێك لەم نەتەوەیەدا ....

## ﴿وازهێنان لە گوناه و تاوان﴾

### هیچ بەلایەك بە بێ گوناه و تاوان دانەبەزیوە ... وە بە بێ تەوبە کردنیش بەرزنەبۆتەوە

ئازیزانم .... ئایا دەتانەوێ خوای گەورە ئەم واقیعەمان بگۆڕێت ؟ دەی واز لە گوناه و تاوان بێنن وە من دەزانم هیچ کەسێك نیە گوناه و تاوانی نەبێت ، بەڵاو با پێکەوە ڕێبکەوین و سووربین لە سەر تەوبەکردن چونکە پێداگرتن لە سەر گوناه تاوانێکی گەورەیە ..... با ڕووبکەینە خوای گەورە ، با ملکەچ بین و پەشیمان بین لە سەر ئەوەی بە سەرمان بردووە

و تەوبەی لـە سەر بکەین و لـە خوا بخوازین خۆمان و هەموو موسڵمانان سەربخات ، بەڕای تۆ ئایا دوعاکەمان قبوڵ ناکات ؟! بێگومان گیرا دەبێت چونکە خوای گەورە بەخشندەترینی میهرەبانەکانە بۆ بەندەکانی ....

برایانم ..... دڵنیابن کە بەلاّ بە بیّ گوناه کردن دانابەزیّ ، و بەلاّ بە بیّ تەوبە کردن لاناچێت ، وەك چۆن پێشەوامان عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵیّ : هیچ بەلاّیەك بە بیّ گوناه و تاوان دانەبەزیوە و بە بیّ تەوبە کردنیش لانەچووە )) .... لـە ڕاستیدا ئێمە بەم بارودۆخە مەترسیدارەوە گرفتارین ، بەخوا بەلاّ نارەحەتە ..... وە هیچ دەربازبوونێك نیە لەو بەلاّیە بە تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا نەبێت ....

لاوێك بە ڕاشکاوانە پێی ووتم : من دەترسم ئەو بەلاّیەی دێت بە سەر وولاّتە موسڵمانەکاندا بە هۆی گوناهی منەوە بێت ، چونکە باش گوناهەکانم دەناسم ، بە خوا هەرگیز چاوەڕێم نەکردوە کەس بەو ڕاشکاویە بدوێت لـە گەڵمدا ، بەلاّم مادام لـەو مانایە تێبگەین کەواتە دەتوانین واقیعمان بگۆڕین ، پشت بە خوا ....

## هۆی گرفتاربوونی نەتەوەکان .... گوناه و تاوانە

ئازیزانم ... ئایا دەزانن ئەو نەتەوانەی پێش ئیسلام گرفتاربوون و بە هیلاکا چوون هۆکارەکەی تەنها تاوان و گوناه بوون ؟ چی ئادەم ﷺ ی لـە بەهەشتا دەرکرد ؟ بێگومان گوناه و تاوان ... چی ئیبلیسی لـە ڕەحمەتی خوا دەرکرد؟ گوناه و تاوان .... چی نەوەی نوح ﷺ ی نوقمی ئاو کرد ؟ ((فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ )) (القمر /١١-١٢)گوناه و تاوان ... چی فیرعەون و سەربازەکانی خنکاند ؟ ((فَأَخَذْنَـٰهُ

وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ )) (القصص – ٤٠) گوناه و تاوان ...

گەلی لوط ﷺ چیان بە سەرهات ؟؟ پێشەوامان جوبرەئیل ﷺ بە هەردوو باڵی ...دێکەی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان تا ئەو ڕادەیەی فریشتەکان گوێیان لە وەڕینی سەگەکانیان ...بوو ، پاشان ژێرەو ژووری کردنەوە .... خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ((فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ (الحجر/٧٤) واتە ( ئینجا ئەو شارەمان سەرەو ژێرکرد ، وە گڵی بەردینمان بە سەردا باراندن ) بۆچی ؟ بە هۆی گوناه و تاوانەوە ....

چی گەلی (عاد) و شارەکەیانی بە هیلاکا برد ، کە نموونە شاری وا لە هیچ وولاتێکدا نەبووە ؟؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێ ((فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ )) ( الاحزاب / ٩ ) واتە((ئینجا ئێمە بایەکی بەهێزمان بۆ ناردن و لەشکر(ی فریشەی ) کە ئێوە نەتان بینین ، وە خوای گەورە بەو شتانەی ئێوە دەیکەن بینایە )) .... ئایا بینیت گوناه و تاوان چی بە سەر هێنان .

تەماشای ( بەنی ئیسرائیل ) بکە ، خوای گەورە دەفەرموێ : ((فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ وَكَانَ وَعۡدٗا مَّفۡعُولٗا ﴿٥﴾))(الاسراء /٥)

واتە : (( جا کاتێ یەکەمین بەڵێن ( لەو دوانە ) هات ( کە بەڵێنیان پێدراوە ) ، دەینێرینە سەرتان چەند بەندەیەکی خۆمان ، کە خاوەن دەست وەشاندنێکی بە تینن لە جەنگا ، ئینجا ئەوانە دەگەڕێن بە ناو وولاتەکاندا ، وە ئەوە بەڵێنێکی بەدیهێنراو بوو))

ئازیزانم ئایا بینیتان ئەو کێشەیە چیە کە ئێمە گرفتارین پێیەوە ؟ گوناه و تاوان ... گوناهی ئەمڕۆ و دوێنێ ، گوناهی سەد ساڵ کە بە سەر نەتەوەکەماندا تێپەڕیوە.. هەمووی هۆکاری مەینەتی و سەرگەردانیمانە .... پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ : (( اذا ظهرت المعاصي في امتي عمهم الله بعذاب من عنده )) ( الامام احمد في ( مسنده ) (٦-٣٠٣) واتە : ((ئەگەر تاوان ە گەناه لە ناو نەتەوەکەمدا دەرکەوت خوای گەورە سزای خۆی دەڕژێ بە سەریاندا))

دەتبینم خەریکە ووردە ووردە ئاوێتە دەبێت لە گەڵ فەرمودەکەدا .... بەڵێ ئەوە واقیعەکەیە ....

برای خوێنەر .... چاك بزانە تاوانەکان نەتەوەکان بە هیلاکدا دەبەن .... کاتێ موسڵمانان چوونە ناو ( قوبرص ) و فەتحیان کرد ، وە ڕۆمەکان دەرچوون ، موسڵمانان پۆل پۆل دەهاتن و پیرۆزباییان دەکرد ، کەچی هاوەڵی بەڕێز ( ئەبو دەردا ) دەگریا ، لێیان پرسی بۆچی دەگریت ؟ ووتی دەگریم بۆ نەتەوەیەك سەرپێچی خوا بکات و .... خوای گەورە نەتەوەیەکی تر سەربخات بە سەریاندا ....

ئایا تێگەیشتی لە یاساکە ؟ .... بە تاوان خوای گەورە گۆڕان بە سەر نەتەوەکاندا دێنێت ... بەڵام خوای گەورە ئێمەی خۆش دەوێت .... خوای پەروەردگار ئەم نەتەوەیەی خۆش دەوێت ، لە بەر ئەوە بە مەینەتیەکان دەیبزوێنێ ...

## زەمین لەرزە ڕەحمەتە بۆ ئیمانداران

ئەنەسی کوڕی مالیك چوو بۆ لای خاتوو عائیشە ﵂ ووتی : (( دایکە ، باسی زەمین لەرزەم بۆ بکە .... عائیشە ووتی :( ئەگەر گوناهو تاوان بڵاوبوویەوە بە ناو خەڵکیدا ، زینا دەرکەوت ، مەشروبات خورایەوە و ، گوناهی گەورە زۆربوون تا هەموو خەڵکی گرتەوە ، خوای گەورە دەفەرموێ : بیانلەرزێنە ، ئەنەس ووتی : دایکە ئایا سزایە بۆیان ؟ ووتی : نەبەخوا ، بەڵکو ڕەحمەت و ئامۆژگاریە بۆ ئیمانداران ، وە پەندو تورەییە بۆ کافران ....

ئایا گرنگی و دید و بۆچوونی خاتوو عائیشەتان بینی .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : (( اياكم و محقرات الذنوب ، فانهن يجتمعن على الرجل حتى يهلكنه )) (الامام احمد في مسنده (٥-٣٣١) واتە ( ئاگاتان لە گوناهە سوك و چرکەکان بێت ، چونکە بێگومان لە سەر پیاو کۆدەبنەوە و بە هیلاکیدا دەبەن )

گاڵتەتان لە گوناهی بچووك نەیەت . گوناه گەورە گەورە دەبێت تا دەگاتە گەردن و دەیشکێنێت ... ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ : (( ئێوە کارانێك دەکەن لە بەر چاوتاندا لە موو باریکترە ، کەچی ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوناهی گەورەمان دادەنان)) واتە ئەو کارانەی مرۆڤ بەرەو هیلاك دەبات ! پەروەردگار دەفەرموێ ((إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ )) ( النور /١٥) واتە : (( کاتێ ئەم بوهتانەتان بە دەماودەم لە یەکترەوە وەرگرت ، وە بە زمانتان شتێك دەڵێن ، کە زانیاریتان دەربارەی نەبوو ، واتە دەزانن شتێکی سووك و ئاسانە ، لەکاتێکدا لای خوا زۆر گەورەیە ))

ئەمە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بە بیست ساڵ ، ئەبێ ئەو پێوەرە چۆن بێت بۆ ئەم سەردەمەی ئێستامان ؟؟

ئازیزانم ، پێویستە ناخی خۆمان بگۆڕین ، بە خوا بڕوام پێبکەن ، سەرکەوتن لای خواوە نایەت هەتا ئەو نەتەوەیە ئیماندارو چاکە خواز نەبن .... ئەمەیە یاساکانی سەر زەوی کە خوای گەورە دایڕشتووە ((((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ )) ( الرعد – ١١) واتە (( بەڕاستی خوای گەورە ( بار و حاڵی ) هیچ کەس ناگۆڕێ ، هەتا ئەوان خۆیان ( بار و حاڵی ) خۆیان نەگۆڕن )

## بە سووك تەماشای خوا مەکە

ابن القيم دەڵێ (( خوا بە تاوان ڕقی لێت دەبێت و وات لێ دەکات بەرگەی نەگریت .... خوای گەورە دەفەرموێ (( متمانەت نەبێ بە دوای تاوان ) واتە ئەو تاوانەی دەیکەیت بە بێ سزا تێناپەڕێ بە سەرتا ، دڵخۆش بوونت بە تاوان و گوناهـ لای خوای گەورە لە گوناهەکە خراپترە .... پەروەردگار دەفەرموێ : ((فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾)) الانعام /٤٤ ) واتە : ( دەرگای هەموو شتێکمان لەسەر کردنەوە ، تا کاتێ دڵخۆش بوون بەوەی پێیان درابوو ، لە ناکاو تۆڵەمان لێ سەندن ، ئیتر ئەوانیش نائومێد و سەرگەردان بوون )

ابن القيم دەڵێ : (( دڵخۆش بوونت بە گوناهـ لای خوا لە گوناهەکە خراپترە ، کاتێ گوناهێ دەکەیت و پێدەکەنیت لای خوا لە گوناهەکە خراپترە ، وە بێ شەرمیت لە فریشتەی لای چەپ و لای ڕاست کە تەماشات دەکەن و تاوانەکە دەنووسن و تۆش شەرم ناکەیت لای خوا سەختترە لە گوناهەکە )) .

برای خوێنەر ... بە کەم تەماشای خوا مەکە .... ئەگەر بینیت خوای پەروەردگار بەردەوام ڕۆزی بە سەرتا ڕژاندووە ، تۆش بەردەوامیت لە سەر گوناهـ و تاوان ئەوە ئاگاداربە ، بێگومان ئەوە تەنها مۆڵەت پێدانە ، تۆ خراپە و تاوان دەکەیت و پەروەردگار چاکە لە گەڵتدا ، هەر خراپە و تاوان دەکەیت و پەروەردگار چاکە لە گەڵتدا ، واز لە تەوبە کردن دێنیت بەو گومانەی کە لە سەر ئەوکارە خراپانە خوا تۆڵەت لێ ناسەنێتەوە .... کاتێ ڕۆزیەکان دەبینیت کەڵەکە بووە بە سەرتاو تۆش یاخیت ، هەمیشە لە خوا بترسە .... ئەوە چاك بزانە هەر نارەحەتیەك كە بە سەرمانا دێت ئەوە تەنها تاقیکردنەوەیە لە لایەن خوای گەورەوە .

## ئاسەوارەکانی سەرپێچی کردن .

**یەکەم: تورەبوونی خوا**: خوای گەورە لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموی (( انا الله لا ـە لا انا ، اذا اطعت رضيت ... و اذا عصيت غضبت ، و اذا غضبت لعنت ، ولعنتي تصل ـى لسابع في الولد )) واتە (من ( الله ) م و پەرستراو نیە بێجگە لەمن ، ئەگەر گوێڕایەڵیم ـکەن ، ڕەزامەند دەبم ، ئەگەر سەرپێچیم بکەن تورەدە بم ، وە ئەگەر تورە ببم نەفرەت دەکەم ، وە نەفرەتەم دەگاتە منداڵی حەوتەم )

**دووەم :رقی ئیمانداران**: ئیمامی شافیعی دەڵێ : ئاگادار بن ئیمانداران بە دڵ نەفرەتتان لێ ـەکەن ، ئێوەش هەستی پێنەکەن ، دەڵێن پێی : چۆن دڵی ئیمانداران نەفرەت دەکا و ئەویش هەست ناکات ؟ ووتی: چونکە سەرپێچی خوا دەکات ، خوای گەورەش ڕق لێ بونەوەی ئەمی لە دڵی ئیماندارەکاندا چاندووە .

**سێ یەم : بێ بەش بوون لە ڕۆزیی** : رۆزیی لە ئاسمانەوە دادەبەزێ ، بە هۆی سەرپێچیکردنەوە نامێنێ ، چونکە ڕۆزیی تەنها بە هۆی سەرپێچیکردنەوە نامێنێ ..

**چوارەم : بێبەش بوون لە زانست** : ئیمامی مالیك دەڵێ بە ئیمامی شافیعی : دەبینم خوای گەورە ڕوخسارتی بە زانست ڕووناك کردۆتەوە ، نەکەی ئەو ڕووناکیە بە سەرپێچیکردن بکوژێنیتەوە .... ئیماندارێك بێتاقەتی خۆی دەردەبڕێ کە بە باشی ناتوانێ قورئانی پیرۆز و زانست لە بەر بکات .... دەڵێ :

| | |
|---|---|
| شكوت الى وكيع سوء حفظي | فارشدني الى ترك المعاصي |
| وقال لي : إن العلم نور | و نور الله لا يهدى لعاصي |

واتە" شکاتی خۆمم بردە لای ( وەکیع ) کە خراپم لە لە بەرکردندا ، ئەویش ڕێنمایی کردم واز لە سەرپێچی کردن بێنم ، وە پێی ووتم بێگومان زانست ڕووناکیە ، و ڕووناکیی خوا نابێتە ڕێنماییکەری سەرپێچیکار ....

**پێنجەم : سەختیی بەلا** : ئیمامی علی ﷺ دەڵێ : بەلا دانابەزێ بە سەرپێچیکردن نەبێ ، وە لاش ناچێت بە تەوبە کردن نەبێت .

**شەشەم : نامۆ بوونی نێوان تۆ و خەڵکی** : هەست بە نامۆبوون دەکەیت لە گەڵ خەڵکیدا هەرچەندە لە ناوەندێکی خێزانیشدا دەژیت :.یەکێ لە زانایان ووتەیەکی جوانی هەیە : بە دڵنیاییەوە من شوێنەواری سەرپێچیەکانم لە نەریتی خێزانم و منداڵەکەم و وولاخەکەمدا

دەبینم ، وولاخەکەم نارِوات و منداڵەکانم بە خراپی مامەڵەم لە گەڵدا دەکەن و خێزانیشم گوێڕایەڵیم ناکات ، بۆچی ؟؟ بە هۆی سەرپێچیکردنەوە ...

**هەشتەم : تاریکایی ڕوخسار و دڵ** : ابن عباس ﷺ دەڵێ : سەرپێچیکردن دەبێتە هۆی ڕەش داگیرسانی ڕوخسار ،و تاریکایی دڵ ،و ڕق لە دڵی خەڵکیدا ، و لاوازی لە جەسەدا ،و کەمی لە ڕۆزیدا ، وە گوێڕایەڵیش دەبێتە گەشانەوە لە ڕوخساردا ، و ڕووناکی لە دڵدا ، و خۆشەویستی لە دڵی خەڵکیدا ، و هێز لە جەستەدا ، و فراوانی لە ڕۆزیدا ....

ئازیزانم .... ئایا دەبێ دوای هەموو ئەمانە هەر سەرپێچی خوا بکەن ؟

**نۆیەم :- بێبەش بوون لە گوێڕایەڵی** .. واتە تۆ دەتەوێت هەستیت بۆ ئەنجام دانی نوێژی بەیانی ، تاقەت و لێبڕانت نیە و بەو شێوەیە ...

**دەیەم : تاوان تاوانی تردێنێت بەدوای خۆیدا**..وە لە شوێنەوارەکانی سەرپێچی ، ئەویە کە تاوان تاوانی تر دێنێت بە دوای خۆدا وەکو زنجیرە ....

**یانزەیەم : سوك تەماشا کردنی گوناهەکە** .. چونکە موسڵمان عەزیزە لای خوا ، کاتێ سەرپێچی دەکات ئاسانە بەلایەوە ، حەسەنی بەصری دەڵێ : (( خەڵکی تاوان و سەرپێچی سووکە بەلایانەوە سەرپێچی دەکەن ئەگەر بە قورسی و سەنگینی بیگرن تاوان ناکەن و خوا لە تاوان و دەیانپارێزێ ))

**دوانزەهەم : سەرشۆڕی لە دڵدا** ... خوای گەورە دەفەرموێ (( مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًا)) (فاطر /٩ ) واتە : (( هەرکەسێ گەورەیی و سەربەرزی دەوێ ( لە خوای بوێ ) چونکە هەموو گەورەییەك هەر بۆ خوایە ))

سبحان الله : جوانترین پۆشاك دەپۆشن ، سواری کەشخەترین ئۆتۆمبێل دەبن ، خۆیان بەزل دەزانن .... کەچی سەرشۆڕی تاوان و سەرپێچیکردن لە دڵیاندایە و جیانابێتەوە لێیان .... بە خوا برایانم .... دووریی لە پەروەردگارەوە و ڕۆچوون لە سەرپێچی و تاواندا سەرشۆڕیە .

**سيانزەيەم : لاوازی عەقڵ** ... زانايەك دەڵێ : هەرکەس سەرپێچی خوا بکات بەشێك لە عەقڵی لەدەستداوە و تا ڕۆژی قيامەت نايەتەوە بۆ لای ...

**چواردەيەم : شومیی و سەرپێچی و دەرەنجامەکانی** ، پەروەردگار دەفەرموێ : ((ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ )) ( الروم /٤١ ) واتە ( فەساد و خراپەکاری لە ووشکانی ( زەوی ) و دەريادا دەرکەوتووە ، بە هۆی ئەو خراپانەی خەڵکی کردوويانە ، بۆ ئەوەی ( تۆڵەی ) هەندێ لەو خراپانەی کردويانە پێیان بچێژێ ، بەڵکو بگەڕێنەوە ( لە خراپەکاری ) ).

وە دەفەرموێ ((وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ )) واتە (( ئێمە ستەممان لێ نەکردن ، بەڵکو خۆيان

ستەميان کرد لە خۆيان )

**پازدەيەم : زمانت لە زۆربەی کاتەکاندا ناپاکيت لە گەڵدا دەکات لە کاتێکدا تۆ پێويستيت پێی هەيە** .... لێم دەپرسيت :- چۆن زمانم ناپاکيم لە گەڵدا دەکات ؟ ناپاکيت لە گەڵدا دەکات لە سەرەمەرگدا کاتێ پێت دەڵێن: بڵێ : ﴿اشهد ان لا الـه الا الله﴾ تۆش دەڵێيت: ناتوانم . لێت دەپرسن : ئايا نازانيت ؟ دەڵێی: بەڵێ دەيزانم ، بەڵام ناتوانم بەدەم بيڵێم ، ئەزانی بۆچی ، چونکە تۆ سەرپێچی کەريت .

سبحان الله ! شاخێك لە سەرمانە .... ئەتوانی وێنای بکەی کاتێ کە ناتوانيت لە سەرەمەرگدا شايەتومان بێنيت !! بە خوا شتێکی مەترسيدارە .... ئايا کاتی ئەوە نەهاتووە واز لە سەرپێچيەکان بێنين و نزيك بينەوە لە خوای گەورە و پەروەردگار .

## نەکەيت لە خەڵوەتدا سەرپێچی بکەيت ...

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ (( لاعلمن اقواما من امتی یاتون یوم القیامة بحسنات امثال جبال تهامة بیضاء ، فیجعلها الله هباءً منثورا )) واتە ( کۆمەڵێ کەس لە نەتەوەکەی من لە ڕۆژی قیامەتدا دێنن ، چاکەکانیان وەکو شاخی ( توهامە ) سپیە ، خوای گەورە وەکو تۆزی پەرش و بڵاوی لێ دەکات )

سەویان ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، وەصفیان بکە بۆمان تاوەکو نەچینە ڕیزی ئەوان و بە خۆمان نەزانین ، پێغەمبەری خوا (ص) فەرمووی : (( انما انهم اخوانکم و من جلدتکم و یاخذون من اللیل کما تاخذون ... و لکنهم اقوام اذا خلوا بمحارم الله انتهکوها ) (ابن ماجة / ٤٢٢٤٥ ) واتە : (( بێگومان ئەوانە برای ئێوەن و لە ئێوەن ، ئێوە چۆن شەونوێژ دەکەن ئەوانیش دەیکەن ، بەڵام ئەوانە گەلێکن ئەگەر لە پەنهاندا حەرامیان بۆ بلوێت تەراتێنی تێدا دەکەن و هەتکی دەکەن ...) ئارام گرتنی خوا لە سەرت غەرڕات نەکات .... و تەماشاکردنی خوا بۆ تۆ ئاسان نەبێت بەلاتەوە .

## چۆن بەرەنگاری سەرپێچیکردن دەبیتەوە ؟

خوێنەری ئازیز ، توخوا نیەت بێنە و سووربە لە سەر وازهێنان لە تاوان و سەرپێچیکردن وە گرنگترین هۆکار بۆ ئەوەی بەرەنگاری سەرپێچیکردن بیتەوە هاوڕێیەتی چاکەکارانە ، ئەوانەی دیندارو موسڵمانن ، وە کارانێك بکە سوودی ئیسلام و موسڵمانانی تێدابێت ، لە کاتێکدا تۆ سەرقاڵیت بە گوێڕایەڵیەوە ، و بە دۆزێکی گەورەوە کە بریتی یە لە ( دۆزی موسڵمانان )

ئەم دوو شێوازە :

١- هاوڕێیەتی صاڵحان و چاکەکاران

٢- کارکردن لەو پێناوەدا

لە سەرکەوتوو ترینی هۆکارەکانە بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاوان و سەرپێچیکردن .

برای ئازیزم ئەوە بزانە کە نەتەوەکەمان هەرگیز هەڵناسێتە سەر پێی خۆی ئەگەر ئێمە سووربین لە سەر تاوان و سەرپێچیکردن ...

# ﴾دروستی﴿

## نا بەڵکو هەمووومان کاردەکەین :

لە کۆمەڵگادا لەمپەری زۆر هەیە .... با تەماشای حاڵی کۆمەڵگا بکەین لە دەوری خۆماندا .... ئایا کۆمەڵگا پێك نەهاتووە لە من و تۆ ؟ .... ئەو بەڕێزە و ئەو خاتوونە .... کوڕی من و کوڕی تۆ .... دراوسێی من و دراوسێی تۆ ؟ ئایا ئێمە ئەو توخمە نین کە کۆمەڵگای لێ پێکهاتووە ؟؟! بەڵێ بە خوا هەروایە ... کەواتە ئایا ئەوە بێ سەرو بەری و جەنجاڵی نیە کە تیایدا دەژین و بەدەستی خۆشمان سازاندومانە ؟ بەلاَم ئایا ئێمە هەست بەوە دەکەین ؟ بێگومان زۆرێك لە خۆیان دەپرسن : من چیمە بە کۆمەڵگاوە ؟ ئایا ئیصلاحی هەموو شتێکم پێ دەکرێت لە کۆمەڵگادا ؟

نەخێر ، بە تەنها خۆت کارمەکە ... وە منیش بە تەنها کار ناکەم .... بەڵکو هەموومان لە پێناوی بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی تەواودا کاردەکەین ... کۆمەڵگایەکی هاوکار .... کۆمەڵگایەکی سۆزدار لە نێوان خۆیاندا .... وەرن با بزانین ئەمە چۆن دەبێت ؟

نەتەوەکان لەسەر دارو پەردووبان خەون و تمووحات بنیات دەنێن کە نایەتە دی مەگەر دوای زەمەنێکی دوور ....هەندێ کەس پێیان وایە هاتنە دی ئەستەمە ، وە هەندێکی تریش بە لایانەوە ئامانجێکی پیرۆزە و پێویستە بێتە دی و پێی بگەن ، بە خستنەگەڕی هەموو هۆکارو تواناکان ...

تەماشای دنیای دەوروبەرمان بکە .... فێڵ ، درۆ ، دزی ، زبڵ لە ناوەڕاستی ڕێگادا ، ناپاکی ، ئەمە شتێکی سەیر نیە ! بەڵکو سەیرتر ئەوەیە کە گوێت لە هەموو کەسەوە دەبێت خۆیان بێ بەری دەکەن لەو هەموو تۆمەتانە و هەرکامیان بگریت دەڵێ : ئایا من گۆڕان بە سەر خۆمدا بێنم کۆمەڵگاش دەگۆڕێت ؟ گاڵتەجاڕی لێ دێت و هەموو شتێ چەندە گەورە و مەزن بێت ئەم بێ ئەرزش تەماشای دەکات ، هیچ شتێ بەلایەوە گرنگ نیە ... بەلاَم دەیبینیت ڕواڵەتی لەو پەڕی کەشخەییدایە ... ماڵەکەی لەو پەڕی ڕازاوەییدایە .. لە سەر کارەکەی بەلای خۆیەوە لە هەموو فەرمانبەرەکانی تر باشترە ... بەلاَم ناخی خۆی !! ئەو زبلاَنەی لە بەردەم ئەو شەقامانەدان کە نیشتەجێیە تیایدا .... یان ئەو دزیانەی لە دەورووبەریدا ڕوو دەدەن ... ئەو قسە ناشیرینانەی لە سەر زاری منداڵەکانیەوە دەکرێن .... هەموو ئەمانە گرنگ نیە بە لایەوە .... گرنگ ئەوەیە ڕواڵەتی ڕازاوە بێت لە بەردەم خەڵکیدا ، ئۆتۆمبێلەکەی پاکوتەمیز بێت ... کەواتە دوای ئەوە چی گرنگە ؟! هەرگیز هیچ شتێ !!! بە ڕاستی خەفەتباریە ئەو شتانە ئاسان بن بە لامانەوە .... ئەشێ قبوڵی بکەین ئەگەر گروپێکی کەمی ناو کۆمەڵگا بەو شێوەیە بن و بڵێین : چاکسازی و بنەبڕکردنی ئاسانە .... بەلاَم ئێمە حاڵی هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی تیایدا دەژین ئاوابێت چۆن دەبێت وابین ئەی چارەسەر چی یە ؟! چۆن ئەم حاڵەتە بگۆڕین ! یان ئەم مەینەتیەی بە سەرماندا هاتووە ؟

## هەڵوێستی من گەردوون دەگۆڕێت ؟! ... ئەم نادروستیە بۆچی ؟

دروستکاریی یاساو ڕێسای خۆی هەیە و پێویستە بچەسپێنرێت .... خوێنەری بەڕێز وا گومان ببەیت کە دروستکاری لە هەلاَیساندا خۆی حەشارداوە ، پێویستە بێ سنوورانە جوامێر بین بە بێ هیچ یاسایەك کە حوکممان بکات .... نەخێر ... بەڵکو دروستکاری

ئەویە بە داناییەوە گۆڕان دروست بکەین ، بە عەقڵێکی هاوسەنگەوە .... خراپ بگۆڕین بۆ باش .... باشیش بۆ باشتر ... خوای گەورە دەفەرموێ ((ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ)) النحل / ١٢٥ واتە ( بانگەواز بکە بۆ ڕێگای خوای پەروەردگارت ، بە دانایی و بە ئامۆژگاری چاك )

نەك بە شێوازێکی ڕفێنەرانە و دوور لە لۆژیك و دانایی .... تەماشای تەواوکەری ئایەتەکە بکە ((وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾)) النحل / ١٢٥ ) واتە ( لە گەڵیان بدوێ ( موجادەلەیان لە گەڵ بکە )بە چاکترین شێوە ، بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ ، بەوانەی گومڕابوون و لایان داوە لە ڕێگاکەی ، وە هەر خۆیشی زانایە بەوانەی لە سەر ڕێگای ڕاستن )

ئەو ڕێگایەی بانگەشەی لێوە دەکەین بۆ ئیصلاح ..گرنگترین خاڵە بۆ گرنگیداغان پێی .... ئێمە دەمانەوێ گۆڕان بسازێنین ، دەمانەوێ دروستکارانە بین ، چونکە مەینەتیەکان لە هەموو لایەکەوە سەری تێ کردووین .... ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵگا شان بە شانی یەك، یەك دەست نەبن ، وە ئەگەر تۆ هاوکار نەبیت بۆ پارێزگاری کردنی منداڵەکانت ئیتر چۆن پێدادەگریت لە سەریان کە سیستەمانە کاربکەن ؟ لە بەر ئەوە ئێمە ئەم بەهانەیە ڕەت دەکەینەوە بەرامبەر بە شتە نادروستەکان ( هەڵوێستی من ئەم گەردوونە ناگۆڕێت ) ... نەخێر ... بەڵکو سەراپا گەردوون دەگۆڕێت.. متمانەت هەبێ کە گۆڕان لە سەر دەستی زۆرێك لە خەڵکی بەدەستهاتووە ، بە تایبەتی ئەو لاوەی بەردەوام نەخشەیەکی پاکی لە گەڵ خوادا کێشاوە تا بگاتە ئەو لوتکەیەی کە ناومان ناوە ( پاکیزەیی ) .... کەواتە بەخوا باشترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە دروستکاری ،کەواتە دوا مەکەون ...

هەوڵ بدەن خۆتان بگۆڕن تاوەکو خوای گەورەش ئەو خەم و نارەحەتی و بەڵایانە بگۆڕێت کە بە سەرتانەوەیە ..... بەڵێ .... تەنها بە هەڵوێستی تۆ نەتەوە بەرەو

دروستکاری دەبات ، ئەو کاتەش ئاسودە و سەربەخۆ دوور لە هەواو ئارەزوو دەژیت ...

پەروەدگار لە سورەتی ( الانفال ) دا دەفەرموێ ((وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ (الانفال /٢٥) واتە (وە خۆتان بپارێزن لە ئاشوب و بەڵایەك کە تووشی ستەمکارانتان نابێت بە تایبەتی ( هەمووتان دەگرێتەوە ) وە بشزانن ، کە بەڕاستی تۆڵە و سزای خوا زۆر سەختە )

بۆکێ ؟ بۆ ئەوانەی زاڵمن بە سەر دەرونیاندا بە شوێنکەوتنی شەهوات و فیتنە ....

ئازیزانم .... ئایا کاتی ئەوە هاتووە ناخمان بگۆڕین ؟ من نازانم ڕێگر چی یە ؟ ئایا هەریەکەمان عەوداڵی بەختەوەری نیە ؟ بێگومان .... ئەگەر ئەم ئاینە زامنی بەختەوەری دنیا و قیامەتمان بۆ بکات .... ئیتر چاوەڕوانی چی دەکەین ؟! سوێند بە خوا گوێم لە دلآنێکە بە تاسەوە دەیانەوێت بگۆڕێن بەلآم پێویستیان بە یارمەتی دەر هەیە .... دەیانەوێ کەسێ دەستیان بگرێت و بیانخاتە سەر ڕێگای ئیصلاح .... دەی وەرن با هاوکاری یەکتربین بۆ بەدیهاتنی ئەو ئامانجە ... بەڵکو ئاشتی بمانگرێتەوە ، و هەموو ئەو جەنگ و دەمارگیری و مەینەتیانەمان لە بیر چێتەوە کە بوە بە بنەمای ژیانی ڕۆژانەمان ....

## پاداشتی کارایەك لە وانە خێری پەنجا کەسی هەیە ...

پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بەلای گۆڕستانێکدا لە گەڵ هاوەڵانیدا و فەرمووی : (( السلام عليكم دار قوم المؤمنين ، و انا انشاء الله بكم لا حقون ، و ددت انا قد راينا اخواننا )) واتە ((سلآوتان لێ بێت ، لە خانەی کۆمەڵی ئیمانداران ، انشاء الله ئێمەش دێین بۆ لاتان ، خوازیاربووم براکانی تریشمان ببینیایە )) ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئێمە برای تۆ نین ؟ فەرمووی (( بل انتم اصحابي ، و اخواننا الذين لم ياتو بعد )) واتە ((بەڵکو ئێوە هاوەڵمن ، براکانم ئەوانەن کە هێشتا نەهاتوون )) ( رواه مسلم - الحديث / ٥٨٣

لە ڕوایەتێکی تردا هاتووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ (( فان في ورائكم ايام الصبر، الصابر فيه ، مثل القابض على الجمر ، للعامل في ذلك الزمان اجر خمسين رجلا )) واتە

(( دوای ئێوە ڕۆژگاری ئارام گرتنە ، ئارامگر تیایدا وەکو کەسێ وایە سکڵی ئاگری بە دەستەوە بێ ، کەسی کارا لەو زەمانەدا خێری پەنجا پیاوی هەیە )) ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ، خێری پەنجا پیاو لە ئێمە یان لەوان ، فەرمووی ( بل اجر خمسين رجلا منهم ) واتە بەڵکو خێری پەنجا پیاو لە ئێوە ... ( الطبراني في المعجم الكبير ٢٢/٢٢٠)

ئەڵڵاە .... ئای چەندە بە تام و بە چێژە ئەو ووتانە ... پاداشتی پەنجا کەس لە هاوەڵان ؟!

بەڵێ .... پاداشتی پەنجا .... ئایا ئێمە لەوانەین ؟ یان هێشتا دەڵێین من بە تەنها بەرپرسیار نیم لە سەر گۆڕان ؟ با خۆمان بە زل نەزانین .... با بە چاوی بوێری و واقعیانە تەماشای واقیعمان بکەین تا بێینەوە بە هۆشدا و لابکەینەوە بە لای خەمی نەتەوەکەماندا و لە خەمی چارەسەری هەموو ئەو تیاچوون و سەرەڕۆییانەدا بین ...

بەڵێ ئەگەر خراپەکارانمان زاڵ بن بە سەر چاکەکارانماندا سەرگەردان دەبین ..

لە عائیشەوە ﷺ وتی : ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بە هیلاکدا دەچین لە کاتێکدا پیاوچاکانیشمان تێدا بێت ؟ فەرمووی(( نعم ، اذا كثر الخبث )) واتو:((بەڵێ ئەگەر خراپە زیادبێت ))…. مسلم / ٧١٦٤

لە گێڕانەوەیەکی تردا : خوای گەورە فەرمانیدا بە پێشەوامان جوبرەئیل ﷺ کە گوندێك ژێرەو ژوور بکات ... ووتی پەروەردگارم : فلاّن بەندەت لەو گوندەدایە و بەردەوام گوێڕایەڵە و نوێژو چاکەو شەو نوێژ دەکات .... فەرمووی ( يا جُبْرِيل ، بِهِ فَبْدَأْ ) واتە ئەی جوبرەئیل بەو دەست پێبکە : فەرمووی بۆچی پەروەردگارم ؟ فەرمووی ( لِأَنَّهُ لَمْ يَتَمَعَّرْ وَجْهَهُ يَوْمَاً مِن أَجْلِي ) واتە (( چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕوخساری گرژی نەکردووە لە پێناوی مندا )) واتە بە هۆی تورەییەوە سوور هەڵنەگەڕاوە

تۆ بڵێ ی بۆچی ؟چونکە فیتنە ئەگەر هات کۆمەڵێ ناگرێتەوە بەڵکو هەموان دەگرێتەوە .... لە بەر ئەوە ئەگەر فیتنەمان تێکەوێت هەموومان سەرگەردان دەبین و ناتوانین گۆڕان بکەین ...

بۆ ئەوەی دروستکاربیت پێویستە هەوڵ بدەیت تا دروشمی یەکبون بکەیتە دروشمی نەتەوەی ئیسلام نەك پەرت بوون ، نابێ بە درێژایی تەمەنمان لە مزگەوتەکاندا بمێنینەوە و بڵێین : گۆڕان لە دەرەوە خەڵکانی تر بەرپرسیارن لێی ... نەخێر ... تکادەکەم ، با بە

باشی لـه ئاینەکەمان تێبگەین ... با چەند ڕۆژێکی دیاریکراو لـه مزگەوتدا ئیعتیکاف بکەین واته بمێنینەوه بەلاّم دوای ئەوه بچینه دەرەوه و بانگەواز بکەین بۆ لای خوا به دانایی و به ئامۆژگاری باش ... داوا دەکەین واز لـه سەرپێچی و کاری خراپ بێنن .... داوا دەکەین هەولّی خۆتان بخەنه گەڕ لـه پێناوی خوادا ... داوا دەکەین پلـەو پایەی ئەم نەتەوەیه بەرز بکرێتەوه تا وەك پێشوو عیززەت و کەرامەتی بۆ بگێڕینەوه ... گوێ لـه ووتەی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بگرن : خەریکه شارەکه کاول دەبێ و ئاوەدانیشه ، ووتیان چۆن ؟ ووتی : ئەگەر خراپەکارانیان زالّ ببن به سـەر چاکەکارانیاندا .

وه ووتی : ئەگەر تاوان داپۆشرا زیانی نیه تەنها بۆ خاوەنەکەی نەبێت ... وه ئەگەر ئاشکرا کرا و خەلّکیش هیچیان نەکرد بۆ گۆڕانی ئەوه زیان به هەموان دەگەیەنێ ... تەماشای ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ بکە : (( والذي نفسي بيده لتأمرن بالمعروف و لَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ أَو لَيُوشَكَنَّ اللهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقاباً مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلا يَسْتَجِيبَ لَكُمْ )) التُرمُذي / ٢١٦٩

واته : ﴿سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەسته فەرمان به چاکه ئەکەن و قەدەغەی خراپەکاری ئەکەن یان خوای گەوره گومان دەبرێت که سزایەت دابەزێنێ به سەرتانا پاشان بپاڕێنەوه لێی تا لـه سەرتانی لاببات و ئەویش وەلاّمتان ناداتەوه﴾

ئەی خوا یه گیان ئەم وولاتانه چەند ترسناکن بەڕاستی ئێمه لـەو واقیعەدا دەژین، ئایا حالّی ئێمه ئەمڕۆ لـه گەلّ خودا بەو شێویه نیه ؟بەلّێ...وه ئەگەر دوعا بکەین و وەلاّممان نەدرێتەوه ..ئیتر واز لـه دوعا کردن دێنین ... ئارامّمان کەم بۆتەوه و هیچ بەهانەیەکمان نەماوه تەنها گەڕانەوه بۆلای خوای گەوره نەبێت و ئارامگرتن لـەسەر بەلاّونارەحەتی ودووعاکردن بەدلّنیاییەوه هەتا خوای گەوره وەلاّمان دەداتەوه و دەرمان دێنێت لـەم نارەحەتیه.... بەلّێ براو خوشکەکانم ...ئیسلام یەکبون دەخوازێت بۆ ئەم نەتەوەیه نەك پەرتەوازەیی ، دەی با وەلاّمی بانگەوازی ئەم ئاینه بدەینەوه که بەختەوەری هەلّگرتووه بۆ هەموو ئەو کەسانەی هۆگری دەبن و ئەحکام و یاساکانی جێبه جێ دەکەن .

## ئایا کام گۆڕانیان له پێشەوەیه ؟

تەماشایی ئایەتی ((إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ)) بکە... لەم ئایەتەدا تێبینی دووگۆڕان دەکەین ، گۆڕانێك لە لایەن خۆمانەوە ، وە گۆڕانێك لە لایەن خوای گەورەوە ، ئایا کام گۆڕانیان پێشکەوتووە؟ بێگومان گۆڕانی خۆمان ...بێگومان ئیصلاحی خود بەدڵنیاییەوە ئیصلاح و چاکسازی کۆمەڵگاشی بەدواوادێت ...لەو سۆنگەیەوە ووتمان : بێگومان کاتێ خۆت ڕەفتارت دەگۆڕیت بێگومان بەشدار دەبیت لە چاکسازی کۆمەڵگا بەگشتی... ئایا گرنگی خۆتت لە ناو کۆمەڵگادا بۆ دەرکەوت ؟ تۆ بەشداریت لە وێرانکردنیدا و بە شداریشیت لە چاکسازیدا .. دەی توخوا دوامەکەوە ...وەرە با واز لە نادروستی بێنین تا خوای گەورە ئەم واقیعە تاڵەمان بگۆڕێت کە بە دەستی خۆمان دروستمانکردوە وئینجا بە هیلاکیشا ناچین ، وە خوای گەورە شایەتە بە سەرکردەکانمانەوە نە بەرئەوە باشەرم بکەین لە تەماشاکردنی خوای گەورە بۆ ئێمە کاتێ کە سەرپێچی ئەودەکەین.

لەگەڵ مندا ڕابمێنە لەم دروستکاریە لەم فەرموودەی پێغمبەر(ﷺ) ﴿ مثل القائم على حدود الله والواقع فيها كمثل قوم استهموا على سفينة فاصاب بعضهم اعلاها و بعضهم اسفلها، فكان الذين في افلها اسفلها إستقوا من الماء على من فوقهم فقالوا : لوإنَّا أَخَّرْنا في نَصِيبِنا خَرْقا و لم نُؤْذِ مِنْ فَوْقِنا ،فإنْ يتركوهم وما أرادوا هَلَكوا جَميعاً وإنْ أخَذوا على أيْدِيهم نجوا ، ونَجوا جَميعاً ))﴿البخاري: ٢٤٩٣ ، والترمذي: ٢١٧٣﴾

واتە:﴿نموونەی ئەو کەسەی سنووری خوا نابەزێنێ و ئەو کەسەی سنوری خوا دەبەزێنێت وەك نموونەی کۆمەڵێك وایە لەناو پاپۆڕێکی دوو قاتدا تیروپشك بکەن،کۆمەڵێکیان قاتی سەرەوەیان بەر بکەوێ و کۆمەڵێکیشیان قاتی خوارەوەیان بەر بکەوێت، جا ئەوانەی کە لە خوارەوەن بەسەر ئەوانەدا بچن بۆ ئاو کە لەسەرەوەن، لەبەر ئەوە بڵێن: بۆچی ئێمە کونێکی تێ نەکەین و ئیتر ئەوەندە ئازاری ئەوانەی سەرەوەش نەدەین، جا ئەگەر ئەوانەی سەرەوە واز لەوانەی خوارەوە بێنن چیان دەوێ بیکەن، ئەوە هەموویان تیا دەچن ، بەڵام ئەگەر دەستیان بگرن ئەوە خۆیان و ئەوانیش رزگاریان دەبێت﴾

وە ئامانج لەم نموونەیە کە ،پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی دەکات تیاچونی کەشتیەکە ئەنجامەکانی خێرایە کە نوقم بوون و بە هیلاکاچوونە .. لێرەدا ئامانجەکە روونتر دەردەکەوێت ..ئەوەش بەوەی کە ئەنجامەکانی تیا چونی کۆمەڵگا خێراترە و نارەحەتترە ..ئەگەر تەماشایی سالآنێك بکەین ئەوە نوقم دەبێت بە پێشێلکردنی یاسا و ئەحکامە خواییەکان، دەی ئاگاداری ئەو خالەبن ...خالێکە کە بەراستی هەر هەموومان نوقم دەبین ئەگەر ئێمە سیستەمی کۆمەڵگا بشێوێنین بە زەلیلی و بێئاگایی خۆمان ..دەی ئازیزانم ئاگاداربن با خۆمان بە دەستی خۆمان ، بەرەو تیاچوون نەرۆین و بە بێ ئەوەی هەستیش بکەین ..

## چەند نموونەیەکی دروست ژیانی ئەوانی بە زیندویتی لە قورئاندا هێشتۆتەوە

ئیماندارەکەی ئەوەی فیرعەون (مُؤْمِنْ آل فِرْعَون) .. فیرعەون ووتی {ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ }غافر:٢٦... واتە ﴿لێم گەڕێن با موسا بکوژم ئیتر با هانا بۆ پەروەردگاری بەرێ (ڕزگاری بکات) بە ڕاستی من دەترسم ئاینەکەتان بگۆڕێت ،یان لە زەویدا فەساد بەرپا بکات ﴾ ئینجا ئیماندارێك لەناو ئەوەی فرعەوندا ئیمانداریێتی خۆیی شاردبوویە و ووتی ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ﴾ واتە ﴿ئایا پیاوێك دەکوژن ،کە بلێت ، پەروەردگارم ((اللـه))یە﴾لە کۆتایدا دەلێت {فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ }غافر٤٤.. واتە ﴿ جا لەمەودوا ئەوەی من پێتان دەلێم دێتەوە بیرتان ،وە من کاری خۆم دەسپێرم بەخوا﴾بەلێ ئەمەیە دروستی ...کاری خۆت بەیتە دەستی خوا دوای ئەوەی گۆڕانت بەسەرخۆدا هێناوە و بە تەواوەتی تەسلیمی خوابیت ...ئەوکاتەش خوای گەورە کاری دروستی بۆ بەدی دەهێنێت ﴿فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا﴾غافر /٤٥...واتە ﴿ جا خوا ئەو(پیاوە ئیماندارە)ی پاراست لە ژیانی ئەو فروفێلانەی دەیان کرد﴾ تەماشای ئەم ئایەتە بکە{وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُواْ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافاً خَافُواْ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللّهَ وَلْيَقُولُواْ قَوْلاً سَدِيداً }النساء:٩.. واتە ﴿ئەوانە(ی سەرپەرشتیارن) با بترس، ئەگەر بەجێی بهێلن لەپاش خۆیانەوە (پاش مردن)

ـەوەی لاواز (بچوك) دەترسن لێیان (بفەوتێن )، دەبا لە خوا بترسن وقسەی ڕاست و ڕەوا بکەن ﴾ ئایا دوای خۆت هەر لە ئایندەی منداڵەکانت دەترسیت و خوای گەورەش بوونی نیە .وە تەماشایی ئیمانداره‌کەی سورەتی (یس) بکە: خوای گەورە دوو پیاو (دوو پێغەمبەر)ی نارد بۆ دێیەك تا ڕێنمایی خەڵکەکە بکەن ، بەڵام ئەوان قبوڵیان نەکرد و خۆیان ـەزانی ، بۆیە خوای گەورە پیاوی سێیەمی نارد{إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوا إِنَّا إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ }یس١٤:...واته ﴿کاتێ دوو(پێغەمبەر) مان نارد بۆ ناویان ـاوەڕیان پێ نەکردن ، ئینجا بە (ناردنی پێغەمبەری )سێیەم بە هێزمان کردن ، جا هەموویان) ووتیان بێگومان ئێمە نێردراوین بۆسەر ئێوە ﴾ لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ـەی بۆ ڕێگای ڕاست و بۆ ئاینی خوا، بەتەنها لە سەرشانی پێغەمبەران نیە ، بەڵکو ـەرکی سەرشانی هەموومانە ، پیاوەکە ووتی {اتَّبِعُوا مَن لاَّ يَسْأَلُكُمْ أَجْراً وَهُم مُّهْتَدُونَ ،وَمَا يَ لاَ أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ،أَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً إِن يُرِدْنِ الرَّحْمَن بِضُرٍّ لاَّ تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً وَلاَ يُنقِذُونِ } یس/٢١-٢٣ ...واته ﴿شوێنی کەسانێك بکەون کە ـری کرێ و پاداشتان لێ ناکەن کەخۆشیان ڕێنموونی کراون ..وە من بۆچی زاتێ ـپەرستم کە منی بەدیهێناوە ، وە هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە ، ئایا جگە لەو(خوا) ـەرستراوانێك بۆخۆم بڕیاردەم ، ئەگەر خوای میهرەبان ژیانی بۆمن بوێ، تکای ئەوان هیچ ـودێ بە من ناگەیەنێ و(لە سزای خوا) ڕزگارم ناکەن﴾ ... بەڵێ ئەوەیە یەقین و متمانەی ـەو بەخوا... وە ئەوەیە ئەو دروستیەی خوای گەورە ئەم نەتەوەو ئاینەی پێ سەربەرز کردووە ، پێش محمد (ﷺ) ودوای ئەویش

## نموونەیەکی تر بەڵام مرۆڤ نیە

{فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ نمل٢٢...... واته ﴿ ئینجا (پەپوو) ماوەیەکی کورت مایەوە ، ئینجا بە سولەیمانی ووت ـوای ئەوەی کەهاتەوە : ئاگادار بووم لە شتێ کە تۆ ئاگادارنیت لێی ، لە (وڵاتی) ـەبەئەوە هەواڵێکی دڵنیا و ڕاستەقینەم بۆهێناوی ﴾ بە داخەوە بۆ ئەو گەلەی هاوەڵیان ـاوە بۆ خوا {إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ، وَجَدتُّهَا

وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُم لَا يَهْتَدُونَ}النمل ٢٣-٢٤.. واته ﴿ بەڕاستی من دیم ئافرەتێك پاشای ئەوانە (ناوی بەلْقیسە) لە هەموو شتێکی (پادشایەتی) پێوە دیاربوو ، و تەختێکی(پادشایەتی) زۆر گەورەی هەیە ،خۆی وگەلەکەیم دی لە جیاتی خوا سوژدە بۆ ڕۆژ دەبەن ، وە شەیتان کردەوە (خراپە) کانیانی بۆ ڕازاندبوونەوە ، بەهۆیەوە ئەوانی لادابوو لە ڕێگەی ڕاست ،بۆیە ئەوان ڕێگای ڕاست نادۆزنەوە﴾تەماشای پەرۆشی ئەو باڵندەیە بکە بۆ ئاینی خوای گەورە ئاسان نەبوو بەلایەوە کە هاوەڵ بۆخوا دابنرێت، بۆیە بەڵگەی لەسەر ئەو گەلە دروست کرد ،وە گەڕانەوە بۆڕاستی و هۆشداری بەفەزڵی هەوڵدانی پێشەوامان سولەیمان ﷺ {أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ }النمل٢٥ واتە ﴿بۆئەوەی سوژدەنەبەن بۆ ئەو خوایەی کە ئەوەی شاراوە بێت لە ئاسمان وزەویدا دەری دەخات ،وە دەزانێت چی دەشارنەوەو چی ئاشکرادەکەن ﴾ بەڵێ ... پەرۆشی وغیرەت بۆئاینی خوا بەو شێوەیە ...با ئێمەش لەو پەپوو سلێمانەوە فێرببین...

## مێرولەیەك ... و دروستی و ئاوێتە بوون لە گەڵ کۆمەڵەکەیدا !

تەماشایی سوپاسکردنی پێشەوامان سولەیمان ﷺ بکە بەهۆی مێرولەوە ، لەگەڵمدا لەم چەند ئایەتە ڕامێنە{حَتَّى إِذَا أَتَوْا عَلَى وَادِي النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ، فَتَبَسَّمَ ضَاحِكاً مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ }النمل ١٨-١٩ واتە:﴿هەتا کاتێ گەیشتنە سەر شیوی مێروولە(کە پڕبوو لە مێروولە ) ، مێروولەیەك ووتی : ئەی مێروولەکان بڕۆنەوە ناوماڵەکانی خۆتان (کۆنەکانتاندوە) با سولەیمان و لە شکرەکەی نەتان فلیقێننەوە (ووردوخاشتان نەکەن —زانستی نوێ سەلماندویەتی مادەی شوشە لە لەشی مێروولەدا هەیە بۆیە وشەی(يَحْطِمَنَّكُمْ) بەکار هاتووە — وەرگێڕ— ، لە کاتێکدا (ئەوان هەست ناکەن) ئینجا

(سولەیمان بە سەرسامیەوە) سە بارەت بەقسەی مێرووڵەکە پێکەنی و خەندە گرتی ، ووتی : ئەی پەروەردگارم ڕام بێنە ، کە سوپاسی ئەو ڕۆزیانەت بکەم کە ڕشتوتە بەسەرمندا و باوك و دایکمدا ، وە کردەوی چاك بکەم کە تۆ پێی ڕازی بیت ،وە بە بەزەیی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانت ﴾ ئایا دروستی دەبینی لێرەدا ؟ بەڵێ مێرولەیەك سوورە لە سەر ئەوەی پێشەنگی کۆمەڵەکەی بێت و ترسی هەیە تووشی زیان بن وە خۆی نە کرد بە کۆنەکەیدا تاوەکو تەنها خۆی ڕزگار بکات ، حەزرەتی سولەیمانیش ﷺ کاتێ گوێ ی لە وەوە بوو دوعای کرد :﴿ سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەم شتانە منەت باری کردووم ....وێنای بکە ئێمە ئێستا بە دروستکاریەوە بژین ،ئەبێ حاڵمان بە بۆچونی تۆ چۆن بێت؟ بێگومان کاروبارێکی زۆر لە ناو ئەم نەتەوە موسڵمانەماندا دەگۆرێت.

## یەك ئیماندار دەتوانێت ئیسلام و موسڵمانان سەربخات

فەرموو تۆو بەسەرهاتی (الحباب بن منذر) : پێغەمبەر ی خوا – ﷺ – پیلان دادەڕێژێت بۆ جەنگی بەدر ..دەفەرموێ ﴿لێرەدا دەوەستین ، لێرەدا دەجەنگین ، ئەوە و ئەوە دەکەین ....﴾ (الحباب بن المنذر) یش ووتی :﴿ئەی پێغەمبەری خوا ، ئایا دابەزیوەو خوای گەورە بۆی دابەزاندویت ، یان ئەوە جەنگ و ڕاوێژو فێڵ و تەڵەکەیە ؟ اللـه... تەماشای دروستکاری بکە لە پرسیارەکەیدا ؟ بە هێمنی و زیرەکیەوە پرسیار دەکات تا بە قسەکانی درێژەی پێنەدا بەسەر پێغەمبەر – ﷺ – دا بەبێ ئەوەی هەست بکا .پێغەمبەریش – ﷺ – لە وەڵامدا دەفەموێ﴿بەڵکو ئەمە جەنگ ڕاوێژ و فێڵە ﴾ئەویش ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە دانەبەزیوە، دەی خەڵکی هەستێنە تا بیگەینە نزکترین ئاو لە وانەوە (واتە نزیکترین بیرەکان لە بێبڕواکانەوە) بچینە سەر بیرەکان، پاشان سەرچاوەی ئاوەکانیان لێ بگرین پاشان حەوزێك دروست بکەین پری بکەین لە ئاو ، پاشان لە گەڵیاندا بجەنگێین، ئێمە ئاو بخۆینەوە و ئەوان نەی خۆنەوە ﴿ چونکە حەوزە پرلە ئاوەکە لە پشت موسڵمانانەوە و لە ئاراستەی ئەواندا بوو﴾ .. بۆیە پێغەمبەر – ﷺ– ڕا و بۆچونەکەی قبوڵ دەکات و دەفەرموێ﴿ بەڕاستی ڕاوبۆچونەکەت جوانە و پێکاوتە﴾ بێگومان .... هەرچەندە بە

ئەدەب و داناییەوە بەبیّ درێژە پێدان لە گەڵ گەورەی خۆیدا داواکاری هەبێت ، بێگومان ئەوەیە دروستکاری.

وە گویّ لە بەسەرهاتی پێشەوامان (نعیم بن مسعود) بگرە : لە کاتی (ئەحزاب) دا موسڵمان بوو ، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ، بێگومان من موسڵمان بووم ، پێغەمبەر یش فەرموی﴿ بەڕاستی تۆ ئەی (نعیم) پیاوێکی لە ئێمە دەی ئەوانمان بۆشکست بهێنە﴾ ئەو پیاوە ڕۆشت و پیلانێکی دروست کرد لە نێوان جولەکەو کافرەکاندا، ئایا ئەنجامەکەی چی بوو؟ سەرکەوتنی موسڵمانان بە دروستکاری یەك کەس .

ئایا لەگەڵمدا دەرك بەوە دەکەن چۆن سەراپا نەتەوەیەك دەتوانێت بەهۆی یەك کەسەوە سەرکەوێت؟....... یەك ئیماندار دەتوانیّ ئیسلام و موسڵمانان سەرخات ، ئیتر چاوەڕوانی چی بین؟

## بنیاتنانی مزگەوت لە زانکۆ ڕەوتێکی شارستانیە

باسی بەسەرهاتێکی زۆر کۆن دەکەم کە ساڵانێکی درێژ ڕوویداوە : لە سەردەمێکدا خەڵکی شەرم دەیگرتن پەرستشەکانیان ئەنجام بدەن ، بەتایبەتی نوێژکردن لەبەردەم یەکتریدا .لاوێك ڕۆشتە زانکۆوە و پرسیاری کرد : ئایا شوێنێك هەیە نوێژی تیادا بکەم ؟ ووتیان : تۆی گەنج نوێژ دەکەیت ؟ نوێژ بۆ بەتەمەنەکانە ،بۆ پیرێك کە لە کۆتایی ژیاندا بێت !بەڵام ئەو هەر سوربوو لەسەر ئەوەی نوێژەکەی بکات ، ئاماژەیان بۆکرد کەشوێنێکی بچوك هەیە لە ژێر زانکۆکەدا و ژێرزەمینە و بەزمانی گشتی پیّ ی دەڵێن ﴿خربە﴾ وێرانە، ئەویش ڕۆشتە شوێنەکەو پیرە پیاوێك ی بینی نوێژی دەکرد و، لێی پرسی: مامە گیان بۆچی لێرەدا نوێژ دەکەیت .. پیرە مێردەکەش ووتی :بۆ ئەوەی کەس نەم بینێت .... کوڕەکەش غیرەت گرتی و دەستی پیرە مێردەکەی گرت و ووتی : ئەبێت لە بەرزترین شوێنی ئەم زانکۆیەدا نوێژ بکەین ...کاتێك تەواو بوو ڕۆشت بۆ گۆڕەپانی زانکۆکە کە وانەی تێدا دەخوێنرا ، دوو ڕکات نوێژی کرد ...لاوەکان ئاماژەیان بۆدەکرد و ڕۆژی یەکەم گاڵتەیان پیّ دەکرد ،

ـ رۆژی داهاتوو پیرە مێردەکەش لە گەڵیدا نوێژی کرد ، بۆ رۆژی سێیەم بوون بە یەك
ـڕیزی تەواو ... دوای ئەوە بوون بە چەند ریزێك ...ووتیان بۆچی مزگەوتێ بنیات نەنێن تا
ـێرەدا موسڵمانان نوێژی تێدا بکەن ؟ بۆیە ئەوە رِوویدا ، نەك تەنها ئەوە ....بەڵکو
ـنکۆکانی دەوروبەریشیان هەمان رەوتی ئەمیان گردە بەر و داياننا بەرەوتێکی شارستانی
کەئەویش بنیات نانی مزگەوتە و ئەنجامدانی (شعائر) ی خوای گەورەیە تیایدا..

وێنای بکە پاداشتی ئەو لاوە بە دروستکاریەکەی کە بانگەوازی بۆکرد کە ئەویش
ـیات نانی مزگەوت بوو کە تا رۆژی قیامەت نوێژی تێدا بکرێت وێنای ئەجرو
ـداشتەکەی بکە چەند زیاد بکات هەرکاتێك یەکێك لەو مزگەوتەدا نوێژ بکات .دوای
هەموو ئەوانە ئەبێ دروستکاریمان چۆن بێت بۆ ئاینەکەمان ؟ ئایا هەر وەك خۆمان بین یان
پێشکەوتنێکی بەرچاو پێش بکەوین بۆخزمەتکردنی ئەم ئاینە مەزنە؟ ئێمە خوازیاری ئەوەین
ـوەکو پێشی جیهانی رۆژئاوا بدەینەوە و غیرەت و کەرامەتمان پشت بە خوا بۆ بگەڕێتەوە .

# ﴿ متمانە بەخوا ﴾

## متمانەیەکی بێ سنور ... متمانەیەکی دڵنیایی

بانگەوازی زۆرمان بۆخوای گەورە کردووە ، بە شەو و بە ڕۆژ بانگەوازی بۆدەکەین ...لە وانەیە ..بەڵام ئایا بەدڵنیاییەوە بانگەوازی بۆدەکەین؟ بەمتمانەوە بانگەوازی بۆدەکەین ؟ئەوە ئەو پرسیارەیە کە پێویستە لە خۆمانی بکەین ...لەبەرئەوە پێویستە متمانەمان بەخوا هەبێت متمانەیەکی بێ سنور،متمانەیەکی دڵنیایی ڕاستەقینە ، ئەوەش بەو شێوەیە بێت نەیبەستینەوە بە ئەنجامەکانمانەوە، بەو مانایەی متماندمان بە بەخشینی خوای گەورە هەبێت بە توانایی دەسەڵات و ئیرادەی کە توانای بەسەر هەمووشتێکدا هەیە بە بێ گومان و دودڵی کە خوای گەورە (قادر)تواناداره (مهیمن) و(قهار)ە چۆنی بوێت ئەمدیودیوی پێ دەکات ، خوای گەورە دەفەرمووێ {وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ} الاحزاب – ٢٢..... واتە ﴿وەکاتێ ئیمانداران ئەو کۆمەڵانەیان دی (کە لەشکریان هێنابوو بۆ سەر شاری مەدینە) ئەمە ئەو بەڵێنەیە خواو پێغەمبەرکەی بەئێمەی دابوو ، خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان وتبوو ﴾ بەڕاستی مرۆڤ پەیوەستدارە بە گۆڕانکاریەکانیەوە و بە بارودۆخەکانی ژیانیەوە بەشێوەیەکی گشتی بەڵام ئیماندار هەرچەندە نارەحەتی و مەینەتیەکانی زیاد بکات دەبینیت متمانەی بەخوا زیاد دەکات ...دەڵێت :﴿لبیك وسعدیك،الخیر بیدیك، والشر لیس الیك﴾ ئایا هێشتا متمانەمان پەیوەست دارە بە ئەنجامەکانەوە؟ وە ئایا ئەنجامەکان گۆڕان ماتمانە بەخوا دەگۆڕێت.

ئازیزانم ..... متمانەمان بە خوا کێشەی تێدایە .... لەرزینێکی تێدایە پێویستە ..گۆڕمان بێت لێی.... وە بۆئەوەی ئەو بۆشاییانە بنبڕ بکەین کە جێگیر بووە لە دەروونی .زۆربەی ئەم نەتەوەیەدا ، پێویستە لە هەموولایەکەوە ڕەزامەندی لە ناخمانە بچێنین ، وە بەو شێوەیە ئاسان دەبێت بەلامانەوە بەرەنگاری هەرکێشەیەك ببینەوە کە تووشمان دەبێت

## ئەی ئاگر سارد و بێ زیان ببە... { يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلَاماً }

خوای گەورە سیستەم ویاسای جێگیری داناوە لە گەردووندا...وەکو ئاگر....و خۆر و کاریگەریەکانیان؟ وە خوای گەورە چی بوێت دەیکات ..لە ناو جەرگەی بەهیلاکاچوندا ..گارکەرە .. ئەی خوێنەری ئازیز، فەرموو لەگەڵ بەسەرهاتی پێشەوامانداً، ابراهیم ﷺ کافران ڕێکەوتن بیخەنە ئاگرەوە تا خواکانیان سەربخەن ...ئایەتەکەچی دەفەرموێ ؟ قالوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ }الأنبياء٦٨ ... واتە ﴿(هەندێك لە بت پەرسان ) ووتیان: (ابراهیم) چاك بسوتێنن ، یارمەتی خواکانتان(بتە کانتان ) بدەن ، ئەگەر بێوە ئەو کارە دەکەن﴾

وە خوای گەورە لەم ئایەتەدا چی دەفەرموێ {قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلَاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَأَرَادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ }الأنبياء٦٩ واتە ﴿(کە ئیبراهیمیان خستە ئاگرەکەوە) ووتمان ئەی ئاگر ساردبەرەوە و بێ زیانبە بۆ ئیبراهیم، ئەوان ووتیان پیلان بگێڕن بە ئیبراهیم ،بەلام ئەوانەمان کردە زەرەرمەندترین کەس﴾

وە لە وانەیە بپرسیت : بۆچی خوای گەورە ڕزگاری نەکرد پێش ئەوەی فڕێی بەنە ئاگرەکەوە... ئەگەر وا نەبوایە ئەو متمانەی ئیبراهیم ﷺ مان بە خوای گەورە بۆ دەرنەدەکەوت ... سوێندتان ئەدەم بەخوا..کێ ئەتوانێ لەگەڵ ئاگردا بدوێ .. فەرمانەکەی جێبەجێ بکات بێجگە لە خوای گەورە؟

نمونەیەکی ترلە متمانە بەخوا:

خوای گەورەو میهرەبان پێغەمبەرایەتی دەردێنێ لە ناو جەرگەی بێ باوەڕیدا ... پێشەوامان موسا عليه السلام لە کوێ پەروەردەکرا و گەورەبوو ؟خوای گەورە دەفەرموێ {فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوّاً وَحَزَناً إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ }القصص٨ ... واتە :﴿ئینجا دارودەستەی فرعەون پێیان زانی و هەڵیان گرتەوە بۆ ئەوەی ببێت بە دوژمن و هۆی خەفەتیان بۆیان ، ڕاستی فیرعەون و هامان و لەشکرو سەربازەکانیان تاوانبار و هەڵەبوون﴾تەماشایی مەزنی خوای گەورە بکەن ، خوای گەورە ئاو لە بەردەلآن دەردەهێنێ..ئایەتەکە دەفەرموێ {وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ }البقرة٦٠ واتە ﴿ کاتێ موسا داوای باران بارینی کرد بۆ گەلەکەی ، ئێمەش پێمان ووت : گۆچانەکەت بیە بەو (تاشە) بەردەدا،(کەلێیدا) لە پڕ دوانزە کانیی لێ هەڵقولآ، بێگومان هەموو تیرەیەك چاوگە(ئاوخۆرە) ی خۆی ناسی ﴾ وێنای بکەن ! بە گۆچانەکەی دەکێشێت بە بەردەکەدا . دەبوایە گۆچانەکەی بشکایە ، بەلآم خوای گەورە ڕوداوێکی تر دەسازێنێ . ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ﴾ واتە ﴿هەموویان لە بەردەلآنەکە ئاویان خواردەوە﴾...

## ڕیشکیان قوڵەو سەرکەشن

برایانم ..بۆچی متمانە نەچێنین لە دەروناان و دەرونی مندالەکانمان ؟ بەچاکی بیچێنین تاوەکو هیچ کێشەیەك هەڵی نەکەنێت

پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم دەفەموێ بە إبن عباس ﴿ واعلم ان الامة لو اجتمعوا على ان يضروك شئ لن يضروك الا بشئ قد كتبه الله عليك ﴾ واتە ﴿وە بزانە ئەم نەتەوەیە کۆ ببنەوە تاوەکو بەشتێك زیانت پێ بگەیەنێ ، ناتوانن بەهیچ شتێ زیانت پێ بگەیەنن مەگەر خوای گەورە نوسیبێتی لە سەرت ﴾ هەرچەندە (ابن عباس ) هێشتا نەوجەوان بوو ﴿ و ان الامة لو اجتمعوا على ان ينفعوك بشيء لن ينفعوك الا بشيء قد كتبه الله عليك﴾الترمذی/١٦٢٥﴾

.... واته﴿وه ئەگەر ئەم نەتەوەیە کۆبنەوە تاوەکو بە شتێك سودت پێبگەیەنن ، ناتوانن بە هیچ شتێك سودت پێ بگەیەنن مەگەر خوای گەورە نوسیبێتی لە سەرت﴾ تەماشایی پێغەمبەر ﷺ بکەن چۆن ماتمانە بەخوا لە دڵی منداڵاندا دەچەێنێت ...کەواتە خوای گەورە یاساکانی گەردون دەگۆڕێت، لە ناوجەرگەی و تاپاچون دا مرۆڤ رزگار دەکات و لە ناوجەرگەی بێباوەڕیدا پێغەمبەر دەنێرێت .... و لەناوجەرگەی بەرددا ئاو هەڵدەقوڵێنێ...بە ڕاستی خوای گەورە توانای بە سەر هەموو شتەکاندا هەیە ... بەراستی ئەو زاتە مردوو بە مردوو زیندوو دەکاتەوە – واتە رۆحی مردوو دەگەڕێنێتەوە بە شتێکی مردوو –ئایەتەکەدەفەرموێ {وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ، فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ } البقرة/٧٢–٧٣﴾ واتە﴿( بیر بکەنەوە )کاتێك کەیەکێکتان کوشت ، وە هەمووتان لە خۆتان دووردەخستەوە ، وە خواش ئاشکرای کرد ئەوەی کە ئەتان شاردەوە ئینجا ووتی بە ئەندامێك (ی مانگاسەربڕاوەکە)لە کوژراوەکە بدەن ، ئاوا خوا مردوان زیندوو دەکاتەوە، وە بەڵگەو نیشانەکان پیشانی ئێوە دەدات ، تاوەکو تێبگەن﴾واتە: بەنی ئیسرائیل ، کەسێکیان کوشت بەڵام نەیان زانی کێ کوشتویەتی ، پەروەردگاریان فەرموی مردویەك لە مردویەك بدەن ، واتە مانگایەك سەر بڕن ، و یەکێك لە قاچەکانی بەرن بیشکێن بە مردوەکەدا و بە ویست و دەسەڵاتی من زیندوو دەبێتەوە ، ئەو کاتە پێیان دەڵێن کێ کوشتویەت ...کێ دەتوانێ شتی وا بڵێت بێجگە لە خاوەنی ئەم هەموو جیهانە کە خوای مەزن و پەروەردگارە .

نەك تەنها ئەوندە بەڵکو پێچەوانەی هەموو شتێکت نیشان دەدات ، بۆنمونە: لە بنچینەدا چەقۆ بۆ سەربرینە، بەڵام اسماعیل عليه السلام سەرنابرێت ..ئاگر لە بنچینەدا سوتێنەرە کێ وای لێکرد ساردو بێ زیان بێت لە سەر ئیبراهیم ؟ ئەمە فەرمانی خوایە ...ئەو فەرمووی بە نەهەنگەکە یونس عليه السلام قوت بدات ...هەر ئەو زاتە ڕووباری شەق کرد تاوەکو موسا عليه السلام ڕزگار بکات ... هەمووشتێك بە دەست خوای تاك و تەنهایە ، کە پەرستراو نیە بێجگە لەو

## سەرکەوتنمان بۆ دێت بێ ئەوەی بزانین...

برای خوێنەر ..پێویستە هەمیشە متمانەت هەبێت کە بەدڵنیاییەوە خوای گەورە توانای بەسەر هەمووشتێکدا هەیە ... نەك تەنها ئەوەندە ..بەڵکو خوای گەورە سەرت دەخات و ئاینەکەشی سەر دەخات لە سەردەستی دوژمنان ...ئایا ئەزانی بۆچی خەڵکی شاری مەدینە، ، موسڵمان بوون ؟؟..... بە هۆی جولەکەوە ! ... بەڵێ جولەکەکان خەڵکی شاری مەدینەیان ئامادەباش کرد بۆ دەرکەوتنی پێغەمبەرﷺ دەیان ووت بە هەردوو هۆزی (ئەوس و خەزرەج) کە بەدڵنیاییەوە پێغەمبەرێك لەم ئاخر زەمانەدا دێت و ئێمە شوێنی دەکەوین و دەجەنگین لەگەڵتاندا و هەرەستان پێ دێنین.. کارێکیان دەکرد لە دڵی خەڵکی شاری مەدینەدا، هاتنی پێغەمبەریان دەچاند ... پێغەمبەر دێت بەڵام کاتێك لە ناو عەرەبدا پێغەمبەرەکە هات موسڵمان نەبوون، چونکە بڕوایان وابوو لە ناو خۆیاندا ئەو پێغەمبەرە سەرهەڵدەدات ... کاتێك پێغمبەرﷺ سەری هەڵدا خەڵکی شاری مەدینە ئامادەباش بوون بۆ دەرکەوتنی ئەو پێغەمبەرە، بۆیە ئەم ئاینە بڵاو بوویەوە لە سەردەستی دوژمنانی ئاینەکە.

سبحانە اللە ! لە سەر دەستی دوژمنان .سەکەوتنمان بۆدێت بەبێ ئەوەی حسابمان بۆبکرێت : ئایا هەر متمانە بەخوا هێشتا لە لەرزیندا یە ؟

## چەند ئایەت و بەڵگەو نیشانەیەك لە سەر مەزنی وتوانای خوای گەورە.

ئەم ئایەتانە بەباشی بخوێنەوە {وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ }الأنعام٥٩.... واتە﴿لای ئەوە(خوای گەورە) کلیلی هەموو نهێنیەکان کەس نایزانێت بێجگە ئەو (خوا) ، وە (خوا) دەزانێت چی لە وشکانی و دەریادا هەیە ،وە هەر

گەلآیەك بکەویتە خوارەوە پێی دەزانێ و هەر دانەوێڵەیەك لە تاریکاییەکانی زەویدا بێت و هەر تەڕ و ووشکیەك هەبێت هەموویان لە کتێبی ئاشکراداان(لوح المحفوظ )﴾

سبحانه اللـه.... هیچ شتێك ڕوونایات تەنانەت گەڵای درەختێکیش خوا گەورە دەزانێت لە کوێدا جێگیر دەبێت ، وە دەنکە لقێکیش لە کتێبی خوای گەورەدا باسکراوە ... سبحان اللـه چەند مەزنە... سبحان اللـه چەند بەتواناو دەسەڵاتە .فەرموون لە گەڵ ئەم ئایەتەدا : {اللّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ } الزمر/٤٢.. واتە ﴿ خوا گیانەکان دەکێشێ لە کاتی مردنیاندا، وە ئەوەی نەمردبێت لە کاتی خەوتنیدا ، ئینجا ئەو (گیانانە ) ڕادەگرێت ، بڕیاری مردنی داوە ، وە ئەوانی تر بەرەڵا دەکات (کەدەبێت زیندوو بمێنن ) ، تا ماوەیەکی دیاری کراو، بەڕاستی لەمەدا چەندین بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی کە بیردەکەنەوە﴾ مانای ئایەتەکە ئەوەیە دەروون هەمووشەوێك دەگەڕێتەوە بۆلای پەروەدگاری .... پاکوبێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە تواناداڕە بەسەر هەموو شتێکدا.

وە ئایەتێکی تر سەبارەت بە مەزنی و دەسەڵاتی خوای گەورە : ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاء﴾الانبياء/١٠٤﴾...واتە ﴿ئەو ڕۆژەی کەئاسمانەکان دەپێچینەوە﴾ ئاسمان دەپێچینەوە وەك پێچانەوەی پەڕە بۆ نوسین لە ڕۆژی قیامەتدا... یااللـه ... ئایا هێشتا متمانەمان بەتواناو دەسەڵات خوا لاوازە؟...﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ الزمر/٦٧ ...واتە ﴿(کافران ) خوایان نەناسیوە بەو جۆرەی کە شیاوی ئەوە، وە لە ڕۆژی دوایدا هەموو زەوی لە چنگی ئەو دایە (بەدەست خوایە)﴾ ئایا هەست بەموڵکی خوا دەکەیت ...

{قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ } ال عمران/٢٦ ...واتە:﴿بڵێ ئەی خوای خاون دەسەڵات ، دەسەڵات دەدەیت بەهەرکەسێ دەتەوێ ،و دەسەڵات ئەسێنیتەوە

لەهەرکەسێ کە بتەوێت ، و بەرێزی دەکەیت ئەوەی کەبتەوێ ،و بێ رێزی ئەکەی ئەوەی کەبتەوێ، تەنها بەدەستی تۆیە هەموو چاکەیەك ، بەڕاستی تۆ بەسەرهەموو شتێکدا بەتوانایت﴾

بارایانم ئێمە موڵکی کێین؟ ، گەردون موڵکی کێیە ؟..ئەگەر ئەو متمانەیەت بەخوا هەبێت ..وە دڵنیاییت هەبێت بەموڵکی خوای گەورە ..ئەوە متمانەت بە دەسەڵات و مەزنی ئەو زاتە هەرگیز نالەرزێت.. تەماشای پێغەمبەر ﷺ بکە کاتێ لە ئەشکەوتەکەدا ابوبکر ﷺ ی لە گەڵ بوو...پێشەوامان ابوبکر ﷺ پێی ووت : ئەگەر یەکێکیان تەماشای خوارەوەی قاچی بکات دەمان بینێت ... وە پێغەمبەرﷺ فەرمووی ﴿ ماظنك باثنين الله ثالثهما ﴾ مسلم : ٦١١٩ والترمزی :٣٠٦٩ واتە﴿ گومانت چۆنە بە دووکەس خوای گەورە سێهەمیان بێت﴾ .... ئایا شیاوی ئەقڵە ، خوای گەورە سێهەمیان بێت و دەسبەرداریان ببێت ؟.....

ئایا پێغەمبەرﷺ ت بینی بەهای پەروەدگاری خۆی دەناسێ کە شوێنی کوتووە و دەزانێت کە هەقە و متمانەی هەیە کە خوای گەورە ڕزگاری دەکات .... برایانم نەکەن متمانەتان بلەرزێت ..چونکە متمانەبەخوا کارێکی بنچینەییە بۆ سەرکەوتنی ئەتەوە ......

## کەشتیەك لە بیاباندا ...

با نمونەیەکی تر ببینین لە متمانە بەخوا لە بەسەرهاتی پێشەوامان موسا ﷺ ئەو لەبەردەم دەریادایە ... دەریاکەش شەپۆل دەیا و فرعەون و سەربازەکان بە شوێنیەوەن و دەیانەوێت لە گەڵ شوێن کەوتوانیدا بیکوژن ... هاوەڵانی موسا ووتیان: ئەوە دەرکەوتین ..موساش ﷺ فەرموی { كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ } الشعراء/٦٢....واتە﴿ نەخێر، بێگومان خوام لەگەڵدایە و ڕێنومایم دەکات﴾

سبحانەاللـە ...بە دەریادا دەڕوات و متمانەی هەیە کە خوای گەورە ڕزگاری دەکات و سەری دەخات بەسەر فرعەون و سەربازەکانیدا ...و دەفەرموێ : بێگومان من

بەروەدگارم لەگەڵدایەو ڕێنومابیم دەکات ... تەماشای پێشەوامان نوح ﷺ بکەن ئایا بڕوا دەکەیت کە خوای گەورە هەواڵی پێدا کە لەناو گەلەکەیدا کەسێکی تر باوەڕ ناهێنێت بێجگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوە .... فەرمانی پێدا کەشتیەك دروست بکات ....ئایەتەکە دەفەرموێ {وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلاَ تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ } هود/٣٧﴾ واتە ﴿ وە کەشتیەك دروست بکە بە چاودێری و نیگای ئێمە کەبۆت کراوە ) وە مەمدوێنە ، لە بارەی ئەوانەی ستەمیان کردوە ، چونکە بێگومان ئەوانە دەخنکێنرێن ﴾ ئایا ئەزانی (الفلك) چیە ؟ کەشتیەك بوو داوا کرا لە پێشەوامان نوح کە لە بیاباندا دروستی بکات !! ئایا ئەزانی چەندە کاتی دەوێت ؟ یەکەم جار درەخت دەچێنێت و چاوەڕوانی دەبێت هەتا گەورە ببێت و پاشان ببیڕێتەوە !! واتە پێویستی بە چەندین ساڵ هەیە . ئەی چی دروست دەکات ؟! کەشتیەك لە بیاباندا؟! ئایا ئەوە هۆکاری ڕزگاربوونە؟؟

ئایا دەزانیت بۆچی خوای گەرە داوای ئەوەی لێکرد ؟تا متمانە بە بوونی خوا چەسپاو بکات.. سوێندت ئەیەم بەخوا ئەگەر تۆ لە جێگای پێشەوامان نوح ﷺ بویتایە ئایا متمانەت بەخوا دەلەرزی یان بە جێگیری و بە بادەڕوە دەمایەوە؟؟؟ کەشتیەك لە بیاباندا .دەتوت: ئایا ئەو کەشتیە ئێمە ڕزگار دەکات ؟؟

ئازیزانم کەشتی ئەمرۆی ئێمە ...پیادەکردنی ئەم ئایەتەیە﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ ﴿الرعد:١١﴾ واتە ﴿بەڕاستی خوا(باروحاڵی) هیچ گەلێك،ناگۆڕێت ، هەتا ئەوانِ خۆیان (باروحاڵی ) خۆیان نەگۆڕن﴾

نەڵێیت :من ئومێد نابینم! بیابانی سەردەمی پێشەوامان نوح – علیەالسلام– بیابانی واقیعی ئێمەیە ...وە شوێنکەوتوانی پێشەوامان نوح ﷺ متمانەیان بەخوا هەبوو ، کەشتیەکەیان بونیاتنا تا سواری بن ...لە کوێ؟؟ لە بیاباندا ... خوێنەری بەرێز ..توخوا متمانەت هەبێت کە بێگومان خوای گەورە دەسەڵاتدارە بە سەر هەمووشتێکدا ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ ﴿الرعد:١١﴾ واتە ﴿بەڕاستی خوا(باروحاڵی) هیچ گەلێك،ناگۆڕێت ، هەتا ئەوان خۆیان (باروحاڵی ) خۆیان نەگۆڕن﴾

# ﴿لێبڕان له كاردا﴾

## گۆڕانكاریی دەروونەكان :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (( اضمنوا لي ستة من انفسكم اضمنُ لَكُم الجَنَّة )) واتە (( زامنی شەش شتم بۆ بكەن لە خۆتاندا من زامنی بەهەشتان بۆ دەكەم ، تەماشا دەكەین نیوەی پەیوەندی بە ئاكارەوە هەیە و نیوەشی بە پەرستشەوە :

١) أَوفُوا إِذا عَاهَدْتُمْ ( ئەگەر پەیمانتان دا بە وەفا بن )

٢) و أَصْدِقُوا إِذا حَدثْتُم ( ئەگەر قسەتان كرد ڕاستگۆ بن )

٣) و أَدّوا إِذا ائتُمِنْتُم ( ئەگەر ڕاسپاردەیان پێدان بە ئەمانەتەوە بیگێڕنەوە )

٤) و احْفَظُوا فُرُوجَكُم ( داوێنتان بپارێزن )

٥) وغَضُّوا أَبْصَارَكُمْ ( چاوەكانتان بپۆشن )

٦) و صِلُوا أَرْحَامَكُمْ ( سیلەی ڕەحم بە جێ بێنن ) رواه الامام احمد ف مسنده (٥-٣٢٣ )

خوێنەری ئازیز .... ئەمە مەسەلەی گۆڕانی دەروونەكانە .... واتە ئەم شەش شتەم بۆ زامن بكەن ، منیش بەهەشتنا بۆ زامن دەكەم ... پیاوچاكێ ووتەیەكی زۆر گرنگی هەیە دەڵێ : ئەی خەڵكینە ، گۆڕەپانی یەكەمتان دەروونەكانی خۆتانە ، ئەگەر توانیتان سەركەون بە سەریدا ، ئەوە دەتوانن بە سەر شتەكانی تردا سەركەون ، وە ئەگەر هەرەستان هێنا لە بەردەم دەرونتانا ، ئەوە بە سەر شتەكانی تریشدا لاواز ترو دەستەوسانترن ... وە ووشەی گۆڕەپان ( مَیدان ) لە جەنگدا هاتووە ، ئایا ئەم قسەیە ڕاست نیە ؟.... ((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ )) ( الرعد – ١١) واتە : ﴿بێگومان خوای گەورە گۆڕانكاری بە سەر هیچ هۆز و نەتەوەیەكدا ناهێنێ هەتا خۆیان خۆیان نەگۆڕن ...

دەی ... دەست بخەنە ناو دەستم ، و بەڵێنم پێ بدە لە سەر گۆڕانکاری .... وە بزانە کە پەروەردگار ئێستا ئاگای لە ئێمەیە ....

## ستراتیژی گۆڕانکاری ....

باس لە ستراتیژیەتی گۆڕانکاری نەتەوە و هەڵسانەوەی دەکەین ، هەرجارەی باس لە دەردێك لە دەردەکانی نەتەوە دەکەین ، وە دەڵێین : پێویستە ڕاست بکرێتەوە ، و کۆکین لە سەری ، وە هەڵدەستین بە ئەرکی خێرای سەرشانمان بەرامبەر بەم نەتەوەیە ....

باس لە ڕۆڵی لاوان دەکەین ، وە لە لێبڕان .... ئێوەش دەڵێن : باسمان لە دروستکاری کرد .... بەڵێ ، دروستکاری پێچەوانەی نادروستیە ، بەڵام لێبڕان لە کاردا پێچەوانەی خاوی و مەنگیە ...

داوای لێبوردن دەکەین لە سەر لێکچواندنەکە .... بەڵام دیاردەیەکە زۆر بڵاوە لە ناو ئەم نەتەوەدا ، مادام بوونی هەیە لە ناو لاوانی ئەم نەتەوەدا ، ئەوە ئەستەمە گۆڕان ڕوو بدات ....

مەنگی و چەق بەستوویی ، هیچێتی ، بیانوگرتن ، گوێ پێنەدان ، لێ نەبڕان ... ئەمانە مانای تری زۆریان هەیە لە ناو کۆمەڵگاکەماندا ، بەڵام شەرم دەکەم بیانڵێم .

مەزنترین شتێ کە نەتەوە خاوەنی بێت .... لاوەکانیەتی

ئاگاداربن ئەی لاوانی ئەم نەتەوەیە ، دەپرسن بۆچی قسەکانم ئاراستەی لاوان دەکرێت ؟ چونکە لاوان لەمڕۆدا ٧٠٪ ی سەرژمێری کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی پێك دەهێنێت ... بەڵام لاوان لە ڕۆژئاوادا ٣٠٪ ی کۆمەڵگاکەیانن ، دەزانن مانای ئەمە چیە ؟ مانای ئەوەیە زیندوێتی لەم سەدەیەدا بۆ نەتەوەی ئێمەیە .... چونکە ئێمە خاوەنی زۆرترین لاوان و زیندوێتین ، بەڵام ئیتر لەچی بترسین ؟ لەوە بترسین ئەگەر ئەو ٣٠٪ ەی خۆرئاوا کاریگەری و لێبڕانی زیاتریان هەبێت ... بە بەراورد لە گەڵ ٧٠٪ ەکەی لای ئێمە

هاوکێشەی ٧٠٪ یەکسان نیە بە هیچ لە بەردەم (٣٠٪) دا ، ئەی چارەسەر چیە ؟ ئەم قسەیە زۆر گرنگە ، چونکە ئێمە نەتەوە بنیات دەنێین .... ئێوەش دەڵێن : ئەی لاوان بۆچی ؟

چونکه قۆناغی منداڵی تەندروستیە و عەقڵی تێدا نیە ... قۆناغی پیریەتیش دانایە بەڵام هێزی تێدا نیە.... کەواتە کێ خاوەنی ئەو دوانەیە ؟ ..... تەندروستی و دانایی ؟ ئێوەن ئەی لاوەکان ... ئەم نەتەوەیە خاوەنی چیە ؟ کە ڕێژەیەکی دیاریکراوی نیە لە پەترۆڵ و خاوەنی کۆمپانیای گەشت و گوزاریە ؟ مەزنترین شتێ کە ئەم نەتەوەیە خاوەنیەتی ( لاوانە ) .

## نەتەوەکان بە گەنجان و لاوانیان دەپێورێن

نەتەوەکان بە گەنجان و لاوانیان دەپێورێن ،زانایانی کۆمەڵناسی دەتوانن ڕادەی دەسەڵات و پایەداری هەر وڵاتێك لە وڵاتەکان دیاری بکەن کە تاکەی بڕبکات ..... یان کەی دەکەوێت !

بۆ نمونە پێت دەڵێن : ئەم وڵاتە دوای (٢٢) ساڵ هەرەس دێنێت .... چۆن دەزانن ؟ ئایا ئەستێرە ناسن ؟ نەخێر ، پێوەریان هەیە .... ئەو پێوەرانە چیە ؟ ئامرازە .... دەپرسن ئەو ئامرازە چیە ؟ وەڵام : بریتیە لە لێبڕان لە کاردا .... (حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ) ئایا دەزانی کۆمەڵناسان چی دەکەن ؟ مەبەستی سەرەکی لای ئەوان زانکۆکان و ، پێگە ڕوناکبیریەکانە .... گرنگیی لاوان دەپێون ، سەرژمێری دەکەن و پشکنین دەکەن تا بزانن لاوان حەزیان لە چیە و گرنگی بە چی دەدەن و ئامانجیان لەم ژیانەدا چیە، وە چیان دەوێ ؟ لە ئەنجامدا ڕاپۆرتەکانیان دەنووسن ، بۆ نموونە ئەم وڵاتێ سەد ساڵی دەوێ تا بە پێوە بوەستێ ، بۆچی ؟ چونکە لاوەکانیان گرنگی بە شتی بێ بەها و ئەرزش دەدەن .... بۆ نموونە : گرنگترین کار لای لاو ئەوەیە ئاشنا بێ بە کچێك یان بە پێچەوانەوە ! ئەمەش هیچ سودێکی نیە ...... (((((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ )

وە ئەگەر نا ئەم نەتەوەیە ناتوانێت هەستێتەوە ....

دەی ..... ئێستا ڕایگەیەنە ، دروشمەکەت بەرز و شەکاوە بکە و با بریتی بێت لە : ﴿من ئێستا ئامادەی گۆڕانم﴾

ئایا بڕوا دەکەن ئەو کارەی کە کۆمەڵناسان ئێستا ئەنجامی دەدەن پێش (١٤٠) ساڵ
کەری پێکراوە .... دەڵێن چۆن ؟

لە ئەندەلوس ، دەزانی چۆن ئەندەلوس ڕووخاو هەرەسی هێنا ؟ موسڵمانان لە
ئەندەلوس)دا (٨٠٠) ساڵ مانەوە .... پرتوگالیەکان وویستیان موسڵمانان دەرپەڕێنن تێیدا
. ئەی چیان کرد ؟

یەکەم : ناتوانن بچنە ناو سوپاوە ، تا دڵنیا نەبن کە هێزی موسڵمانان لاواز بووە ، ئایا
دەزانی چۆن دڵنیا دەبوون ؟ ... سیخوڕیان دەنارد لە پرتوگالەوە بۆ ئیسپانیا ... تا گرنگێتی
لاوان بپێون ، دزەیان دەکردە ناویان و بە ڕاپۆرتەکانیانەوە دەگەڕانەوە ... کۆمەڵناسانی ئەم
سەردەمەی ئێمەش ئەو کارە دەکەن ....

ئایا دڵنیا بون کە لاوان مەبەستی یەکەمن ؟ ... تکا دەکەم بەو پەڕی مەترسی و لێبڕانەوە
ئاگاداری ئەم قسەیە بن ... ئەی لاوانی ئەم نەتەوەیە ( لێبڕان لە کاردا ) ... ئەوەی کە داوا
دەکرێت ( لێبڕانە لە کاردا ) : پرتوگالیەکان دزەیان کرد و چوونە ناو لاوانەوە ، دەیان
بینی شەڕ دەکەن و دەمەقاڵێیانە .... ئەم بە ئەو دەڵێت : من لە تۆ زیاتر صەحیحی بوخاریم
لە بەرە ، دووەمیان دەڵێ: نەخێر هاوکێشەکە کیمیاییە ، من لە تۆ باشتر دەیزانم ، سێیەمیش
دەڵێ : ئایا دەتوانی بە وولاخ سواری پێشبڕکێم لە گەڵ بکەی ؟

سیخوڕەکان بە پرتوگالیەکانیان دەوت : بگەڕێنەوە ، بگەڕێنەوە ئێستا هەڵمەکوتنە
سەریان ، پاشان دەگەڕانەوە دەیان بینین پێشبڕکێیان دەکرد لە ئەدەب و شیعردا ، تا
ڕۆژێکیان سیخوڕەکان چوونە ناویانەوە بینیان گرنگی پێدانەکانیان زۆر بێ ئەرزشە ، کاتێ
سیخوڕەکان چوونە لای لاوێك بینیان دەگری ، لێیان پرسی : بۆچی دەگریت ، ئەویش
ووتی کچەکەی هاوڕێم بە جێی هێشتم ، بۆیە سیخوڕەکان گەڕانەوە بۆ لای پرتوگالیەکان
و پێیان ووتن: ئێستا دەتوان هێرش بکەنە سەریان ... ئایا دەبینیت برای ئازیزم ، دوای
(٨٠٠) ساڵ ، بە دوو مانگ یا سێ مانگ دەریان پەڕاندن ، بەچی ؟ ئایا دەزانن بە چی ؟ بە
گرنگێتی لاوانمان ....

((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ)) ( الرعد – ١١)....

﴿ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٨﴾ ) النحل /١١٨) واته : ﴿ ئێمە زوڵممان لێ نەکردن بەڵام ئەوان خۆیان زوڵمیان لە خۆیان کرد ﴾ ئازیزانم لە زۆر شتدا لێبڕاغان لە دەست داوە .... وا گومان مەبە ئەم قسەیە نادروستە ، وە من لاوان تووشی بێ ئومێدی دەکەم .... نەخێر ، من دەزانم کە ڕێژەی ڕابوون و ڕێژەی هەستانەوە لە لاواندا زۆرە .... بەڵام ڕێژەیەکی زۆریش هەیە کە دەناڵێنن ، بە گوێ پێنەدان و لێنەبڕانەوە .... دەبێ بزانیت مەترسی ئەو کارەی دەیکەیت تا چ ڕادەیەکە .

## کەی گوێ پێنەدان و خەم ساردی دەردەکەوێت ؟

برای خوێنەر .... ئەو لاوەی بە درێژایی ساڵ یاری دەکات ، و کاتێك کاتی تاقیکردنەوە دێت قۆپیە دەکات .... ئەوەیە خەم ساردی و نەبوونی لێبڕان .... ئەوەیە ئەو پەڕی مەنگی .... تۆش پێم دەڵێی : نیوەی لاوانی دەرچووی زانکۆکان لە سەر شەقامەکان دەسوڕێنەوە .... چۆن ئەم نەتەوەیە دەتوانێت سەرکەوێت ، ئەوانەی بەشدارن لە داروخانەکەدا مامۆستایانێکن لە ڕێڕەوەکاندا هەن ، غەش بە قوتابیان دەکەن .... تۆ جیلێکی بێ بەها دروست دەکەیت کە لێبڕانی تێدا نەبێت ، وە بەخێوکەرانیش یارمەتی منداڵەکانیان دەدەن لە نووسینی قۆپیەدا ، پێی دەچێتە هۆڵی تاقیکردنەوە ، وە بە من دەڵێن : ئەم نەتەوەیە سەردەکەوێ؟ چۆن لە کاتێکدا ئێمە ژیانمان بە غەش دەست پێ دەکات !؟

ئەمە نمونەیەك ، با نمونەیەکی تر بێنمەوە سەبارەت بە کەمتەرخەمی، ئافرەت لەم سەردەمەماندا ئەو پەڕی خەم و خولیای ئەوەیە چۆن پۆشاکی تەسك لە بەر بکات تا سەرنجی لاوان ڕابکێشێت... چۆن میکیاج بکات ... چۆن قژی چاك بکات .... وە ئەو لاوەی دەڕوات بۆ یانە بۆ مەشقکردنی لەش جوانی .... بۆ ئەوە نیە بەرگری لە ئیسلام بکات ، بەڵکو بۆ سەرەنج ڕاکێشانی کچانە ....

وێنای بکە لە کەناڵێکی ئاسمانیدا پەیامێکی نووسراوی تیا نووسرا بوو کە تێیدا هاتبوو : فلان کەس ، من تۆم خۆش دەوێت ... دوای کەمێك کورەکەش وەڵامی دەدایەوە ... فلان کەس منیش تۆم خۆش دەوێت ! لە دوورەوە شتانێکی زۆر زۆر دەبینیت کە ناشیاون !.... ئێمە باس لە حەلاڵ و حەرام ناکەین ... ئێمە باس لە دۆزێك دەکەین کە زۆر گرنگە ، باس لە نەتەوەیەك دەکەین کە دەمرێت .... باس لە تیاچوونی ئیسلام دەکەین ، ئەی لاوان ئایا دوای هەقە شوێن کارە هەرە خراپەکانی رۆژئاوا بکەوین و واز لە شتە باشەکانیان بێنین ، لێبڕان لە کاردا ؟

وە لەو نمونانەی سەبارەت بە کەمتەر خەمیش .... گۆرانی بێژێك لە ئاهەنگێکدا گۆرانی دەڵێت ، کچانیش سەما دەکەن .... وە هەندێ جار باڵا پۆشەکانیش !! لاوانیش ئارەزوویان دەبزوێ ... جارێکیان عومەر ﷺ بە شەقامێکدا دەچوو لاوێکی بینی بە لا موبالاتیەوە بە رێگادا دەچوو، پێی ووت : ئایا تۆ نەخۆشیت ؟ پێی ووت : نەخێر ئەی ئەمیری ئیانداران ، ئەویش ئاگاداری کردەوە و پێی ووت : حەزناکەین و رازی نین نەتەوەی محمد ﷺ ئا بەو شێوەیە برۆن بەرێوە .

وە هەروەها کچێك دەترسێ لە بەردەم هاورێکانیدا بڵێ : من یارمەتی دایکم دەیەم لە ماڵەوە ،هەموو خەمی ئەوەیە ئەو ئەنگوستیلەیەی لە کوێ بوو ؟ وە ئەو جلانەی چ مارکەیەکە ؟.... مادام هێشتا ئەوانە زاڵن بە سەر نەتەوەدا هەستانەوەی ئەو نەتەوەیە هیچ سودێکی نیە .

وە هەروەها نمونەیەکی تر لە سەر کەمتەرخەمی :کچان دەچنە ناو ( چات کردنەوە ) وتوێژی کراوەیە لە رێگای ئینتەرنێتەوە ... تا ئاشنا بن بە لاوان ، نەتەوەکەشمان لە کەناری مردن و هەرەس هێناندایە .... کوا لێبڕان لە کاردا ئەی لاوانی ئەم نەتەوەیە ؟

ئازیزانم بمبورن بەلاَم ئەمانە بە دڵنیاییەوە نمونە بێزار کەرەکانن .... بەلاَم شتانێکی زۆریش لەو جۆرە لە ناو نەتەوەکەماندا روودەدات .... بەلاَم من ناڵێم : ئەوە واقیعی هەموو لاوانە .....نەخێر ، بەڵکو رابوون لە ئارادایە .... بەلاَم هەندێ لاو پێویستیان بە کەسانێك هەیە دەستیان بگرن ، و پێیان بڵێن ، ئاوا مەکەن ....

ئازیزانی بەڕێزم .... ئیسلامـمان مەزنە ... ئیسلامـمان جوانە ... عەیب لە ئیسلامدا نیە .... بەڵکو عەیب لە خۆماندایە ....

وەرن با تەماشای ڕۆژئاوا بکەین چۆن دەبزوێت ..... ئەڵمانیا چۆن دوای جەنگ بنیاتنرایەوە ...، کێ بنیاتی نایەوە؟ یابان چۆن بنیات نرایەوە ، بە شکست خواردوویی لە جەنگەکەدا هاتە دەرەوە ؟ لوبنان کێ دوای جەنگ بنیاتی نایەوە ... چ لاوێکی لێبڕاو بنیاتی نایەوە ؟

مارگرێت تاتشەر سەرەك وەزیرانی ئینگلتەرا ، بە دەر لە هەموو شتێك لە کاتی جەنگی ووڵاتەکەی لە گەڵ ئەرجەنتین ، بە درێژایی چوار ساڵ پۆشاکی ڕەش و ماتەمی لەبەردا بوو... باسمان لەوە نیە ... ئایا ئێوە وێنای لێبڕانی دەکەن لە مامەڵەکردنی لە گەڵ کاروبارەکاندا ، تەنها لە بەر ئەوەی هەستی بە خۆی و بە گەلەکەی دەکرد و لێبڕابوو لە کاریدا .... واتە بە لێبڕانەوە تەماشای کاروبارەکان بکەن و بپێون : ئەو لە چ ئاستێکدا بوو؟ قسەکە زۆر بە خەستی ئاڕاستەی ئێوەیە ئەی لاوان ...

## با لە لێبڕانی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانەوە فێرببین

لە ڕاستیدا دەمەوێ چەند نمونەیەکتان بۆ بێنمەوە لە سەر لێبڕانی پێغەمبەری خوا ﷺ و لێبڕانی هاوەڵان ، با چاو لەوان بکەین ، لێیانەوە فێر ببین ، تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن لە سەرەتای بانگەوازیدا لە مەککە ، ئەو دەیفەرموو : (( واللهِ يا عَم لَو وَضَعُوا الشَّمْسَ فِي يَمِينِي ، وَالقَمَرَ فِي شِمالِي عَلى أنْ أَتْرُكَ هَذا الدِين مَا تَرَكْتُهُ ، حَتَّى يَظْهَرَهُ الله ، أو أَهْلِك دونه )) ( الطبري : ١/٥٤٥١– و السيرة النبوية ٢/١٠١ ) واتە : ﴿بە خوا مامەگیان ئەگەر خۆر بخەنە لای ڕاستم و مانگ بخەنە لای چەپم تا واز لەم ئاینە بێنم ، ئەوە وازی لێناهێنم ، هەتا خوای گەورە سەری دەخات و ئاشکرای دەکات ، یان بە سەربەرزی سەربەرزێك ، یان بە ژێر دەستی ژێر دەستەیەك )

.. ئێبرانت بینی ؟ ... خوای گەورە دەفەرموێ بە یەحیا ﷺ ((يَـٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَـٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَـٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ (مريم /١٢) واتە ( ئەی یەحیا تەورات بە توندی و گرنگ بگرە ، ئێمە حیکمەت و ژیریمان پێ بەخشی لە تەمەنی منداڵیدا) صبيا ) واتە بچوکی لە تەمەندا

وە تەماشای پێشەوامان ئیبراهیم ﷺ بکە کاتێ کە بتەکانی شکاند تەمەنی چەند بوو قَالُواْ سَمِعۡنَا فَتٗى يَذۡكُرُهُمۡ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبۡرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ )) ( الانبياء :٦٠) واتە : (( چەند کەسێك ووتیان : گوێمان لە لاوێك بوو باسی ئەوانی ( بتەکانی بە خراپە ) دەکرد ، پێ دەڵێن ئیبراهیم ) واتە ( فتی ) چەند ساڵە ، بە زۆری (١٦) ساڵە .

تەماشای هاوەڵانی ئەشکەوت بکە ، ئەوان بەرەو ڕووی هەموو نارەحەتیەکان دەبوونەوە خوای گەورەش لە قورئاندا دەفەرموێ (إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ) واتە ئەوان چەند لاوێك بوون ، کە لە تەمەنی (١٦-١٧ ) ساڵیدا بوون (نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَـٰهُمۡ هُدٗى ﴿١٣﴾ ) ( الكهف :١٣) واتە ﴿ بە ڕاستی ئەوانە کۆمەڵە لاوێك بوون ، باوەڕیان هێنابوو بە پەروەردگاریان ، ئێمەش زیاتر ڕێنومایمان کردن ﴾.

ئەی لاوانی ئەم نەتەوەیە باش ئاگاداربن .... پێشەوامان یەحیا نەوجەوان بوو ..... پێشەوامان ئیبراهیم لاو بوو .... هاوەڵانی ئەشکەوتیش کۆمەڵە لاوێك بوون باوەڕیان هێنابوو بە پەروەردگاریان ... واتە تەمەنەکان لە خوار بیست ساڵیەوەن .... لێبڕان پێویستە لە سەرەتای لاوێتیەوە دەست پێ بکات ...

## چل ساڵ ماوەیەکی تەواوە بۆ گۆڕانکاری نەوەیەك

خوێنەری ئازیز .... مەسەلەی ( ) زیاد لە جارێك لە قورئاندا هەیە ... پێت دەڵێ : بە لێبڕاوانەوە کار بکە .... تەماشای نەوەی ئیسرائیل بکە بە لێبڕانەوە هەڵسوکەوتیان نەکرد

کاتێ کە پێشەوامان موسا ﷺ پێی ووتن : بچنە زەویە پیرۆزەکانەوە ، (قَالُواْ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا ۖ فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ ) المائده /٢٤ ) واتە ( ووتیان ئەی موسا بەڕاستی ئێمە هەرگیز ناچینە ناو ئەو شارەوە ، تا ئەوانی تێدابن کەواتە خۆت و پەروەردگارت بڕۆن لە دژیان بجەنگن ، بێگومان ئێمە لێرە دانیشتووین )

تەماشای کەمتەرخەمی بکەن ! ئەی ئەنجامەکەی چی بوو ؟ پێیان ووترا (قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡ ۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةً ۛ)) المائده /٢٦ ) واتە ( خوا فەرمووی بە ڕاستی ئەو خاکە پیرۆزە قەدەغەکراوە لە سەریان ، بۆ ماوەی چل ساڵ ).

نەچونە فەلەستین و قودس بۆ ماوەی چل ساڵ ، بۆچی ؟ چونکە ئەوە ماوەیەکی تەواوە بۆ گۆڕانی ئەو نەوەیە ... چونکە ئەو نەتەوەیە لەو کاتەدا نەتەوەیەکی کەمتەرخەم و مەنگ بوون .... کەمتەرخەم بوون لە گەڵ خۆشیان و لە گەڵ خوای گەورەشدا.

من بانگ لە ئیمانداران دەکەم .... لێبڕاوبن ئەی موسڵمانان .... لێبڕاو بن ئەی لاوانی ئەم نەتەوەیە ... پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی ئوحوددا کاتێ دەورە درابوو فەرمووی : (( من رجل يشري لنا نفسه ) ؟ واتە (کێ لە پیاوان خۆی دەفرۆشێ پێمان ) پێنج کەس هەستانەوە لە پشتیوانەکان کە هەموویان لاو بوون ، ووتیان : ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا ، بەرگریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکردو دەجەنگان تا یەکە یەکە کوژران ، هەتا دواهەمینیان کە یەزیدی کوڕی سەکەن ﷺ بوو وەستابوو بەرگری لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد ، شەڕی کرد

... به خەستی بریندار بوو ، پاشان کۆمەڵێك لە موسڵمانان هاتن کافرەکانیان لێ دوور
...ەوە تا بە ڕوخساریدا کەوت بە سەر زەویەکەدا .
...اشاکەن چۆن پێغەمبەر ﷺ مامەڵە دەکات لە گەڵی ، لە ناو ئیماندارااندا پیاوانێك
... . کە بەڕاستی پیاوانن ! ڕوخساری یەزیدی بینی لە سەر زەوی ، پێغەمبەر ﷺ هاواری
... و فەرمووی (ڕوخساری یەزید بەرزکەنەوە لە خاکەکە ) پێغەمبەر ﷺ دانەویەوە سەر
...ی تا ڕوخساری یەزید بەرز بکاتەوە لە زەوی ، و خۆڵ لە ڕوخساری بتەکێنێ و بیخاتە
... ، پاشان دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی ( پەروەردگارا من شایەتیت بۆ دەدەم
... یەزیدی کوڕی سەکەن بە وەفا بوو پەروەردگارا من شایەتیت بۆ دەدەم من ڕازیم لە
...ی کوڕی سەکەن ) البیهقی لە ( دلائل النبوة ) ٣/٢٣٥ ) ئایا جوامێری دەبینن تیایدا

﴿ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ﴾

**﴿ لە ناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ، ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کە دابوویان بە خوا﴾**

...ی خوێنەر ... تەماشای جوامێریی پێشەوامان ئەبوبکر ﷺ بکە ، دەڵێ ﴿بەخوا
...تووم تا خەو ببینم( واتە کاتی نەبووە بۆ خەو ) وە سەهوم نەکردووە تا بێ ئاگا بم ،
... لە سەر ڕێگا و ڕێبازێکم لارنەبومەتەوە ﴾

... باشی ووتەکانی پێشەوامان (ئەبوبکر ی صدیق ) تان خوێندەوە

...اشای پێشەوامان ئەنەسی کوڕی النضر ﷺ بکە ، لە جەنگی بەدردا دوا دەکەوێت
... لە سەرفەر بوو ، ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، دواکەوتم لە جەنگی بەدر ، لە
... جەنگدا کە جەنگاین لە گەڵ موشریکەکاندا ، بەخوا ئەگەر خوای گەورە کوشتارم
... بە نسیب لە گەڵ موشریکەکاندا خوای گەورە نیشانت دەدات کە چیان لێ دەکەم ،
... جەنگی ئوحوددا کەسەکان ئاشکرا بوون ، ووتی : پەروەردگارا من داوای
...نت لێ دەکەم لەوەی کە ئەوانە کردیان (واتە موسڵمانان) وە خۆیشم بێ بەری
... لەوەیشی کە ئەوانە هێناویانە ( واتە موشریکەکان) بە خۆی و شمشێرەکەیەوە
... ، سەعدی کوڕی مەعازی پێگەیشت ، ووتی ئەی مەعاز ، ئەوە بەهەشتە ، سوێند

به خوا ئەنەس هەست بەبۆنی بەهەشت دەكات ، سەعدی كوڕی مەعاز ووتی : نەمتوانی وەكو ئەو بكەم ، بۆیە پێكرا لەو كاتەدا ، بینیمان هەشتاو ئەوەندە پێكانی پێوە بوو لە نێوان لێدانی شمشێر و ڕم و تیردا ، موشریكەكان وایان بە سەر هێنابوو خوشكەكەشی تەنها بە پەنجەیدا ناسیەوە ) .

ئەم ئایەتەی لە سەر دابەزی : (مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ )

( الاحزاب /٢٣ ) واتە ( لە ناو باوەڕدارانیدا پیاوانێك هەن ، ڕاستیان كرد لەو پەیمانەی كە دابوویان بە خوا ، ئینجا هەندێكیان نەزر و بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا ( شەهید بوو ) هەندێكیشیان چاوەڕوانن )

ئایا بینیتان ... ئەنەسی كوڕی نەزر نمونەی ئیماندارێكی ڕاستگۆیە ... ئەوە چیە ؟ هێشتا هێشتا ئەو بەڵێنەی كە ساڵێكە داوتە بە پەروەردگار لە یادتە !! برایانی ئازیزم فێربن لە قوتابخانەی ئازیزمان ﷺ و هاوەڵانی ، تا تەماشای لێبڕانیان بكەین و لێیانەوە فێر ببین ... وە هەروەها لە پیاوە ئیماندارەكانەوە .... ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ... ڕۆشت بۆ فەتحی قوستەنتینیە لە گەڵ موسڵمانانیدا كاتێ كە تەمەنی (٨٠) ساڵ بوو ، پێی ووتن : لە گەڵ خۆتان بمبەن ، پێیان ووت تۆ ناتوانیت ، حەربەكەت كەوتووە ، وتی خوای گەورە فەرمویەتی : ((ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا )) التوبە /٤١ ) واتە ( بڕۆن و دەرچن بۆ جیهاد چ سوك بن ( لەش ساغ و دەوڵەمەند و دەسەڵاتداربن) چ قورس و گران بن ( نەخۆش و هەژاربن ) .... ئایا بینیتان چۆن لێبڕانێكە ؟

وە هەروەها ( محمد الفاتح ) ئەو كەسەی كە توانی فەتحی قوستەنتینیە بكات ، ئەو شارە (٢٣ ) ساڵ بە سەركەشی مایەوە و فەتح نەكرا .... ئایا ئێمە نمونەی ، ئەو لێبڕانەمان هەیە ؟

صلاح الدین دەڵێ : چۆن خەندە بمگرێت لە كاتێكدا ( مسجد الاقصی ) دیل و ئەسیرە من شەرم دەكەم لە خوا كە بە خەندەوە بم بینێت ، براكانیشم لەوێ لە مەینەتیدان ....

ـەی لاوان لـێبڕاوبن .... لـێبڕان دەروازەیە بۆ فەتح و سەرکەوتن .... ئایا کەستان ئەو ـێبڕانەتان هەیە ؟

ئازیزانم : من دەترسم دەنگم نەگاتە کەمتەرخەمەکان ، بۆیە تکاتان لێ دەکەم ، دەستیان بگرن و یارمەتیان بدەن ، با هەوڵ بدەین فێری لـێبڕان ببین لـە گەڵ خوادا .... تا بتوانین ناخی خۆمان بگۆڕین ، ئەو کاتەش پەروەردگار بارودۆخمان لـە بارێکەوە دەگۆڕێ بۆ بارێکی تر ..... کە خۆشی بوێ و پێی ڕازی بێت ....

# ﴿برایەتی و سینەپاکی﴾

## دڵت بەچی پڕکردووە؟!

ڕقی لەگەڵێکی تربێت.. هەموو ئەم گەلانە ووشەی (نەتەوەی پێشەواماند محمد ﷺ کۆی دەکاتەوە.

شتێکە بڕواناکرێت ڕووبدات.. دڵەکان پڕبن بەرامبەر بەیەکتریں.. لەکینەو ڕق و ئومێد خواستن بە زیان پێگەیان لەبری ئەوەی پڕبێت لە ڕەحمەت و هاوکاریی کردن..

بەڵام بەداخەوە ئێمە ئەمە دەبینین.. دەبینین مانای برایەتی و سینەپاکی زۆرجار نەماوە لەناوماندا.. وورده ورده برای بەڕێزم لەگەڵتدا بەم هەنگاو هەنگاوە.. وە لەمیانی ئەوەوە.. دەمەوێ مانا جوانەکان ئاراستەی سینەت بکەم کە بریتیە لە: ئەم نەتەوەی ئێمەیە.. هیچ سوودێکی نیە کە دژایەتی یەکتر بکەین.. دەمانەوێ یەك نەتەوەبێت.. هەست بەیەکتری بکەین و گرنگی بەیەکتر بدەین.. وە بەڕاستگۆیانە یەکتریمان خۆش بوێ.. ئەمانە ماناکانی برایەتی و سینەپاکین.. واتە: پاکژکردنەوەی و خاڵی کردنەوەی لەهەموو ئەو شتانەی دوورمان دەخاتەوە لەیەکتر.

برای بەڕێزم هەندێ جار لەناو جەنجاڵی ئەم ژیانەدا براکانمان لەبیرچوەتەوە.. ئەوەیە کە نایخوازین، هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵمدا دەست پێ بکە تا برایەتی و واتاکانی لەسینەکاندا بچێنین.. لەهەموو ساتێکدا لەخۆت بپرسە: بەچی دڵت پڕکرد؟!.. هەموو قاپێك گەشە بەوە دەکات کە تیایدایە!!..

## برام... لەڕەحمەتی خواوەیە!

دەست پێ دەکەم تا باسی سەرگوزەشتەی برایەتیت بۆ بکەم بە درێژایی ژیان.. لەسەردەمی پێشەوامان محمد ﷺ دەست پێ ناکەم، بەڵکو زۆر پێش ئەو.. لەڕۆژانی پێشەوامان موساوە عليه السلام دەپرسیت: بۆچی؟ چونکە (نەوەی ئیسرائیل) لەمەڕ بابەتی

ـرایەتی)یەوە، شتێکی مەترسیداریان لەسەرایە، هۆشداربە لەگەڵم، تا بەباشی لەم مانایە تێ گەیت..

کاتێ خوای گەورە قسەی کرد لەگەڵ پێشەوامان موسا –علیه السلام– فەرموی: ذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى)(٢٤) واتە (بچۆ بۆلای فیرعەون، بێگومان ئەو ستەمکارە) سەیدمان موسا داوایەکی کرد لەپەروەردگار دوای ئەوەی کە ووتی: ﴿وَاجْعَلْ لِي وَزِيرًا مِنْ هْلِي * هَارُونَ أَخِي * اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي * وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي * كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا * وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا * إِنَّكَ كُنْتَ بِنَا بَصِيرًا﴾ طه (٢٩–٣٥).

واتە: (وە لەخزم و کەسی خۆم کەسێك بکەرە پشتیوانم، کە هاروونی برامە، تا پشتمی ی قایم و بەهێز بکەم، بیکەرە هاوبەشم لەکارەکەمدا (بانگەوازی خوایی)، بۆئەوەی زۆر ستـایشت بکەین، وە یادو زیکری زۆرت بکەین، بەڕاستی تۆ بینای بە (هەموو شتێکی) بینە).

بەڵام ئەی پێشەوامان موسا.. ئایا نازانیت بە تەنها یادی پەروەردگارت کەیت؟...نەخێر... لەگەڵ براکەمەما جوانترو ئاسانترە.. چونکە برایەتی زۆر بەهادارە، پەروەرگار دەفەرموێ (قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَامُوسَى(٣٦))واتە (بەڕاستی ئەوەی کە داوات کرد پێت درا ئەی موسا)..

تەماشای فەرمایشتی خوای گەورە بکە: (وَوَهَبْنَا لَهُ مِنْ رَحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيًّا (مريم:٥٣) واتە (وەلەبەزەیی و بەخشندەیی خۆمان بەخشیمان بەو (موسا) هارونی برای کە پێغەمبەر بوو).

ئایا گوێت لە فەرمایشتی پەروەردگارەوە بوو؟!.. خوایەگیان ئای کە ووتەیەکی بەهادارە (من رحمتنا).. کەواتە براکەم... ڕەحمەتێکە لە ڕەحمەتەکانی خوا.. ئایا هەوڵ نادەیت بەدەست هێنانی ڕەحمەتەکانی خوا؟!.. پارێزگاری برایەتی بکە!!..

## هەمویان وابوون...هەر لە دێر زەمانەوە

موسا ﷺ دەڕوات بەدەم بانگەوازەکەی خواوە بۆ ماوەی چل ڕۆژ..(نەوەی ئیسـرائیل)یش گوێرەکەیەك دەپەرستن وەك چۆن لە قورئاندا باسی چیرۆکەکە کراوە..

پێشەوامان هارون ﷺ بەجێ دێڵێ لە جێگای خۆی لای گەلەکەی.. ئەمیش نازانێ چی بکات..چونکە دووکاری لەبەردەمدا دەبێ کە هەڵێ بژێرێ:

١- ئەوەیە بەرەنگاریان بێتەوەو بەهێز بیانگێڕێتەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست، هەتا گوێرەکەکە نەپەرستن، ئەگەر وا بکات ئەوە لەوانەیە گەلەکەی ببن بە دوو تاقم: یەکەم: کۆمەڵێکیان لەگەڵ هارونا بن.. دووەم: کۆمەڵێکیشیان گوێرەکەکە بپەرستن، ئەوکاتەش دەجەنگن لەگەڵ یەکداو دووبەرەکی دەکەوێتە نێوان نەوەی ئیسرائیل..

٢- یان ئارام بگرێت تا پێشەوامان موسا دەگەڕێتەوە، چونکە ووشەی پێشەوامان موسا دەخوات و بەهێزترە لەناویاندا..بۆیە پێشەوامان هارون ﷺ پێی باش بوو چاوەڕوانی موسای برای بکات و پارێزگاری یەك ڕیزی خەڵکەکە بکات..

کاتێ موسا گەڕایەوە دەبینێ گەلەکەی گوێرەکەیەك دەپەرستن! بۆیە بە بینینی ئەو دیمەنە زۆر تووڕە بوو. سەرو ڕیشی براکەی گرت و ڕایکێشا بۆ لای خۆی و وەك چۆن قورئان هەواڵمان پێ دەدات ووتی: (قَالَ يَاهَارُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوا(٩٢)أَلاَّ تَتَّبِعَنِي أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي(٩٣)قَالَ يَبْنَؤُمَّ لاَ تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلاَ بِرَأْسِي إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي)(طه:٩٢-٩٤)واتە (موسا)ووتی:ئەی هارون، چ شتێك بەرگری لێ کردیت، کاتێ بینیت ئەمانە گومڕا بوون(لەوەی)کە شوێن من بکەون، ئایا سەرپێچی فەرمانی منت کرد، (هارون)، ووتی: ئەی کوڕی دایکم، مووی ڕیش و سەرم مەگرەو ڕای مەکێشە، بەڕاستی ترسام کە (هاتیتەوە پێم)بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە نێوان بەنی ئیسرائیلیەکانەوەو چاوەڕوانی فەرمانی منت نەکرد)

ئەوە ئیجتیهاد(هەوڵدان)ی پێشەوامان هارون ﷺ بوو، موسای برایشی ﷺ لێی وەر گرت.. نەوەی ئیسرائیل هۆکاری یەکەمین ناکۆکی بوون کە، ڕویدا لە نێوان دوو برادا!..

## دووبەرەکی بنێرەوە...سودمەند دەبێت!...

کاتێ پێغەمبەر ﷺ پەیامی خوایی بۆ ڕەوانە کرا لە مەککە... و بانگەواکەی ئاشکرا کرد لە بەردەم قوڕەیشە کافرەکاندا..دەستیان کرد بە ئازاردانی.. و خەڵکێکی زۆریش ڕوویان لە ئیسلام نەکرد..و دەرگاکانی مەککە بەڕوویدا داخرا..

یـەمبەر ﷺ بیری کردەوە بۆ کوێ بچێ؟ لـەو هۆزانەدا کێ ئیسلامی لـێ وەردەگرێ و ـیشتی دەبێ تا پەیامە خواییەکە بگەیەنێ؟.. بۆیە چوو بۆ (طائِف)..وە خۆی نیشانی هۆزەکان دەدا لـە وەرزی حەج کردندا.. بەڵام تاکە هۆزێك کە پێغەمبەر ﷺ بیری لـێ ـەکردبوویەوە کە بچێ بۆ لایان خەڵکانی شاری مەدینە بوون..هەرچەندە خاڵـەکانی خەڵکی ـ‌ـری مەدینە بوون. بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا نەچویت بۆ شاری مەدینە؟ چوکە شاری ـەینە کێشەیەکی زۆر گەورەی تێدایە.. کە جەنگێکی درێژ خایەن بوو بەرپا بوو بوو لـە ـیـ‌ن : (ئەوس)و(خەزرەج)دا.جەنگێك لـە زووەوە دەستی پێکردبوو ئەگەر دەتەوێ هۆکاری ئەو شەڕەی نێوان ئەو دوو هۆزە بزانیت.. دەی گوێ بگرە: ( ئەوس) و (خەزرەج) ـەر لـە کۆنەوە دانیشتووی شاری مەدینە(یەسرب)بوون. بە خۆشی و ئاسایشی دەژیان، خۆشەویستی و سۆزو هاوژیانی لـە نێوانیاندا هەبوو. بەڵام جولـەکەکان کۆچیان کرد بۆ ـەوشارە.. کاتێ چوونە ئەوێ بیستیان کەمینەن لـە نێوان خەڵکە ڕەسەنەکەی ئەوشارەدا.. ـەبەر ئەوەی ویستیان لاوازیان بکەن و کۆنترۆڵی شارەکە بکەن!..چیان کرد؟

دەستیان کرد بە دەنگۆ دروستکردن و هەواڵی درۆ و کێشەیان لـە نێوان دوو هۆزەکەدا دروست دەکرد بۆیە دوو هۆزەکە پەرتەوازە بوون و ئەمانیش هەرچەندە کەم ـ‌ون بەڵام بە بەهێزیی مانەوە!.. تێکۆشان تا ململانی لـە نێوان ئەو دوو هۆزەدا بەردەوام بێ ـ ئاگرەکە دانەمرکێتەوە!)

**چیان کرد بۆ بەدیهاتنی ئەم کارەیان؟**

دەستیان کرد بە فرۆشتنی چەك...بە ئەوسیەکان...و بە خەزرەجیەکان..خۆیان کرد بە دوو ـ‌قم. تاقمێکیان لـەگەڵ ئەملاو تاقمێکیان لـەگەڵ ئەولا..بەڵام خۆیان لـە ژێرەوە کۆك بوون!..

ناکۆکیەکەش بەردەوام بوو.. ئەوسیەکان و خەزرەجیەکان لـەیەکتریان دەداو یەکتریان دەکوشت ڕق و کینەیەکی قوڵ لـە نێوان دوو هۆزەکەدا دروست بوو..خوێن و تۆڵـە ـەندنەوە کەوتە نێوانیانەوە بەڵام ئەم هەموو شتە لـەپای چی؟... ئاشکرایە ئێستا زۆر بەباشی هۆکارەکە دەرك پێ دەکەین، لـەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ شاری مەدینەی لـە فیکری خۆیدا دەرکردبوو.. وە ڕادەی ئەوکێشانەی دەزانی کە لـەو شارەدا دەگوزەرێ لـە ئەنجامی ناکۆکی ـ نیشتوانەکەیدا!..

## ئومێد دەرکەوت!..

جارێکیان..کاتێ پێغەمبەرﷺ بەسەر هۆزەکاندا دەگەڕا تا بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام بینی شەش لاو دانیشتوون.لێیان نزیك بوویەوە و لێ ی پرسین: ئێوە لە کوێوە هاتون؟ وو‌تیان: لە مەدینەوە، لە هۆزی خەزرەج.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دادەنیشن تاقسەتان لەگەڵ بکەم؟ ووتیان: بێگومان..یەکێ لە سیفەتە دێرینەکانی عەرەب: باش گوێگرتنە لە قسەکەر..وە وازلێ هێنانی هەتا هەموو قسەکانی تەواو دەکات هەر چۆنێ بێت.. بۆیە پێغەمبە ﷺ نمایشی ئیسلامی بۆ کردن.. و لە ئەنجامدا ئەو شەش لاوە موسڵمان بوون!... ووتیان: دەچینەوە بۆ شارەکەی خۆمان و بۆ ساڵی ئایندە چەنێکمان لە تواناداا هەبێت لە خەڵکی بانگەوازی دەکەین بۆ ئیسلام و دەیانهێنین بۆ لات.

وەك چۆن بەڵێنیان دابوو بۆ ساڵی ئایندە گەڕانەوە، ئەم جارە ژمارەیان دوانزەکەس بوو. بەلاّم ئەوەی چاوەڕوان نەکراو بوو!.. نۆکەسیان لە هۆزی (خەزرەج) بوون و سیانیشیان لە هۆزی (ئەوس).. پێغەمبەر ﷺ بەوە دڵی خۆش بوو!.. چونکە ئومێد دەرکەوت!.. مادام چەند کەسێك لە هۆزی (ئەوس) لە ئاسایشدان، مانای ئەوەیە خێر بەرێوەیە!.. وە خەڵکی شاری مەدینە خەڵکێکی ڕاستگۆن و لەناکۆکیەکەیاندا زاڵ دەبن بەسەر خۆیاندا..

گومانەکەی پێغەمبەری ئازیز ڕاست دەرچوو.. بۆ ساڵی ئایندە گەڕانەوە ژمارەیان حەفتاو سێ پیاو و دوو ئافرەت بوون. نیوەیان لە هۆزی (ئەوس)بوون و نیوەشیان لە هۆزی (خەزرەج).. بۆیە ئیتر کۆچ کردن بۆ شاری مەدینە کارێکی ئەستەم نەبوو..

## وَلاَ تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاً

بۆ کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە مانگی چواردە هەڵهات، شارەکە بوو بە شاری (المدینە المنورە)واتە شاری پرشنگدار، ئیسلام و خۆش ویستنی دڵی پشتیوانانی کۆکردەوە.. پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نێوان کۆچکەران و پشتیوانانەوە لە یەکەمین کارێکدا کە ئەنجامیدا دوای چوونی بۆ ناو شارەکە..

وە ماناکانی برایەتی لە دڵی خەڵکانی مەدینەدا چێنرا.. و جەنگ و دووبەرەکی و ڕق نەما..

ئەو هەموو سەرپێچیانە بۆکوێ چوون؟ برایەتی بەهێز جێگەی ئەوانەی گرتەوە، تەنانەت حولـەکەکان هەولـیاندا سەر لـەنوێ نێوانیان تێك بدەنەوە، بەلاَم نەیانتوانی ئەوە بکەن، کاتێ پێغەمبەر ﷺ پێش سەرهەلـدانی کێشەکە فەرمووی (دعوها فإنها منتنة) (مسلم: ٦٥٦٢، ترمذي: ٣٣١٥)

واتە (وازی لێ بێنن، ئەوە بۆ درو بۆگەنە)

ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شتە بۆن ناخۆشە گەنیوە چیە؟ ئەوە فیتنەی دووبەرەکی یە!..

ئایەتانێکی زۆر دابەزین کە بانگەشە دەکات بۆ برایەتی و باس لـە سینەپاکی دەکات.. گوێ لـەم ئایەتانە بگرە.. دەلـێی بانگ لـە ئێمە دەکات: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا﴾آل عمران: ١٠٣

واتە: (هەمووتان دەست بگرن بەهۆی پەیوەستیتان بەخواوە (کە قورئانە)، وە پەرتەوازە مەبن. وە بیر لـە ڕۆزیانی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە، لـەکاتێکدا کە ئێوە دوژمنی یەکتربوون، ئەوە خوا ئولفەتی خستە نێوان دلـەکانتانەوە، ئیتر بوون بە برای یەکتر بە هۆی ئەو چاکەی خواوە، وە ئێوە لـەسەر لـێواری چالـێ بوون لـە ئاگر، بەلاَم خوا ڕزگاری کردن لـێی).

وە ئایەتی دووەم دابەزی کە باس لـە خەلـکانی بەهەشت و سیفاتەکانیان دەکات: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾الحجر:٤٧.

واتە: (ئەوەی لـەدلـیاندا بووبێ دامان ڕنی لـەکینەو ڕق (دەربارەی یەکتری)، برای یەکترن و بەرامبەر یەکترن لـەسەر کورسی).

وە ئایەتی سێ یەم دابەزی تا جەخت بکات لـەسەر: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾سورة الحجرات: ١٥.

واتە: (بێگومان تەنها باوەڕداران بران، کەواتە لـەنێوان دوو براتاندا (ئاژاوە هەبوو) ئاشتەوایی بکەن)، وە لـەدابەزینی یەکەم ئایەتدا پێغەمبەر ﷺ دەبینیت دەفەرموێ: (المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا) واتە (ئیماندار وەك خانوو وان یەکتری دەبەستنەوە) وە پەنجەکانی دەستی دەکرد بە ناویەکدا (بخاري: ٦٠٦٢ـ ٥ مسلـم/ ٦٢٨٢).

وه هەروەها دەفەرموێ: (مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكى عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمّى). (بخارى: ٦٠١١، مسلم: ٦٥٢٩)
واتە: نموونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی و بەزەیی و سۆزیان بۆیەکتری وەکو یەك جەستەوان، ئەگەر ئەندامێکی لەش ئازاری هەبوو هەموو ئەندامەکانی تری لەش شەو نخونی دەکێشن و تا دەیانگرێ.

وه هاوەڵان گوێیان دەگرت: فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی!. برایەتی و خۆشەویستی لەنێوانیاندا زیادی دەکرد.. ئێمەش بەهەمان شێوە گوێ دەگرین و قورئان دەخوێنین.. پێویستە برایەتی و خۆشەویستی لەنێوانماندا زیاد بکات..

دوای ئەوە ئەو ئایەتە دابەزی کە وەسفی ئیمانداران دەکات لە مەدینە: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيْمَانِ وَلاَ تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾الحشر: ١٠

واتە: (ئەوانەش لەپاش ئەمانەوە هاتون دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان خۆش ببە لێمان، وە لەو برایانەشمان (خۆش ببە) کە پێشمان کەوتون لە ئیمان هێناندا، وە هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەر تۆی دڵسۆزی میهرەبانی).. ئەم دووعایە بکە.. و بڵێ: (پەروەردگارا هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمەوە بەرامبەر ئەوانەی باوەڕیان هەیە..)

وێنای بکە ئەگەر ڕق و کینە لەدڵتدا هەبێ بەرامبەر ملیۆنێك کەس! ئەوانە موسڵمانن.. خوشك و براو ئازیزی تۆن.. چۆن شتی وا دەبێ؟!.. کارەکە زۆر مەترسیدارە. دەمانەوێ ئەمە لە دڵەکانماندا جێگیر بکەین و دەست بکەین بە گۆڕان ئەگەر ڕق و کینەمان بینی لەدڵەکانماندا.. وە ئەگەر نا، چۆن خوای گەورە ئەم نەتەوەیە ڕێزدار دەکات؟!

## یا اللّه!... پێغەمبەران و شەهیدانیش

گوێ لەم فەرموودە قەشەنگە بگرە.. مژدەیەکی گەشاوەت پێ دەدا: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (إن حول العرش يوم القيامة منابر من نور، عليها قوم لباسهم نور، ووجوههم نور، ليسوا بأنبياء ولا شهداء، يغبطهم الأنبياء والشهداء) فقال الصحابة: من هؤلاء يار سول

الله؟ قال: (هم المتحابون في الله تعالى، تحابوا في الله على غير أنساب بينهم، ولا أموال يتعاطونها) واته: بەدەوری عەرشدا لەڕۆژی قیامەتدا، مینبەرانێك هەن لە ڕووناكی، كەسانێكی تێدایە پۆشاكەكانیان نورە، و ڕوخساریان نورە، نە پێغەمبەرانن و شەهیدانن) هاوەڵان ووتیان: ئەوانە كێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (ئەوانەن كە لەبەر خاتری خوا یەكتریان خۆش دەوێ، لەپێناوی خوای گەورەدا یەكتریان خۆش دەوێ و نەژاد لەنێوانیاندا نیە، و پارەو سامان بەیەكتری نادەن).. فەرموو لەگەڵ ئەم فەرموودە قودسیەدا كە دەفەرموێ: (إن الله عزوجل يقول يوم القيامة: إين المتحابّون بجلالي؟ اليوم أظلّهم في ظلّي يوم لا ظلّ إلاّ ظلّي) مسلم:٦٤٤٤

واتە: (خوای پەروەردگار لەڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێ: كوان ئەوانەی لەبەر خاتری گەورەیی من یەكتریان خۆش دەویست؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە سێبەری خۆمەوە، كە ڕۆژێكە هیچ سێبەرێ نیە بێجگە لە سێبەرەكەی من).

ئای كە جوانە!.. شتێكی جوانە خوای گەورە بەوە مژدەمان پێ دەدات.. چەندە ئاواتە خوازم كە ئەو وشانە هۆكارێك بێت تا خێر و خۆشەویستی بچێنین لە دڵی ئەم نەتەوەیەدا.. ئێمە ماوینەتەوە بۆ یەكتری.. ئێمە ماوینەتەوە.. زەوی و خاكمان هی خۆمانە.. پێویستە ڕق و كینە دابماڵین لە دڵەكانماندا تا پێكەوە بژین.. چونكە ئێمە یەك نەتەوەین..

ئەمە لە چوار چێوەی گەلاندا.. ئەی ئەبێ یەك گەل پێكەوە چۆن بن؟!.. دو دراوسێ ببینین ناكۆكن.. یان دوو برا.. ئایا شتی وا دەگونجێ؟! ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا﴾الحجر:٤٧.

واتە: (هەر ڕق و كینەیەك لەدڵیانا بوبێ دەرمان هێناوە، ئەوانە برای یەكترن).

## خۆشەویستی خۆی واجب كردووە.. و تۆش دانیشتویت!!

پێغەمبەر ﷺ ژمارەیەكی زۆر فەرمایشتی هەیە.. تا شتەكان یان ئەو كەسانە دوور بخاتەوە كە فیتە دروست دەكەن و ڕق و كینە هەڵ دەگیرسێنن لە دڵەكاندا..

پێغەمبەر ﷺ لەناخەوە ئەم نەتەوەیە تۆکمە دەکات.. و هەموو ئەو داوانە دەکاتەوە کە بۆسە بێو موسوڵمانان دروست دەکەن.. لە فەرموودەیەی قودسیدا ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ بۆ هاوەڵانی دەگێڕێتەوە:

(یقول الله تبارك وتعالى: وجبت محبّتى للمتحابّين فيّ، ووجبْتُ محبّتي للمتباذلين فيّ ووجبتُ محبّتي للمتناصرين فيّ ووجبتُ محبّتي للمتجالسين في) واتە: (خوای پەروەرگار دەفەرموێ: خۆشەویستی خۆم واجب کردووە لەسەر ئەو کەسانەی لەبەر خاتری من یەکتریان خۆش دەوێ، وە خۆشەویستی خۆم واجب کردووە لەسەر ئەوکەسانەی پارەو سامانیان لەپێناوی مندا دەبەخشن، وە خۆشەویستی خۆمم واجب کردووە لەسەر ئەوکەسانەی من سەردەخەن، وە خۆشەویستی خۆم واجب کردووە لەسەر ئەوکەسانەی لەبەر خاتری من دانیشتوون).

ئایا بینیت؟!.. ئایا دەکرێ خۆشەویستی خوا بەدەست بێنیت و لەشوێنی خۆشت دانیشتبیت؟.. بەڵێ: چۆن؟.. لەدڵی خۆتدا بڵێ: خۆشەویستی هەموو نەتەوەی محمد ﷺ لەدڵما دەچێنم!!

ئەم هەموو جوانی و گەشاوەیە چیە لەم ئاینەدا!.. ئیتر کێ دوای ئەمە دەڵێت: ئەم ئاینە هانی توندوتیژی و رق و.. ئەدات؟!..

## هەموو گوناهەکانت بسڕەوە.. بە سڵاوکردن

خۆشویستن لەبەر خواو برایەتی لەبەر خوا.. تەنها پاداشتی قیامەتت بۆ مسۆگەر ناکات.. بەڵکو هۆکارێکە بۆ زیادبوونی ئیمان!.. چۆن؟!.. گوێ لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بگرە: (إن أوسط عرى الإيمان أن تحب في الله.. وتبغض في الله) (الأمام أحمد في (مسنده: ٢٨٧/٤) واتە: (بەهێزترین پەیوەندی ئیمانی ئەوەیە لە بەر خوا خۆشت بوێ.. و لەبەر خوا ڕقت لێ بێ) عرى: کۆی (عروە)یە.. واتە کاتێ پەیمانێ دەبەستیت و توندوتۆڵی دەکەیت.. پێویستە لەبەرخوا ئیماندارانت خۆش بوێ و لەبەر خوا ڕقت لە دووڕوان و کافران بێت.. ئەوە توندترین و بەهێزترین پەیوەندیە کە چەسپاو و جێگیربێت لە ئیمانەکەتدا!!..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ما من مسلم يلتقيان، فيتصافحان إلاّ غفرلهما قبل أن يفترقا) (ابوداود:٥٢١٢، والترمذي: ٢٧٢٧) واتە: (دوو موسوڵمان هەرگیز بەیەك ناگەن کاتێ کە تەوقە دەکەن ئیللا خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت پێش ئەوەی لەیەکتر جیاببنەوە)

یا الله!.. دەرگای خێر چەند زۆرە لەم ئاینە مەزنەدا!.. لە هەموو گوناهەکانت خۆش ئەبێ، تەنها بە سلاوکردن و تەوقەکردن لەگەڵ برا موسوڵمانەکەتدا!.. سوپاس بۆ خوا لەسەر نیعمەتی ئیسلام.

## چیم هەیە نیوەی بۆ تۆ!..

هاوەڵان گوێگری هەموو ئەم شتانە بوون، و فێربوون چۆن یەکتریان خۆش بوێت.. بۆیە نمونەو ئاکاری جوانیان لەم بوارەدا پێشکەش کردووە لەسەر ئاستی ئەوپەڕی خۆشویستنی برایەتی..

تەماشای ئەم دوو هاوەڵە بکە: پێشەوامان (عبدالرحمان ی کوڕی عەوف) و پێشەوامان سەعدی کوڕی ڕەبیع ﷺ ...عبدالرحمن لە کۆچکەران و سەعدیش لە پشتیوانان بوو.. سەعد چی کرد کاتێ پێغەمبەر ﷺ برایەتی چاند لەنێوانیاندا؟.. عبدالرحمن ی برد بۆ ماڵی خۆیان.. و پێی وت: ئەی برام.. خانووەکەم بەش دەکەم لەنێوان هەردووکمانداو.. ماڵەکەم دەکەم بە دوو بەشەوە.. نیوەی بۆ تۆو نیوەی بۆمن.. وە هەروەها جل و بەرگەکانم!... هەر شتێکم هەیە نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بۆمن!..

ئای لەو هەڵوێستە چەندە جواندا!.. هەرچەندە هەریەکەیان خەڵکی شارێکی جیاوازبوون.. یەکتریان نەدەناسی.. هیچ خزمایەتی و بەرژەوەندیەك لەنێوانیاندا نەبوو!..

بەڵام لە مامۆستاکەیانەوە ﷺ فێر بوو بوون.. گوێیان لە ئایەت و فەرموودەکان دەگرت و جێبەجێ یان دەکرد، ئایا دەزانی جیاوازی نێوانمان و نێوان ئەو هاوەڵانە چیە؟ ئەوان گوێیان لە ئایەت و فەرموودەکان دەگرت بۆ جێبەجێ کردن و ڕاپەڕاندن.. ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (بەڕاستی ئیمانداران برای یەکترن)، برای یەکتر؟.. فەرمانتە پەروەردگارم (برای یەکتر)!.. ئیتر مەسەلەکە کۆتایی دەهات! پەروەردگارمان دەفەرموێ: برای یەکتر!..

لەوەدا موناقەشە لەگەڵ پەروەردگارمان دەکەین؟ پەروەردگار دەفەرموێ: ئێوە برای یەکترن.

## ئەو برای منە.. نەك تۆ

جەنگی بەدری گەورە ڕوویدا.. پێشەوامان (مەصعەبی کوڕی عومەیر) لەگەڵ موسوڵماناندا دەرچوو.. براکەیشی کافر بوو لەگەڵ کافراندا دەرچوو بۆ جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان.. برا پیاوەڕەکەی بەدیل گیرا..

پێشەوامان مەصعەب ڕەت بوو بەبەردەم دیل کراوەکاندا.. یەکێ لە پشتیوانان براکەی ئەمی بەستبوویەوە.. کاتێ هاوەڵە پشتیوانەکە مەصعەبی بینی بەویادا ڕەت بوو، بەستنەوەی براکەیی شل کردەوە..

دەبێ وەڵامی پێشەوامان مصعەب چی بووبێت؟! تەماشای ئەو هاوەڵە بکە کە فێربووە و لەوانەکە تێگەشتووە... پێشەوامان مەصعەب بە پشتیوانەکەی ووت: توند بیبەستەوە. چونکە دایکێکی دەوڵەمەندی هەیە لەبری ئەو پارەیەکی زۆرت دەداتێ!!

بەند کراوەکە ووتی: ئەوەیە وەسیەتەکەت بۆ من؟ مەصعەب ﷺ ووتی: ئەو برای منە نەك تۆ، ئەو برای منە!.. برای ئاین و عەقیدە!.. دەیزانی کە پەیوەندی برایەتی مەزنترە لە پەیوەندی نەژادو خوێن.. ئایا ئەمە لە دڵتدا جێگیر بوو؟.. ئایا ئازار دەکێشی بە مەینەتیەکانی موسوڵمانان چونکە ئەوانە برای تۆن؟.. ئایا دەڵێیت: ماڵی من وێران بوو.. کوڕی من بریندار بووەو چوەتە نەخۆشخانە، خوشکی منە دەست درێژی کراوەتە سەر.. دڵم شەقی برد لەتاو براکەم و کوڕم و باوکم و خوشکم؟.. لەپێشەوامان مەصعەبەوە فێربە.. و هەست بکە کە هەموو موسڵمانێ لەسەر ئەم زەویەدا برای تۆیە.. ئەو برایەت کە دەست بەرداری نابیت..

## برایەتی.. هەتا چوونە ناو گۆڕ

دەبینیت پێغەمبەر ﷺ ڕێز لەو خۆشەویستیە دەگرێ و گرنگی پێ دەدات و گرنگی بەبەردەوام بونی دەدات لەجەنگی ئوحوددا.. دوای سەرکەوتنێکی بێ هاوتا موسوڵمانان لە

جەنگەکەدا شکست دێنن و ٧٠ شەهید لەدەست دەدەن، لەوانە حەمزەی مامی پێغەمبەر ﷺ و برا شیریەکەی.. نوێنەری ئەو حەفتایە بوو.. برینەکە سەختەو ئیمانداران سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ یان کرد.. چوار لای پێغەمبەر شکاو سەری موبارەکیشی شکا.. تەمەنیشی ئێستا (٥٧)ساڵە.. هەموان ماندوو خەفەتبارو بریندارن..

لەنێو ئەم هەموو نارەحەتیەدا.. پێویستە موسوڵمانان گۆڕ بۆ شەهیدەکانیان هەڵکەنن.. پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە هەردوو کەس پێکەوە کار بکەن.. پیاوەکان دەستیان کرد بە کارو لەوپەڕی ماندو بوونیشدان.. ئازاریش هەناوی گرتوون بەهۆی لەدەست دانی (٧٠) برای ئازیزیان..

لەمیانی کارکردندا.. لەپڕ.. پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی کرد کە دەست هەڵگرن لە ئەسپەردەکردن!..

بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ دەمانەوێ ئەسپەردەکردنەکە تەواوکەین چونکە ماندوو بووین.. و دەمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ شوێنی خۆمان.. بۆچی واز لە ئەسپەردەکردنەکە بێنین؟

فەرمووی: (لەنێو کوژراواندا بگەڕێن بەدوای دوو پیاودا: (عمرو بن الجموح) و (عبدالله بن حرام).. بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟

(بەیەکەوە بیاننێژن چونکە لە دنیادا یەکتریان خۆش دەویست: (إبن سعد في (الطبقات الكبرى) (٣/١٠٦).

صلاوات لەسەرت ئەی پێغەمبەری خوا !.. زانیبووی کە ئەو ڕۆحانەی بەیەکتر ئاشنابوون.. و ئەو دڵانەی کۆبوونەتەوە لەسەر پەرستش و خۆشەویستی خوا هیچ شتێ جیایان ناکاتەوە.. هەتتا مردنیش!.. لە قیامەتیشدا ئەو دوو هاوەڵە خۆشەویستە پێکەوە لەیەك گۆڕدا زیندوو دەکرێنەوە!..

## ڕەوشت و ئاکاری ئیسلام.. نەك جاهیلیەت!

لەوانەیە پرسیارێ بێت بە خەیاڵتدا: ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هاوەڵان –ڕەزای خوایان لێ بێت– دەرهەق بەیەکتر هەڵەیان نەکردووە؟ نەخێر..لەوانەیە جیاواز بووبن لە بیروبۆچووندا..بۆ نموونە:وەکو چاو وێنای جیاواز دەبینێت، وە چاویش هەیە لە نزیکەوە

ناتوانیّ شت ببینیّت.. وه چاویش هه‌یه له دووره‌وه ناتوانیّ شت ببینیّ.. وه هه‌روه‌ها ژیریه‌کانیش جیاوازی ڕوو ده‌دات له‌نیّوانیاندا.. به‌لاّم ناگه‌نه ئاست جیاوازی دلّه‌کان..

به‌لّیّ.. ئه‌شیّ جیاوازبم له‌گه‌لّت له‌م بیروبۆچوونه یان ئه‌وی تریاندا.. به‌لاّم له‌پیّناوی خوای گه‌وره‌دا تۆم خۆش ده‌ویّ.. سینه‌پاکیمان وون نه‌کردووه به‌رامبه‌رت.. چونکه تۆ برامیت.. وه ناتوانم بیّجگه له میهرو خۆشه‌ویستی له‌دلّمدا هیچ شتیّ هه‌لّگرم به‌رامبه‌رت..

له‌م ڕوانگه‌یه‌وه‌و به‌پیّی جیاوازی بیروبۆچوونه‌کان هه‌ندیّ جیاوازیی له‌سه‌رده‌می هاوه‌لاّندا هه‌بووه.. له‌و جیاوازیانه پیّشه‌وامان ئه‌بو زه‌ڕی غیفاریی ﷺ جاریّکیان له‌گه‌لّ پیّشه‌وامان بیلالدا ﷺ قسه ده‌که‌ویّته نیّوانیان.. ئه‌بو زه‌ڕ ڕقی لیّ ی هه‌لّده‌ستیّ و پیّی ده‌لّیّ: ئه‌ی کوڕه ڕه‌شه‌که!.. پیّشه‌وامان بیلال ئه‌و قسه‌یه ئازاری داو شکاتی حالّی خۆی لای پیّغه‌مبه‌ر ﷺ کرد.. پیّغه‌مبه‌ریش ﷺ ئه‌بو زه‌ڕی بانگ کردو فه‌رمووی: ( أعيّرته بأمه؟! إنك امرؤ فيك جاهلية)! مسلم: ٤٢٨٤.

واته: (ئایا قسه‌ت به دایکی ووت: تۆ که‌سیّکیت هیّشتا بیروبۆچونی جاهیلیه‌ت(نه‌زانین)ت تیّدا ماوه).

جاهیلیه‌ت ئه‌ی پیّغه‌مبه‌ری خوا؟؟.. بیّگومان.. چونکه هیچ کاتیّ ئه‌وه له ئاکاری ئیسلام نیه.. له‌گه‌لّ ئه‌وه‌شدا.. لاوان ده‌بینیت له‌کاتی یاریه‌کانی تۆپی پیّدا شتی وا ده‌لّیّن که نه‌وتراوه!.. وه تانه‌و ته‌شه‌ر له‌یه‌کتری ده‌ده‌ن که هه‌رگیز له ئیسلامدا شتی وا نیه.. ئه‌ی ڕات چۆنه به‌رامبه‌ر به گه‌لیّك تانه‌و ته‌شه‌ر له گه‌لیّك ده‌دات به‌چاك و خراپیه‌وه؟!

پیّشه‌وامان أبو زه‌ر ده‌رکی به‌وه کرد که به‌هه‌لّه‌داچووه، مه‌ینه‌تی له‌وه‌دا نیه که هه‌لّه بکه‌یت، چونکه ئیّمه مرۆڤین و سروشتی مرۆڤیش وا دروست کراوه که به‌ده‌ر نیه له هه‌لّه‌کردن، له‌به‌ر ئه‌وه پیّویسته له‌سه‌رمان به‌خیّرایی بچینه‌وه به هه‌لّه‌که‌مانداو چاکی بکه‌ینه‌وه..

پیّشه‌وامان (ئه‌بو زه‌ڕ) چوو بۆلای پیّشه‌وامان بیلال ، ڕوومه‌تی خۆی خسته سه‌ر خۆلّه‌که‌و به بیلالی ووت: سویّندت ده‌ده‌م که قاچت بخه‌یته سه‌ر ڕوومه‌تم تا ئه‌وه‌ی له دلّمدایه لای به‌رم! پیّش ساتانیّك تانه‌ت سوکایه‌تیت به دایکی کرد ئه‌ی ئه‌بوزه‌ڕ!.. نه‌خیّر.. به‌هه‌لّه‌داچوو به خیّرایی پاشگه‌زده‌بیّته‌وه له هه‌لّه‌که‌ی.. وه هه‌رشتیّ بیّت ده‌یکات له

پـێناوی ئەوەی کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی لەخۆی ڕازیی بکات.. ڕێز لەبراکەی دەگرێ و نایشکێنێ..

دەی.. لەوانەوە فێربە!.. و وەکو خێرایی ئەوان خێراکە!.. لەبەر ئەوە.. کاتێ پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ڕەزامەندبوو لێ یان..

## سوپاس بۆ خوا.. ئەوان بران

لەسەردەمی پێشەوامان عومەری کوڕی خەتاب ﷺ خەلیفەی دووەم وویستی سیفاتی برایەتی و خۆشەویستی لەدڵی هاوەڵاندا تاقی بکاتەوە.. چونکە سوربوو لەسەر ئەوەی ئەو بەروبومە ببینێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ چاندبووی.. وە هاوەڵان وەك ئەوساتەوان کە پێغەمبەر ﷺ لەناویاندابوو..

جارێکیان (١٠٠) درهەمی یا بە خزمەتکارەکەی و پێ ی ووت: بچۆ بۆلای ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرڕاح و پێ ی بڵێ: ئەمیری ئیمانداران ئەم پارەیەی بۆ ناردویت، چی لێ دەکەیت بیکە، عومەر ﷺ بەخزمەتکارەکەی ووت: کەمێك خۆت دواخە لەلای بزانە چی دەکات بە پارەکە..

خزمەتکارەکەش فەرمایشتەکەی بەجێ هێنا.. بینی ئەبو عوبەیدە هەموو پارەکەی بەخشی (٥٠) درهەم بۆ ئەو.. (١٠٠) بۆ ئەوی تر.. ئەیبەخشی و ئەیبەخشی تا پارەکەی هەمووی تەواوبووا!!

خزمەتکارەکە گەڕایەوە بۆلای ئەمیری ئیمانداران و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە! عومەریش ﷺ ووتی: ئەم پارەیەش بگرەو ببە بۆ (مەعازی کوڕی جەبەل ﷺ) .. ئەویش پارەکەی بردوو ڕۆشت.. مەعازیش هەروەکو ئەبو عوبەیدە هەموو پارەکەی بەخشی.. پاشان برێ پارەی تری دا بەخزمەتکارەکەی و ووتی : ببە بۆ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ ئەویش بردی بۆی .. سەعیدش وەکو ئەوان هەموو پارەکەی بەخشی..

عومەری کوڕی خەتابیش ﷺ پێکەنی و ووتی: سوپاس بۆخوا.. ئەوانە بران.. پشت و پەنای یەکترن.. سوپاس بۆخوا.. نەتەوەکەمان وەك خۆی ماوەتەوە.. پشت و پەنای

یەکترن.. مادام دڵیان یەکە لەسەر خۆشویستنی خواو برایەتی بۆ خوا ئەوە هیچ شتیّ نیە جێگای نیگەرانی بێت.

## ئازیزە لەلام ئەی ئەبو محمد

دوای مردنی پێشەوامان عومەر ﷺ فیتنەی گەورە هات بەسەر ئوممەتی ئیسلامیدا.. بەڵام تەنانەت ئەو فیتنەیەش لەوانەیە بۆیە ڕوویدابێت تاوەکو پەروەردگارمان فێرمان بکات چۆن لەناڕەحەتیەکاندا خۆڕاگربین.

بەڵێ.. نەکەی فیتنە ڕوویدات.. بەڵام تەماشایانکە چۆن فیتنەیان کەرت و پەرت کردووەو لەناویان بردووە.. چۆن دڵیان پەیوەست بووە بەیەکەوە؟

دوو سوپای موسوڵمان دەوەستن بەرامبەر بەیەکتری: سوپایەك پێشەوامان عەلی کوڕی ئەبوطالب ﷺ ی تیایەو سوپایەکیش زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ ی تیایە..

پێشەوامان عەلی یەت بۆلای پێشەوامان زوبەیر پێی دەڵێ: ئایا بیرت دێتەوە ئەی زوبەیر کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ پێی ووتیت: ئایا عەلیت خۆش دەویّ ئەی زوبەیر تۆش ووتت: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.. فەرمووی : دەی شەڕی لەگەڵدا دەکەیت و تۆش زاڵمیت.. زوبەیری کوڕی عەوام موچوڕکەیەکی پیادا هات و ووتی: بەخوا لەبیرم چوو بوویەوە.. وەڵلاهی برای خۆم ناجەنگم لەگەڵتدا! پێشەوامان زوبەیر گەڕایەوەو بڕیاریدا لەجەنگەکەش بگەڕێتەوە و بێتەوە.. و لەهەڵەکەی خۆی پاشگەز بوویەوە..

بەڵام جولەکەکان کوشتیان تا فیتنەکە بەردەوام و بڵێسەداربێت لەنێوان موسوڵمانانندا بەتەواوی وەك چۆن لەنێوان ئەوس و خەزرەج دا ڕوویدا.. فیتنەکە هەڵگیرسایەوە: کیّ زوبەیری کوشت.. حەواری پێغەمبەری خوا؟ سەرلەنویّ فیتنە هەڵگیرسایەوەو شەڕ دەستی پیّ کرد لە سوپاکەی پێشەوامان زوبەیر، طَلحَه ی کوڕی عەبدوڵلاشی تێدابوو.. طَلحَه ش کوژرا.. پێشەوامان عەلی هەڵی گرت و باوەشی پێداکردو بەسەریەوە گریاو دەیوت: خۆزگایە بیست ساڵ پێش ئێستا من بمردمایە.. ئازیزیت لەلام ئەی (ئەبو محمد) چەندە نیگەرانم لەناو خوێنی خۆتدا بەو شێوەیە دەتبینم! دەخوازم لەخوا کە من و تۆ ئەی طَلحَه

بەر ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەوین: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾الحجر:١٥

واتە: (لامانبرد لەسینەیاندا هەموو رِق و کینەیەك، ئەوانە برای یەکترن و برای یەکترن لەسەر کورسی).

ئای چەند ووتانێکی گەشاوەیە! رەزای خواتان لێ بێت ئەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا.. خوای گەورە ئێمەو ئێوەش بخاتە بەهەشتی بەرینەوە.

## برامانن.. جەور و ستەمیان کرد بەرامبەرمان

تەماشای راستگۆیی برایەتیەکەیان بکە.. ئەمەش کاتێ هاوەڵانی پێشەوامان هاتن بۆلای (عەلی) و پرسیاری ئەو سوپایەیان لێ کرد کە دەجەنگن لەگەڵیدا، ووتیان: ئایا ئەوان کافرن! ووتی: نەخێر.. ووتیان: ئایا دوو روون ووتی: نەخێر.. ووتیان: ئەی ئەوانە چین؟ ووتی: برامانن.. و جەورو ستەمیانکرد بەرامبەرمان.

ئایا بینیت برایەتیان چۆن بووە.. پەیوەندی برایانەیان چۆن چۆنی بووە؟

بەڵام ئەگەرئێمە بین.. ئەوکاتە چی روودەدات؟ بەڵام ئەگەر هەموومان بریارماندا کە جیاوازی لەبیروبۆچوونی من و براکەمدا هەیە.. وە لەوانەیە هەر بمێنێ.. خۆشم دەوێت چونکە برامە.. وە ناتوانم دەستبەرداری ببم..

## برام... تۆ خەیری دنیاو ئاخیرەتی

ئەگەر بزانیت برایەتی چەندە خێر و چاکە دەرژێنێ بەسەرتدا.. لەدیناو لە قیامەتدا.. هەرگیز رارا نەدەبوویت لەبەستنی پردی برایەتی لەگەڵ هەموو موسوڵمانێکی ئەم سەرزەمینەدا. بۆ ئەوەی ئەمەش بزانیت.. گوێ لەم فەرموودە جوانانە بگرە.. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ (من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة الآخرة، ومن ستر على مسلم ستره الله في الدنيا والآخرة، والله في عون العبد ماكان العبد في عون أخيه) (الترمذي: ١٤٢٥).

واته: (ئەوەی نارەحەتیەك لەسەر موسوڵمانێك لابەرێت لەنارەحەتیەكانی دنیا، خوای گەورەش لەقیامەتدا نارەحەتیەكی لەسەر لادەبات، وە ئەوەشی موسوڵمانێك داپۆشراو و پارێزراو بكات خوای گەورەش لە دنیاو قیامەتا داپۆشراو و پارێزراوی دەكات، وە بێگومان خوای گەورە پشت و پەنای بەندەیەكە ئەگەر ئەو بەندەیە پشت و پەنای براكەی بێت)،

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (لا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث ليال، يلتقيان فيعرض هذا ويعرض هذا، وخيرهما الذي يبدأ بالسلام) (البخاري ٦٠٧٧، – و مسلم:٦٤٧٨) ... واتە: (ڕەوا نیە بۆ موسوڵمان كە واز لە براكەی بهێنێت لەسەروو سێ ڕۆژەوە كەبەیەك دەگەن، ئەم ڕوو دەكات بەملاوە و ئەویش ڕوودەكات بەولاوە، چاكترینیان ئەوكەسەیە كە دەست پێشخەری دەكات بە سڵاو).

وە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ (تفتح أبواب الجنة يوم الأثنين و يوم الخميس، فيغفر لكل عبد لايشرك بالله شيئاً، إلاّ رجل كانت بينه وبين أخيه شحناء، فيقال: انظروا هذين حتى يصطلحا، أنظروا هذين حتى يصطلحا، أنظروا هذين حتى يصطلحاً) (مسلم: ٦٤٩٠).

واتە: (ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە دەرگاكانی بەهەشت دەكرێتەوە خوا لەهەموو بەندەیەك خۆش دەبێت كە هاوەڵی بۆ دانەنابێت، تەنها پیاوێك نەبێت كە لەنێوان خۆی و براكەیدا ناكۆكی هەبێت، دەوترێت: تەماشای ئەو دوانەكەن تا ئاشت دەبنەوە.. تەماشای ئەو دوانەكەن تا ئاشت دەبنەوە.. تەماشای ئەو دوانەكەن تا ئاشت دەبنەوە((واتە چاوەڕوان بن)) ).

تەماشاكە برای خۆم!.. دەرگاكانی بەهەشت دەكرێتەوە.. تەنها: بۆكەسێ كە سینەی پاك بێت بەرامبەر براكانی!..

شەوی پیرۆز (لیلە القدر) بەرزكرایەوە.. پێغەمبەریش ﷺ كاتەكەیی لەبیرچوویەوە.. لەئەنجامی ناكۆكی نێوان دوو موسوڵمان.. ئایا دەبێ چەندە خێر و چاكەمان لێ بگێڕێتەوە بەهۆی ناكۆكیەكانمانەوە.. ئەی دەبێ چەندە خێر و چاكەمان دەستگیر ببێت ئەگەر یەكترمان خۆش بوێت؟!

## چۆن دڵت شەو دەکاتەوە؟

دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ کاتێ دانیشتبوو لە مزگەوتا فەرمووی: (یدخل علیکم الآن رجل من أهل الجنة) (الإمام أحمد في (مسنده) (٣/٣٣١)، واتە: (ئێستا پیاوێك یەتە ژوورەوە بۆلاتان بەهەشتیە).. پیاوێك هاتە ژوورەوە زۆربەی هاوەڵان نەیانناسی.. پاشان بۆ ڕۆژی دوایی و دوایتریش.. تێبینیەکە لەمەدایە (ئێستا پیاوێك یەتە ژوورەوە بۆلاتان بەهەشتیە)، ئەو پیاوە خۆی یەت!..

هاوەڵان سوربوون لەسەر زیادکردنی هەموو سیفەت و کارێکی چاك بۆخۆیان کە نزیکیان بکاتەوە لەبەهەشتەوە.. بۆیە پێشەوامان عبداللە ی کوڕی عومەر ﷺ چوو بۆلای و پێی ووت: برای خۆم ئایا میوان رادەگریت؟ عەرەبیش ئەوە یەکێك بوو لە ئاکارە جوانەکانیان کە ئیسلامیش جەختی لەسەر دەکات، پیاو میوانداری پیاوی دەکرد وەك میوانێك لای خۆی دەیهێشتەوە بۆ ماوەی سێ شەو، وە لێ ی نەئەپرسی ئیشت چی یەو بۆچی هاتویت.. ئەگەر سێ ڕۆژەکە تەواو بوایە ئینجا لێ ی ئەپرسی.. چونکە ئەو سێ ڕۆژە هەقی میوانداری تیادا دراوە..

عبداللە ی کوڕی عومەریش ﷺ سێ شەو لە ماڵی ئەو پیاوەدا مایەوە، بینی پەرستشەکان و سوننەتەکانی کە من و.. پیاوێکی ئاساییە.. فەرزەکان و کەمێك لە سوننەتەکان ئەنجام دەدات..

ئایا چی گەیاندبێتیە ئەو پلەیەی کە بەهەشتی بێت وە لەدنیادا مژدەی ئەوەی پێدراوە؟ عبداللە ﷺ لێ ی پرسی: ئەو کارە چی یە تۆ دەیکەیت هەتا پێغەمبەر ﷺ بفەرموێت: کە تۆ بەهەشتیت؟!..

پیاوەکە ووتی: لە دڵمدا هیچ ڕق و کینەیەك بەرامبەر هیچ موسوڵمانێك نیە. بەڵێ ئەمەیە سینەپاکی بەرامبەر براکانت.. هەموو شەوێ پێش نوستن پیادا چونەوەی دڵت بکە.. نەکەی بخەویت هەتا دڵت پڕنەبێت لە خۆشەویستی و سۆز بەرامبەر هەموو براکانت..

## وەرە.. بالەیەکتر خۆش بین

کاتێ دەتەوێ ڕق و کینە لەسینەتا لابەریت.. و دانیشیت لەگەڵ براکەتدا تا دڵی خۆتان بەتەواوی پاك بکەنەوە.. وەرە لەگەڵم باوینەیەکی گەشاوەت نیشان بدەم لەنیازپاکی و دڵپاکی: پیاوێك بە (إبن السماك) –رحمه الله– ی ووت: سبەینێ وەرە با لۆمەی یەکتر بکەین.. ووتی: نا.. بەڵکو بڵێ: سبەینێ وەرە.. بالەیەکتر خۆش بین!

ئای ئەوە چۆن دەروون ڕوون و دڵانێ ساف و گەشاوەن؟ خۆزگە ئێمەش وەکو ئەوان دەبوین ...گوێ لەم هاوەڵە بەڕێزە بگرە کە دەڵێ: حەفتا بەهانە بۆ براکەت بهێنەرەوە، ئەگەر هیچ عوزرو بەهانەیەکت دەست نەکەوت دەی بڵێ: من بەهەڵەداچووە. لەوانەیە عوزرێکی هەبێ! ڕات چۆنە دەست بکەین بە فێربوونی ئەو هەست ناسکە لەبیروبۆچوونماندا؟

ئایا جوانتر نیە لە ڕق و بوغزو کینەو جیاوازی؟!.. بێگومان جوانترە!!..

## دەستی بگرە.. و بچۆرە بەهەشتەوە!

دوای ئەم گەشتە خۆشەمان بە مێرگی برایەتیدا.. پێم باش بوو پێش کۆتایی دوو گوڵی جوانت بۆ لێبکەمەوە.. یەکەمیان دەتخاتە بەهەشتەوە.. دووەمیشیان ئاگرت لێ دوور دەخاتەوە! ئەو دوو گوڵەش لەباخ و مێرگی برایەتیدایە..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (يأتي عبدان بين يدي لله يوم القيامة، فيقول أحدهما: يارب خذ لي مظلمتي من أخي، فيقول الله عزوجل للظالم: إعط أخاك مظلمته، فيقول الآخر: يارب فنيت حسناتي، فيقول الله تعالى: فنيت حسنات أخيك، فيقول الآخر، فليأخذ من سيئاتي فتطرح عليه، فيقول الله عزوجل: هل لك في خير من ذلك؟ فيقول المظلوم: وما ذاك يارب؟ فيقول الرب: ارفع رأسك.. فيرفع رأسه فيرى قصراً من أجمل مايكون، فيقول: لمن هذا يارب؟ لنبي هذا؟ أم لشهيد؟ فيقول الله عزوجل: بل هو لك! فيقول: كيف يارب؟ فيقول الله تبارك وتعالى: بعفوك من أخيك! فيقول: عفوت يارب.. عفوتُ يارب!..فيقول الله عزوجل خذ بيد أخيك فادخلا الجنة) (الحاكم: ٤/٥٧٦).

واتە: (دوو بەندە دێنە بەردەستی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا، یەکێکیان دەڵێت: هەقی خۆمم پێ بدەرەوە لەبراکەم، خوای گەورەش بە زاڵمەکە دەڵێ: هەقی براکەت

بەرەوە، ئەویش دەڵێ: چاکەکانم نەمان، خوای گەورەش دەفەرموێ: چاکەی براکەشت نەما، ئەوی تریان دەڵێ: با خراپەکانم بدرێ بەسەر ئەودا، خوای گەورە دەفەرموێ: ئایا لەم خێردارترو باشترت دەوێ؟ زوڵم لێکراوەکە دەڵێ: ئەوە چیە پەروەردگارا؟ خوای گەورەش دەفەرموێ: سەرت بەرزکەرەوە..کاتێ سەری بەرز دەکاتەوە کۆشکێك دەبینێ بەجوانترین شێوە، دەڵێ: ئەمە بۆ کێ ئەی پەروەردگار؟ بۆ پێغەمبەرە ئەمە؟ یان بۆ شەهیدە؟ خوای گەورەش دەفەرموێ: بەڵکو ئەمە بۆتۆیە! ئەویش دەڵێ: چۆن ئەی پەروەردگار؟ خوای گەورەش دەفەرموێ: بە لێبوردنت لە براکەت.. ئەویش دەڵێ: لە براکەم بووورام ئەی پەروەردگار، لەبراکەم بورام.. خوای گەورەش دەفەرموێ: دەستی براکەت بگرەو پێکەوە برۆنە بەهەشتەوە!).

الله أكبر! ڕەحمەت و بەزەیی خوا چەندە مەزنە!.. برایەتیش لەبەر خاتری خوا چەندە جوانە!.. پێم بڵێ ئایا بەهۆی کاریگەریەوە بە فرمێسك ڕشتنێك وازدێنیت.. یان هەموو ڕق و کینەیەك لە دڵتدا لادەبەیت؟

ئەمەش گوڵی دووەمیانە.. ئایا لە بیرت چوو؟.. برای بەڕێزم من هەرگیز لەبیرم ناچێ بۆ تۆ! .. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (من رد عن عرض أخيه ، رد الله عن وجهه النار يوم القيامة) (الترمذي/١٩٣١).

واتە: (ئەوەی بەرگری لەبرایەکی بکات، خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا نایەڵێ ئاگری بەربکەوێت).

واتە کەسێ ڕازی نابێت غەیبەتی براکەی بکرێت لەبەردەمیدا.. وە بەشداری ناکات لەوەدا.. وە بەرگری لێ دەکات و دەیپارێزێ.. خوای گەورەش لەقیامەتا ئاگری لێ دوور دەخاتەوە..

ئەم ئاینە گەشاوەیە چیە!! ئایا سیستەمێکت بینیوە پارێزگاری کۆمەڵگاکان بکات تا بە ئاسودەیی و سەلامەتی و خۆشەویستی بژین، وەك ئەم ئاینەی ئێمە کە خوازیاری ئەوەیە.

سوێندت ئەیدەم بەخوا.. لەئێستاوە هەستە.. هەموو ڕق و کینە و بوغزێك کە لەدڵتایە بەرامبەر براکانت لایبەرە، تاوەکو خوای گەورە کەتەماشای دڵەکانمان دەکات بە پوختی و پاکی ببینێت.. و لێمان خۆش بێت.. و سەرکەوتن بگەڕێنێتەوە بۆ ئەم نەتەوەیە (وَلاَ تَنَازَعُوا

فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ) (الأنفال: ٤٦) واته: (دوبەرەکی مەکەن چونکە شکست دێنن و هێزتان دەڕواو نامێنێ)، واتە هێزتان و هۆکارەکانی سەرکەوتنتان.

خوای گەورە تەماشای دڵی هاوەڵانی جەنگی بەدری کرد.. بینی هەموویان وەك دڵی یەك پیاو وان.. فەرمووی (اعملوا ماشئتم فقد غفرت لكم)! واتە: چیتان دەوێ بیکەن.. بێگومان خوای گەورە لەهەمووتان خۆش بوو.

دەی با بێین بەیەك دڵ.. و یەك ڕۆح.. و یەك نەتەوە.. بەڵکو خوای گەورە حاڵمان بگۆڕێت.. و سەلەنوێ سەربەرزیمان و عیززەتمان بۆ بگەڕێنێتەوە.

# ﴿ چاکەکاریی ﴾

## ئاکارێکە ڕۆژئاوا پسپۆڕە تیایدا.. و ئێمەش شکستمان هێناوە تیایدا

چاکەکاریی ئاکارێکە لەناو موسوڵماندا نەماوەو ئەوانەشی پابەندن پێیەوە کە من، بەداخەوە زۆربەشیان دیندار نین.. ئاکارێکە ڕۆژئاوا پسپۆڕو سەرکەوتووە تیایدا.. و ئێمەش شکستمان هێناوە تیایدا..

یاسای خوایی تایبەت بە گۆڕان تەنها پەیوەست نیە بە موسڵمانەوە، بەڵکو پەیوەستە بە هەموو جیهانەوە.. خوای گەورە نەیفەرمووە (لا یغیرالله ما بمسلم) بەڵکو فەرموویەتی ﴿إِنَّ اللّٰهَ لاَ یُغَیِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى یُغَیِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾الرعد:١١.

واتە: (بێگومان خوای گەورە هیچ گەل و میللەتێك ناگۆڕێت تا ئەوان خۆیان گۆڕان بەسەر خۆیاندا نەهێنن).. ئەبێ ئەو سیفاتانە چین کە پێویستە تیاماندا هەبێت تا بتوانین ناخی خۆمان بگۆڕین؟ وە ئەو سیفەتانە چین کە پێویستە وازیان لێ بێنین؟

## چاکەکاریی بریتیە لە شارەزایی

چاکەکاریی زۆر بەسانایی واتە شارەزایی.. کە یەکێکە لە ئاکارە جوانەکانی ئیسلام.. ئەو ئاکارەیە کە تیاماندا نیە.. بەڵێ لەکاردا شارەزاییمان نییە..

برایانم گۆڕان دوگمەیەك نیە پەنجەی پیا بنێین و سیفەتەکانمان بگۆڕێت.. نەخێر، بەڵکو بریتیە لە کردارێکی قورس.. کردارێك پێویستی بە هەوڵ و ماندوبوون هەیە، تا دەرك بەوە بکەین ئەو شتە چیە کە پێویستە لە خۆماندا بیگۆڕین.. ئەگەر گۆڕان کردارێکی نارەحەتیش بێت، بێگومان ئەستەم و مەحاڵ نیە.. بەڵگەش لەسەر ئەمە، نەتەوەی ئێمە کە چەندین سەدە

ژیانیان دەگوزەران لە شوانکارەییدا، دوای تەنها (٢٣) ساڵ لە بانگەواز بۆلای خوا، بوو بە نەتەوەیەك كە پێشەنگی نەتەوەكان دەكەن..

## نەتەوەی ئێمە ڕۆژ لەدای ڕۆژ خاو دەبێتەوە؟!..

ئازیزە بەڕێزەكانم.. بەداخەوە هەموو ئەدایەكمان بۆ كارەكانمان لە ئێستاماندا دەچێتە ژێر بەندی: تەنها قسەكردنەوە.. وە تەنها ئەداكردن بەبێ پسپۆڕی و شارەزایی.. شتێك كە بەرەو ئاشتی و سەقامگیری دەمانبات.. لەوانە بۆ نموونە: سەعیكردنی قوتابی، پیشەسازی پیشەوەران، و وانە ووتنەوەی مامۆستا، ڕۆژێك لەشتە وشكە بووەكان دەبینین.. سەیر تریش لەوە خەڵكانێك دەبینیت كە ئەوانە ناودەبات بە: (زیرەكی و ڕەوان بێژی) لەكاتێكدا شارەزایی و پسپۆڕی سونەتی ژیانی موسوڵمانانە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملاً أن يتقنه) (الطبراني (المعجم الأوسط) الحديث: ٩٠١....واتە: بێگومان خوای گەورە كەسێكی لەئێوە خۆش دەوێ ئەگەر كارێكی ئەنجامدا بەباشی ئەنجامی بدات.

## ئایا حەزناكەیت خوای گەورە خۆشی بوێیت؟ دەی بەچاكی كارەكەت بكە، خوا خۆشی دەوێیت

ڕۆژئاوا ئەم دروشمەیان كردووە بە بنەما بۆ خۆیان و پیادەیانكردووە، لەبەر ئەوە گەشەیان كردووەو پێشكەوتوون.. چونكە سەركردایەتی پەیوەستدارە بە یاساو سیستەمەوە..

نەتەوەی ئێمە ڕۆژ بەڕۆژ لاواز دەبێت و خاو دەبێتەوە.. دەبینیت ڕێژەی بەتاڵە زیاترە لە ڕێژەی كارگەران لەوڵاتانی ئێمە... بۆچی؟؟ هۆكارەكەشی وازلێهێنان و ناپسپۆڕی و نەشارەزاییە.

پێویستە كارەكەت بە چاكی ئەنجام بدەیت.. ئەگەر ویستت وڵاتەكەت پێشكەوێت و ببوژێتەوەو گەشە بكات... ئەوە كەسێكی چاكەكاربە.

## ۆشاییەکی گەورە لەنێوان ئێمەو ڕۆژئاوادا هەیە

ـەولاّتە عەرەبیەکاندا ئامارێك ئەنجامدرا سەبارەت بە ژمارەی سەعاتەکانی کار...گومان
ـەبێت ژمارەکە چەند بێت؟ بڕواناکەیت! چونکە بێگومان جێگای باوەڕ نیە!! لەنێوان تەنها
۱۰ بۆ ۱۳) خولەك لەڕۆژێکدا وەك ڕێژەیەکی کارکردن بۆ یەك کەس.. وێنای بکە
ـەندێ کەس دابەزیوە بۆ ڕێژەی (٥) خولەك.. بەلاّم خۆرئاوا لە (۸) سەعاتەوە بۆ (۱۰)
سەعاتە.. لەڕاستیدا بۆشاییەکی گەورەیە..

## کۆمەڵێ ئایەت و دەلالەت لەبارەی چاکەکاریەوە

پەروەردگار دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنْ
ـفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾النحل:۹۰
ـاتە: بێگومان خوای گەورە فەرمانتان پێ دەکات بەدادپەروەری و چاکەکاری و چاکە
ـەگەڵ خزماناو قەدەغەی دەکات لەسەرتان، داوێن پیسی و خراپەو دەست درێژی،
ـۆژگاریتان دەکات بۆئەوەی لەیادتان بێت.

ـحسان)ی لەپلەی دووەمدا داناوە دوای دادپەوەری.. وێنای گرنگیەکەی بکە لای خوای
گەورە.. دووەمین سیفەتە کە خوای گەورە فەرمانمان پیادا دەدات ڕاستەوخۆ دوای
ـدگەری کە ئەویش چاکەکاریە.. با تەماشای ووشی (يأمر) بکەین، بەڵێ.. بێگومان خوای
گەورە فەرمانمان پێ دەکات بە چاکەکاریی..

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنْ
ـنَّاسِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾آل عمران: ۱۳٤....واتە: (ئەوانەی ماڵ دەبەخشن (لەڕێی
خوادا) لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوەو دەبوورن لەخەڵکی،
خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت).

بێگومان چاکەکاری دەڕواتە هەموو شتەکانەوە، لەئاکاردا، لەپەرستندا، لەکاردا.. ﴿إِنَّ
ـرَحْمَةَ اللّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾الأعراف: ٥٦...واتە (بێگومان ڕەحمەتی خوای گەورە
نزیکە لە چاکەکارانەوە)

وێنای بکە تەنها کەسێکی چاکەکار بیت دەبیتە نزیك و خۆشەویستی خوای گەورە..

## ئاه!!.. بەچاكەكاریی دەبیتە خۆشەویستی پەروەردگار

لەگەڵمدا ڕابمێنە لەم ئایەتانە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾التوبة:١٢٠.....واتە (خوای گەورە پاداشتی چاكەكاران ون ناكات)

﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لاَ نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلاً﴾الكهف:٣٠.....واتە: (ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو كردەوەی چاك دەكەن، بەڕاستی ئێمە پاداشتی ئەوانەی كردەوەی چاك دەكەن زایەی ناكەین و ونی ناكەین).

﴿إِنَّ رَحْمَةَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنْ الْمُحْسِنِينَ﴾.. واتە:(بێگومان ڕەحمەت و بەزەیی خو نزیكە لە چاكەكارانەوە) .

خوێنەری ئازیز ئایا دەسكەوتەكانی چاكەكاریت بینی؟؟ بەچاكەكاریەكەت دەبیتە خۆشەویستی خوا، و پارێزراو لای خوا، وە هەروەها لەژێر چاودێری خوادادەبیت..

سبحان الله چاكەكار هەست بە چاودێری پەروەردگار دەكات.. ئای چەندە هەستێكی مەزنە كە شایستەی چاكەكارە.

وە گرنگتریش لەوە ڕەحمەتی خوا نزیك دەبێتەوە لێی.. نەخێر، تەنها ئەوەش نا، بەڵكو تەماشای فەرمایشتی خوای گەورە بكە ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ یونس:٢٦....واتە: (بۆئەوانەی چاكەیان كردووە، پاداشتی چاكتر (بەهەشت) و زیاتریان هەیە (كەبینینی خوایە).

خوای گەورە كردەوەكانمان نافەوتێنێ بەڵكو پاداشتمان دەداتەوە لەسەری.. و بەزیاتریش. زۆرێك لە زانایان تەفسیری (زِيَادَةٌ) بەبینینی خوای پەروەردگار مانای دەكەن..

یا الله!... بینینی پەروەردگار... ئایا دەتوانی وێنای بكەیت.. بێگومان تۆ پەروەردگاری گەردوون دەبینیت.. دروستكەری هەموو شتێك؟.. برای خوێنەر.. دەی چاكەكار بە لە هەموو شتێكی بچووك و گەورەدا تاوەكو بیتە خاوەنی هەموو ئەو شتانە.. وە خوای گەورە میهرەبانترینی میهرەبانانە..

ئازیزانی بەڕێزم... لەگەڵ هەموو ئەمانەدا قوتابیەك دەبینیت پێت دەڵێ: دەمەوێ سەعی بكەم تا سەركەتن مسۆگەر بكەم... ئەمە باشە.. پەیوەندی بە دروستكاریی و لێبڕان هەیە لە

ژیانی هەریەکەماندا.. ئەگەر قۆپیەت کرد لە تاقیکردنەوەدا، ئەوەیە سیفاتی لێ نەبڕان، و سیفاتی ناپسپۆڕی و نەشارەزایی... بەڵام پێویستە لە سەعیکردندا چاك بیت... وە موسڵمان دەتوانێ سەرکەوتوو بێت... وە سەرکەوتوو نابیت تا بەچاکی سەعی نەکەیت و کۆشش نەکەیت.. ئازیزانم... ئەم قسانە زۆر بە لێبڕاوانەو گرنگیەوە وەربگرن. قوتابیانی بەڕێز: باسەکە بریتی نیە لە نیشانەیەك کە دەمەوێ لە مادەیەکدا بەدەستی بێنم، بەڵکو باسەکە بریتیە لەوەی کە ئەم نەتەوەیە دەیەوێ گەشە بکات لە سەر بنەمای سەرکەوتنت و پسپۆڕیت لەکاردا..

## متمانە لەبەرهەمەکانماندا نەماوە!!

چاکەکاری بریتیە لە زانست، و کارگێری، و ئاراستەکردن، و ڕێکخستن.. وشتانێکی زۆر کە پێویستە تیاتا هەبێت تا ببیتە کەسێکی چاکەکار.. لە وڵاتانی ئێمە چەندین جۆر شت بەرهەم دەهێنرێت؟ کاتێ دەچیتە سۆپەرمارکێتێکەوە و شتێك دەبینیت لەسەری نوسراوە دروستکراوە لە (وڵاتێکی بیانی)، چاوت دەنوقێنی و هەڵی دەگریت، بێگومان لەوڵاتێکی عەرەبیدا دروست نەکراوە... بۆچی چونکە بەرهەم و کاڵاکانمان و تواناکانمان متمانەیان لەدەست داوە... لەپێناوی ئەوەدا (اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ)خوازیاری ئەوەین بەرهەمێك ببینین لەسەری نوسرابێت،،پیشەسازی ناوخۆییە، و بەچاکی دروستکراوە،، ئەمڕۆ چاکەکاری لە پیشەکەتدا پێویستە.. بەباشی و چاکی کارەکەت ئەنجام بدەیت، ئەمڕۆ بەداخەوە ووشەی: بلیمەت، شارەزا، پسپۆڕ لە نێوانماندا زۆر بڵاوە.. پێت دەڵێ: ئەو بلیمەت و شارەزایە و پێویستی بە(کەتەلۆك)نیە تا بزانێت چۆن ئیش بە مەکینەکە بکات، نەخێر، ئەوە تێگەشتنی هەڵەیە.. گەنجانمان دەیانەوێت ببنە کەسێکی بلیمەت..

برایانم...چاکەکاربن..بلیمەتی ئەگەر بەمانا زیرەکیەکەیدا بێت ئەوە قبوڵ کراوە.. بەڵام ئەگەر بەمانای نەشارەزاییەکەیدا بێت ئەوە عەیبە تیاماندا، لەبەر ئەوە پێویستە فێر بین، و سەرکەوتوو بین و کارەکانمان باش ڕاپەڕێنین.. تاوەکو نەتەوەکەشمان ببوژێنینەوە.

## سەرکەوتن...بەشێکە لە پەرستشەکان بۆ خوا

وێنای بکەن.. قسەم لەگەڵ لاوێکدا کرد، قسەیەکی کرد بە ڕاستی زۆر سەرسامی کردم، ووتی: سوپاس بۆ خوا.. ڕۆژئاوا پێشکەوتووە لە بواری پیشەسازی تەکنەلۆژیادا، و پێشکەوتووە لە پیشەسازی ئامێرەکاندا تا بەکاریان بهێنین، و ئێمەش یەکلایی ببینەوە بۆ پەرستش و نوێژکردن.. منیش سەرم سوڕماو لێم پرسی: بەڕاستی تۆ وات پێ باشەو بەو شێوەیە بیر دەکەیتەوە؟ ووتی: بەڵێ، خوا ئێمەی دروستکردووە تاوەکو بیپەرستین!! منیش پێم ووت: یەکێك لە پەرستشەکانی ئێمە سەرکەوتوویە، پێویستە سەرکەوتوو بین تا ببینە نموونەو پێشەنگ بۆ گەل و نەتەوەکانی تر (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ)ال عمران/١١٠...واتە:( ئێوە باشترینی نەتەوەکانن کە هەڵبژێراون بۆ خەڵکی)

## بۆچی تاقی ناکەیتەوە

تەماشای ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکە کە هەموو شتێکی تیادا کۆ بووەتەوە(ان الله كتب الإحسان على كل شيء) (أبو داود:٢٨١٥–والترمذي:١٤٠٩)واتە (بێگومان خوای گەورە چاکەکاری بەمەرج داناوە لەسەر هەموو شتێك)

ئەمە مانای چیە؟ مانای ئەوەیە تۆ فەرمانت پێ دراوە کە چاکەکار بیت لە هەموو شتێکدا، و چاکەکاری لە هەموو شتێکی گەورەو بچوکدا..بۆ نمونە ئەگەر لە خەو هەستایت ئایا بە چاکیی سلاّو لە دایك و باوکت دەکەیت؟ ئایا کاتێ بەیانی زوو هەڵ دەستیت و هەموو کارەکانت بەچاکی و بەباشی ئەنجام دەدەیت؟(الاحسان على كل شيء )وێنای (كل شيء)بکە.. کاتێ دەخوێنیت ئایا بەچاکی دەخوێنیت؟ کاتێ وانە بە قوتابیەکان دەڵێیتەوە پێویستە بەباشی وانەکەت ئامادە کردبێت؟ کاتێ دەچیتە سەر کارەکەت، ئایا ئەو کارەی کە پێت سپێردروە بەباشی ئەنجامی دەدەیت..

سوێندت ئەیەم.. ئایا تۆ لەو کەسانەی کارەکانیان لە فەرمانگە بەباشی ئەنجام دەدەن... ئایا دەتوانیت بۆ ماوەی هەفتەیەك بەو شێوەیە بیت؟ بۆچی تاقی ناکەیتەوە؟ تاقیکەرەوە بۆ ماوەی یەك ڕۆژ، ئەوکاتە دەبینیت هەموو ژیانت ژێرەو ژوور بوەتەوە.

## چاکەکاریی لەگەڵ گیانداراندا

تەماشاکە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ نموونەمان بۆ دێنێتەوە سەبارەت بە چاکە کاری دەفەرموێ(فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة،وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة، وليحد أحدكم وليرح ذبيحته)(مسلم:٥٠٢٨)واتە:(ئەگەر کوشتنتان ئەنجامدا بەچاکی ئەنجامی بدەن، وە ئەگەر گیانداریێکتان سەربڕی بەچاکی سەری ببڕن، و با چەقۆی سەربڕینەکە تیژبێت و سەر بڕاوەکە ئازاری زۆری پێ نەگات)

الله، یا رسول الله!.. بەزەیت بە گیاندارانیشدا دێتەوە.. ئەی بۆچی نموونە بە (القتل ) دێنیتەوە؟ چونکە کوشتن مانای کۆتایهاتنی ژیانە، مانای وەستانی کارە، کاتێ تۆ کوشتنێ ئەنجام دەدەیت یان گیانداریێ سەردەبڕیت، پێویستە چاکەکاربیت تیایدا، وەچۆن مامەڵە لەگەڵ زیندویەکدا دەکەیت کە بەزەویدا ڕاکشاوە؟ ئایا پێویستی بە چاکە کاری زیاتر نیە لەلایەن تۆوە؟

یا سبحان الله... خوای گەورە فێری چاکەکاریمان دەکات تەنانەت لە کاتی سەربڕین و کوشتندا، ئایا کاتی ئەوەمان نەهاتووە زۆرێك لە سیفاتەکانمان بگۆڕین و چاکەکاربین لەگەڵ خۆماندا پێش ئەوەی چاکەکاربین لەگەڵ کەسانی تردا؟!

## بەشێوەیە خوا پەرستبە، وابزانە کە دەیبینیت

(الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ)(السجدة:٧)...واتە (زاتێکە هەموو شتێکی بە جوانترین شێوە دروستکردووە، جا مرۆڤی لە سەرەتاوە لە قوڕ دروستکرد) (وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ)(القصص/٧٧)واتە(چاکەکار بە، وەك چۆن خوای گەورە چاکەکارە لەگەڵت) کاتێ جوبەرئیل هات بۆلای پێشەوامان محمد ﷺ پرسیاری لێکرد تا کاروباری ئاینەکەمان فێر بکات، پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد باسی (الاحسان)چاکەکاریم بۆ بکە، پێغەمبەری خوا-ص- فەرموی(أن تعبد الله كأنك تراه، فإن لن تكن تراه فإنه يراك)(البخاری/٥٠ مسلم ٩٧)... واتە (پێویستە بە شێوەیەك خوا بپەرستی کەوا بزانیت دەیبینیت، ئەگەر نەیشی بینی، ئەوتۆ دەبینێت) کەمترین(إحسان)ئەوەیە وا هەست بکەیت کە خوای گەورە لە هەموو ساتێکدا دەتبینێت،

## فێری چۆنیەتی ئەدەبی پەیڤین ببە

تەنانەت لەبارەی پەیڤین و ووتو وێژەوە پێغەمبەرمان ﷺ هەواڵی پێداوین کە پێویست بە چاکی ئەنجام بدرێت(وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ)النحل:٢٥(...واتە: بەباشترین چاکترین شێوە ووتوێژیان لەگەڵدا بکەن. تەنانەت لەکاتی شەڕە قسەشدا چاکەکاری بەکاربهێنرێت.. چاکەکاری لەکاتی جیاوازیدا...با لە ئەدەب دادەرو مامۆستامانەوە پێشەوامان محمد ﷺ فێربین چۆن ئەدەبی پەیڤینی بەکارهێناوە... جارێکیان(عوتبە ی کوڕی(رەبیعە)–ابو وەلید– هات بۆ لا پێغەمبەری خوا و مشتومڕو قسە کەوتە نێوانیانەوە: (عوتبە) درێژەی دا بە قسەکانی وزیادەڕەوی کرد بە سەر پیغەمبەر ﷺ دا پێغەمبەریش ﷺ فەرموی(أفرغت یا أبالولید) واتە: ئایا قسەکانت تەواو بوو ئەی ئەبو وەلید.. ووتی: بەڵێ تەواو بووم، فەرموی ﷺ (فهل تسمعني الان)واتە (ئایا ئێستا گوێش لەمن دەگریت) (السیوطي في (الدر المنثور)( ٥/٣٨٥) تەماشای ئەو داناییە بکە. تەماشای ئەو ئاینەمان بکە تەنانەت لە ووتووێژیشمان لەگەڵ خەڵکیدا ڕێنماییمان دەکات.. ئەی ئەوەی دەتەوێت فێری هونەری ووتوێژکردن ببیت.. دەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وە فێربەو چاکەکاربە تەنانەت لە پەیڤین و ووتووێژیشدا..

## هاوڕێتە...لەهەرکوێ قسە بکەیت و بجوڵێیتەوە

خوای پەروەردگار کاتێ باسی باوك و دایك دەکات لە قورئانی پیرۆزدا بەچاکەکاری دەبیێوێت(وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا) (الاسراء:٢٣)واتە(چاکەکاربە لەگەڵ دایك و باوکدا تەنانەت لە سڵاوکردندا، خوای گەورە دەفەرموێ (وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ (النساء/٨٦)واتە(ئەگەر سڵاوتان لێکرا، ئێوە چاکتر لەو سڵاوە وەڵامیان بدەنەوە) بێگومان خوای گەورە واجبی کردووە لەسەرمان تەنانەت لە کاتی سڵاوکردندا، کە چاکەکاربین لەگەڵ خەڵکی... یاالله! ئای ئەم ئاینە چەندە مەزنە.. بەدوای هەموو لەمپەرێکدا دەگەڕێت تا لایبەریت پەروەردگار دەفەرموێ (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ

ﺑِﺈِحْسَانٍ)....واته(( تەڵاقێك كە بردنەوەی بەدواوەبێ) دوو جارە، دوای ئەوە ڕاگرتنە بەخۆشی یان بەرەڵا كردنە بەچاكی)

بۆچی؟ چونكە ئەوكەسەی چاكەكارە لە تەڵاقدا، بێگومان لە هەموو ژیانیدا كەسێكی چاكەكار دەبێت) یا الله!! وێنای بكەو بزانە چاكەكاریی گەشتوەتە كوێ.. تەنانەت لە تەڵاقدانیشدا..)

سەرسام مەبە.. وە چاك بزانە ئەم ئاكارە بە تەواوی ڕۆچووە بە هەموو ژیانماندا..

هاوڕێی هەمیشەییتە لە گوفتارو كردارو ئیشەكانتدا..

## یەكەم جار دەربازم كەن..پاشان فتواتان بۆ دەیەم:!

لە چیرۆكی پێشەوامان یوسفﷺ كە بەسەرهاتێكی كورت و پوختە بەڵكو جەوهەری چاكەكاریە بەگشتی: پێشەوامان یوسف ﷺخرایە بەندینخانەوە، چونكە بوختانی بۆ كرابوو كە خراپەی لەگەڵ خێزانی عەزیزی میسردا كردووە، وە حوكمدرا بە بەندكردن بۆ ماوەی چەند ساڵێك..دوای ئەوە... پاشای ئەو وڵاتە لە خەودا خەوێكی بینی.. كە حەوت مانگای لەڕولاواز حەوت مانگای قەڵەو دەخۆن.. بۆیە سەری سوڕماو پرسیاری كرد: كێ دەتوانێ ڕاڤەی ئەم خەوە بكات! بۆیە چوون بۆلای یوسف..چونكە تەفسیری خەوێكی كردبوو بۆ ئاوگێڕی پاشا كاتێ كە لە بەندینخانەدا بوو لەگەڵ ئەمدا...یوسفﷺ فەرمووی: (تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدْتُمْ فَذَرُوهُ فِي سُنْبُلِهِ إِلاَّ قَلِيلاً مِمَّا تَأْكُلُونَ)يوسف/٤٧...واتە:( یوسف ووتی): حەوت ساڵ كشتوكاڵ دەكەن بەدوای یەكداو بە بەردەوامی ، جا ئەوەی كە دروێنەتان كرد بیهێڵنەوە لە گوڵەكەیدا، كەمێك نەبێت پێشەوامان یوسف، مانای خەونەكەیان بۆ دەكات، ئەمە پێش ئەوەی لەبەندینخانە بەربێت... وێنای بكە ئەگەر تۆ لە جێگای ئەودا بویتایە، ئایا وات دەكرد؟ یان دەت ووت (یەكەم جار بەرم بدەن، ئینجا فتواتان بۆ دەدەم)؟؟ من دڵنیام لە گریمانی دووەم، بەڵام ئەبێ چی پاڵی بە یوسفەوە نابێت، بۆ ئەو هەموو هاوكاری و یارمەتیە؟؟؟ بێگومان چاكەكاریی، ئەگەری ئەوە هەبوو كە واز لە خەڵكی بهێنێت، هەژاری و برسێتی بێت بەسەریاندا، چونكە ئەم بە زوڵم و ناپاكی بەندكرابوو. بەڵام ئەوە لە ئاكاری ئێمە نیە.. خوای گەورە فەرمانی

ئەوەی پێنەداوین.. برای خوێنەر ئاگاداربە.. چیرۆکی یوسف بەوە کۆتایی نەهات کە پێنە
بلێت کافرەکان موسڵمان بوون یان موسڵمان نەبوون، بە بۆچوونی تۆ بۆچی،چونکە خو
گەورە ویستی فێرمان بکات کە چاکەکاریی پەیوەندی بە ئەنجامەکانەوە نیە..پێشەوا
یوسف ﷺ چارەسەری بۆ هاوەڵدانەرەکان(المشرکین) دۆزیەوە کە چۆن کشتوکاڵ بکەن
کەی کشتوکاڵ بکەن، وە چۆن خواردن ئەمبار بکەن، و شتانێکی تریش بەبێ ئەوە
پرسیاری ئەوە بکات ئایا خەڵکەکە سەر بە چ بیرو باوەڕێکن.. ئای کە چەند ئیسلامێکی
مەزن و گشتگیرە.. چ ئاینێك ئاوایە؟ ئایا هەقی ئەوەت هەیە شانازی بە ئاینەکەتەوە بکەیت
یان نا؟

چاکەکاری سیفەتێکە لە سیفەتەکانی تەواوکاری (الکمال) وە تەواوکاریش جەوهەری
حەزو ئاواتەکانی ئێمەیە، تەواوکاری سنوردار تا ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنین
کە خاوەنی تەواوکاری ڕەهایە، خوایەگیان ڕزگارکەرمانبەو..وە ئەمە سیفەتی ئەو کەسانەیە
کە گوفتاریان لەگەڵ کردارياندا یەك دەگرێتەوە.

# ﴿سەربەرزی موسڵمانان﴾

## ئێمە نەتەوەیەکین خوای گەورە سەربەرزی دەخوازێت بۆی

برای خوێنەر.. هێشتا لە ڕێگای گۆڕانداین هەتا خوای گەورە پشت و پەنامان دەبێت و کۆمەکمان دەبێت.. لەڕاستیدا.. لەوانەیە زۆرترینی ئەو بابەتەی کە گرنگی پێ دەدەین و جێگای سەرنجی هەموومانە بابەتی: سەربەرزی ئیسلام و موسڵمانانە.. ئیماندار لەسروشتی خۆیدا سەربەرزە لای پەروەردگاری، سەربەرزە بە خۆی و بە ئاینەکەی و بە قورئان و بە نیشتمانەکەی، هەرگیز سوکایەتی قبوڵ ناکات، هەرگیز ڕازی نابێت بە خلیسکان و مەنگی.. بەڵام فاسق، ئەو کەسەی کە دوورە لە خواوە، بە ئاسانی تاوان دەکات و خراپەکاری ئاسانە بەلایەوە، وەگرنگی نادات بە کاروباری موسڵمانان.. تیکە نانەکەی بە بەهاترە لە شەرەف و کەرامەتی بەسەرشۆڕی و سوکایەتیەوە ،ئەو تیکە نانە دەخوات.

ئێمە نەتەوەیەکین خوای گەورە سەربەرزی دەخوازێت بۆی.. ئیتر چۆن واز لە عیزەت و سەربەرزی خۆمان بێنین و بەدەستی خۆمان خۆمان سەرشۆڕ کەین؟

## بۆچی بەدەستی خۆمان سەرشۆڕی لە دەروونەکاندا دەچێنین؟

بۆ نموونە مامۆستا سزای قوتابیەکان دەدات و دەڵێ ڕووبکەنە دیوارەکە، لەبەردەم هەمواندا سەرزەنشتیان دەکات، ئەوە پەروەردەیە، بەڵام سزا سوکایەتی کردن نیە.. قوتابی هەرگیز بەدرێژایی ژیانی سووکایەتی کردنی لەبیرناچێتەوە، چونکە قبوڵکردنی سەرشۆڕی ئاسان نیە.. ئەو باوکەی سوکایەتی بە ژنەکەی دەکات لەبەرچاوی منداڵەکانیدا و لێی دەدا..ئەبێ حاڵی ئەو ئافرەتە چۆن بێت ، زەلیلە و هەست بە هیچ سەربەرزیەك ناکات...پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەیکردووە لەسەر و لە ڕووخسار بدەین، بۆچی؟ لە

پێناو سەربەرزیدا.. پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لە ژن یان خزمەتکاری خۆیی نەیاوە لە پێناوی سەربەرزیدا..

وە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ جەخت دەکەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نانی خواردووە لەگەڵ خزمەتکارەکان و ڕێزی لێگرتوون.. وە نموونە زۆرە لەسەر چادنی زەلیلی بە دەستی خۆمان، باوك لە کوڕەکەی دەدات یان سوکایەتی پێ دەکات لەبەرچاوی هاوڕێکانیدا.. بەشێوەیەك سەربەرزی و عیززەت لەدەروونی منداڵەکاندا دەکوژرێت..
ئێوەش دەڵێن: چۆن دەتوانین پەروەردەیان بکەین؟.. ئەگەر هەڵەیانکرد، چۆن سزایان بدەین؟ و لەکوێ؟ لە ژووری نوستن؟ یان لە یانە؟یان لەبەرچاوی هاوڕێکانیان؟ هەموو ئەو شتانەکە لەبەرچاودا سادە دیارن، پێویستە لەکاتی سزادانی منداڵەکانماندا ڕەچاویان بکەین.. ئەو لاوەی کە قسەدەکات وکەس و کارەکەی بێدەنگی دەکەن،پێی دەڵێن: (چاوەڕوانی بکە تا گەورەکان قسە دەکەن). بۆیە متمانەی نامێنێ بە خۆی و هەست بە سوکایەتی دەکات، و هەست بەترس دەکات لەکاتی گوزارش کردن لە ڕای خۆی

براو خوشکانم.. ڕێز لە خەڵکی بگرن هەتا بە عیززەت و کەرامەت و سەربەرزیەوە بژین..

## (نایەڵم کەس پێشم کەوێ لەو بەشەی کە لە تۆوە پێم دەگات)

پێغەمبەر ﷺ لە مەجلیسێکدا دانیشتبوو کە هەموویان گەورە پیاوانی هۆز بوون. لەلای ڕاستیشەوە(إبن عباس)دانیشتبوو کە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو..پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئاوی بگێڕایە لە ڕاستەوە دەستی پێدەکرد..پێغەمبەر ﷺ بە عەباسی ووت(هل تأذن لي أن أعطي هؤلاء)واتە: ڕێگام پێ دەدەیت ئاوەکە بیەم بەوان..لاوەکەش وەڵامێکی زۆر جوانی یایەوە:(لاأؤثر بنصيبي أحداً)(البخاری/٥٦٢٠- مسلم/٥٢٦٠).. واتە:(بەخوا ئەو بەشەی لە تۆوە پێم دەگات کەس پێشی خۆم ناخەم)..ئایا بینیت چۆن سەربەرزی لە دەروونەکاندا پەروەردە کراوە؟؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (أنت وما شئت) واتە (خۆت چیت پێ باشە باوابێ)

## هەرگیز خۆت نەخەیتە شوێنێك كە زەلیلی بێت

وێنای فەرمانبەرێ بكە لە دامەزراوەیەكی حكومیدا سوكایەتی بەخەڵك دەكاو كاریان ..ر دەخاو بێزاریان دەكا و پیریشیان تێدایە... وە پیاوێكیش بەرێوەبەرەكەی سوكایەتی پێ ..كات.. لێ ی دەپرسیت: بۆچی ئەوە قبوڵ دەكەیت؟ پێت دەڵێ: ناتوانم واز لە كارەكەم ..م لە پێناوی بژێوی ژیاندا.. ئازیزانم.. بڕوام پێبكەن ژیان بەزەلیلی زۆر ناخۆشترە لە ..ێنێك كە مرۆڤ ئازاری برسێتی و كەم دەرامەتی بچێژێت..

..ی برۆ و بگەڕێ بەدوای كارێكی تردا..ئایا پێت وایە لەگەڵ ئەودا كە سەرشۆڕیت لەسەر كارەكەت دەتوانیت منداڵەكانت بەسەربەرزی و بەرێزەوە بژێنیت، بێگومان نەخێر.. لەبەر ئەوە خۆت مەخەرە شوێنێكەوە كە جێگای سوكایەتی پێكردن بێت، لەبەر ئەوە بەهۆی ئەوەوە خراپت كردووە لەگەڵ خۆت و لەگەڵ خێزانەكەتدا.. وە لەبیرت نەچێت ئەو نەتەوەیەی پیرۆزی و زەوی و قودسیەتی لەدەست بدات، ئەوە نەتەوەیەكە بەزەلیلی دەژی.. بەڵێ چۆن رێزی لێ دەگیرێت لەكاتێكدا دەستبەرداری گرنگترین پیرۆزیەكانی خۆی بووە؟؟

## سەرچاوەی تاكەسەربەستی بۆ ئێمە.. خوی گەورەیە

وێنای بكە.. پسپۆڕی بیانی ، تەنها لەبەر ئەوەی بیانیە رێزی لێ دەگیرێت و دەستی ماچ دەكرێت، بەڵام پسپۆڕی وڵاتەكەی خۆت زەلیلە و سوكایەتی پێ دەكرێت! بۆچی؟؟ فڕۆكەیەك دەبینیت عەرەب و بیانی تێدایە.. نیوسەعات لەكاتی خۆی دوا دەكەوێت.. جابیەكە یەت و پۆزش بۆیەكە بەیەكەی بیانیەكان دێنیتەوە..بیر لەوە ناكاتەوە پۆزش بۆ عەرەبەكە بێنێتەوە!.. عەرەب بە سروشتی خۆی هەتا پێش ئیسلامەتیش، ڕقی لە زەلیلی بووە،ڕقی لە سوكایەتی و ژێردەستیە، ژێر دەستی لای عەرەب واتە شتێك لە ژێر ڕكێفدا.. دەلێن:ن (أَرْضُ ذَلُول)و(دابَة ذَلول) .. (زەوی ژێر ڕكێف)..(چوارپێی ژێر ڕكێف).. وە ووشەی (ذَلُول) لای عەرەب بەبێگیان و بەگیانداران دەڵێن.. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ((أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ * وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ)) (يس٧١-٧٢) واتە (ئایا نەیاندی (نەیانزانیوە)كە

بێگومان بەدەستی خۆمان ئاژەڵمان بۆ دروستکردوون، ئەنجا ئەوان خاوەنیانن وە ڕامـ
هێناون بۆیان ئەنجا سواری هەندێکیان دەبن و (گۆشتی)هەندێکیشان دەخۆن)

لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەبینین پرسیار لە عائیشە ﵂ دەکات:( أرأيت يا عائشة ،
رفع باب الكعبة عاليا)؟ فقلت: لا يارسول الله.. فقال :(تعززا أن يدخلها إلا من أرادو)(مسـ
٣٢٣١) ....واتە: ( ئەی عائشە: ئایا دەزانی بۆچی دەرگای کەعبە بەرزکرایە) ووت
نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا.. فەرمووی: بۆسەربەرزی کەسێك بچێتە ناوی کەبیانەوێت) .

براکانم پێویستە تاك سەربەرز بێت تا نەتەوەش سەربەرز بێ ، بەڵام چۆن دەتوانین
بگەین بەسەرچاوەی سەربەرزی؟

تاکە سەرچاوەی سەربەرزی بۆ ئێمە خوای پەروەردگارە.. خوای گەورە دەفەرموێ (مَن
كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا) (فاطر ١٠)
واتە:( هەر کەسێ گەورەیی و سەربەرزی دەوێ (لە خوای بوێ) چونکە بەڕاستی هەموو
گەورەیی و دەسەلاتێ هەربۆ خوایە)

## تۆ بەندەی فەرمان پێکراوێك نیت.. تۆ بەندەی خوایت

تۆ خەڵکی سەر زەویت کە خاوەنی هیچ سەربەزری و زەلیلەیەك نین.. خوای
پەروەردگار مرۆڤ سەردەخات و ژێری دەخات.. ئەوەی ئەمرۆ سەربەرز بێت لەوانەیە
سبەینێ زەلیل بێت.. یان دەوڵەمەندبێت، هەژار بێت.. تۆ نابێ بەندەی فەرمان پێکراوێك
بیت و نابێ واشت لێ بێت.. تۆ بەندەی خوای گەورەیت!! ئایا هەژار داوای کۆمەکی لە
هەژار دەکات؟ ئایا کەسێك خەریکە بخنێکت داوای کۆمەکی لە کەسێکی وەك خۆی
دەکات؟ بێگومان نەخێر.. هەژار پێویستی بەدەوڵەمەندە تا بارەکەی بەسەرەوە لا
بەرێت.. خوای گەورە سەرفرازکەرەو ئێمەش بێ هێزو زەلیلین.. پێویستمان بەو هەیە
تاوەکو بە ڕێزو سەربەرزیەوە بژین، ئەی نەتەوەی ئێمە پەنا بۆ کێ بەرێـت؟! ڕابمێنە
لەگەڵمدا لەم ئایەتە (قُلْ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ
وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير ) (آل عمران: ٢٦) ..
واتە:( بڵێ ئەی خوای خاوەنی دەسەلات، دەسەلات دەدەیت بەهەر کەسێك کە بتەوێت.

ز بەڕێزی دەکەیت ئەوەی کە بتەوێت، وە بێڕێزی دەکەیت ئەوەی کە بتەوێت، تەنها بە
دەستی تۆیە هەموو چاکەیەك، بەڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایت) نەکەی بێجگە
ـە خوا ﷻ داوای سەربەرزی لەکەس بکەیت چونکە تەنها خوا خاوەنی سەربەرزی و
سەرفرازیە.. خوای گەورە دەفەرموی :( أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمْ الْعِزَّةَ ) (النساء:١٣٩) واتە:(ئایا
ـتەمان سەربەرزیان لای ئەوان دەسکەوێت؟(بۆچونێکی هەڵەیە))

ئایا ژیرانەیە بێجگە لە خوای گەورە ﷻ سەربەرزی لای کەسێکی تر ببینینەوە؟!!
فَلِلّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا)( فاطر:١٥) (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لاَ يَعْلَمُونَ )
ـنافقون:٨)... واتە( ڕێزو گەورەیی تەنها بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خواو بۆ باوەڕدارانە،
ـەڵام دووڕوان نازانن)

خوای گەورە نایەوێ بەندەکانی زەلیلی بنوێنن تەنها بۆ خۆی نەبێت، خوای گەورە
ـاسی زەلیلی نواندنی نەکردووە، تەنها بۆ باوك و دایك و بۆ ئیمانداران نەبێت..بسم الله
ـرحمن الرحيم..( وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنْ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي
صَغِيرًا)(الاسراء:٢٤) واتە: ( باڵی خۆبەکەم زانینیان بۆ ڕابخە لە بەر بەزەیی و میهرەبانیت
ـیان، بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە، هەرچۆن ئەوان منیان پەروەردەکرد بە منالی

وە ئەو شوێنەی تر کە خوای گەورە ڕازیە زەلیلی بنوێنیت بۆ برا ئیماندارەکانت.. برا
ئاینیەکانت ،خوای گەورە دەفەرموێ: (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى
لْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ) المائدة ٥٤ .. واتە: ( وە بەزوویی خوا لەباتی ئەوان گەل و
کۆمەڵێکی تر ئەهێنێ، خوا ئەوانی خۆش ئەوێ و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ بەسۆزو
بەزەیین بەرامبەر بڕواداران و بەهێزن بەرامبەر بێ بڕوایان)

لەبەر ئەوە خۆت زەلیل نەکەیت تەنها بۆ خوا نەبێت.. خوایەگیان نەمانخەیتە زەلیلیەوە
تەنها بۆ خۆت نەبێت.. وە پێویستیمان نەخەیتە دەستی کەسەوە تەنها خۆت نەبێت.

## کەزەلیل دەبیت؟..

لەو هەڵویستانەی مرۆڤ تیایدا هەست بە زەلیلی دەکات، کاتێکە کە زوڵمی لێ دەکرێت.. لەبەر ئەوە خوای گەورە دەدوێت لەگەڵیداو پێغەمبەر دەفەرموێ: ( إن دعوة المظلوم ليس بينها وبين الله حجاب، يرفعها الله فوق الغمام)(مسلم:١٢١) ويقول (وعزتي وجلالي لأنصرنك ولو بعد حين...) واتە: ( دوعای زوڵم لێکراو لە نێوان ئەو و خوای گەورەدا هیچ بەربەستێك نیە، خوا بەرزی دەکاتەوە بۆ سەر هەورەکان).(وە خوای گەورە)دەفەرموێ: بەعیززەت و جەلالی خۆم سەرت دەخەم با پاش ماوەیەکی تریش بێت...) بەڵام زەلیلی زوڵم سەرچاوەکەی دەرەکیە.. دەتوانرێت بەری لێ بگیرێت و بەرگری لێ بکرێت.. ئەی کەی مرۆڤ خۆی خۆی زەلیل دەکات؟.. مرۆڤ بە چوار شت زەلیل دەبێت

یەکەم: کاتێ تەسلیمی شەیتان دەبێت: ئیبلیس دوای ئەوەی کە لە ڕەحمەتی خواو لە بەهەشت دەرکرا ووتی بەخوای گەورە (قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِي إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلاَّ قَلِيلاً) (الإسراء:٦٢) واتە: (ئیبلیس ووتی: پێم بڵێ و هەواڵم بدەرێ، لەبارەی ئەمەوە کە ڕێزی ئەوت داوە بەسەرمندا،سوێند بەخوا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی دوایی (نەمرم)بەڕاستی زاڵ ئەبم بەسەر بەندەکانیدا، کەمێکیان نەبێت)

(أحتنكن)واتە: دانانی لغاو لە مەلاشودا، دەوترێت: ئەسپەکەی لغاو کرد، ولاخەکەی لغاو کرد.. کەواتە، بەڵێنی داوە دەست بخاتە بینەقاقامان و لغاومان بکات.. ئەزانیت وەکو چی؟ وەکو وولاخ... بەڵێ، وەکو وولاخ.. ئیبلیسی نەفرەت لێکراو ئەوە دەخوازێت بۆ ئێمە.. بەزەلیلی و بەبێ ڕێز بژین، یەکەمین شت کە وات لێ دەکات زەلیل بیت دەتکات بە بەندەی شەیتان، وە سوەسەت بۆ دروست دەکات: ئێستا مەگەڕێرەوە بۆ لای خوا.. برۆ دوایی هەر فریا دەکەویت هێشتا گەنجیت.. عارەق بخۆرەوە، بگەڕێ و دنیا ببینە! پێت پێ دەکەنێ و تاوانکردنت لا ئاسان دەکات..

دووەم: شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو... واتە شوێن مەزاجی خۆت بکەویت لە هەموو کاروبارێکی ژیانتدا.. بە مەزاجی خۆم هەموو شتێ دەکەم لە ژیاندا... مەزاجی خۆت لەماڵ

ى كەسەكاندا دەبینیت... پێغەمبەر ﷺ پێمان دەڵێ: (تعس عبد الدرهم والدينار) (إبن ماجە، ٤١٣٥،٤١٣٦)

واتە: ( ئەوەی دەبێتە بەندەی درهەم و دینار نابەختەوەرو سەرگەردانە).. خوای گەورە دەفەرموێ: (أَفَرَأَيْتَ مَنْ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ) (الجاثية:٢٣) واتە: (ئاخۆ بینیوتە ئەوکەسەی هەواو ئارەزوی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی) ئیمامی ئیبن تەیمیە دەڵێ: ( بەند کراو ئەوکەسەیە دڵی بەند دەکات لە پەروەردگاری، ئەسیر کەسێکە هەواو ئارەزووی ئەسیر کردووە) ئەوکەسە زەلیل و ئەسیرو بەندکراوە.

هەندێ کەس دەپرسن: من چیم داوە لەکۆمەڵگا؟ من بەم شێوە ژیانەم ڕازیم.. دەبینیت خوای گەورە دەفەرموێ: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) چۆن (تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ) (آل عمان :١١٠)

## اللە!.. ئایا ئێمە واین؟ یان ئەم وەسفە هێشتا گەورەو فراوانە لەسەرمان؟

سێیەم: هەستکردن بەخوا.. بە ئاین.. بەمەنهەج.. بە نەتەوە وون بکەیت.. بەرنامەو پرۆگرامێکی مەزن لەبەردەستماندایە بەڵام هەست بە بەهاکەی ناکەین بەڵکو هەست بە بەهای شتێك دەکەین کە خاوەنی نین، هەست بە ئینتیما دەکەین بۆ وولاتێکی تر.. هەندێ لاو دەبینیت قژیان وەکو ئەستێرە سەیرە بیانیەکان لێ دەکەن.. کارانێك.. و کارانێك... بەڵێ ئەوەیە هەست نەکردن بە خواو بەنەتەوەی خۆمان

چوارەم: نەمانی متمانە بە خوا.. و هەموو شێ نوسراوەو ئەندازە گیر کراوە لە خواوە و لای خواوەیە.. بەڵێ هەندێ کەس بەڵکو زۆرینەیان وا هەست دەکەن ڕۆزی ئەم بە دەستی خەڵکیە.. وە تەمەنی ئەم بەدەستی خەڵکیە.. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:(إن روح القدس نفث في روعي أن نفسا لن تموت حتى تستكمل رزقها وأجلها) (إبن عبد البر في (التمهيد)(٢٨٤/١)... واتە: (بێگومان روح القدس فوی کرد بە دڵ و ئەقڵ و ژیریماندا، بێگومان ئەو هەناسەو دەرونە نامرێت تا ڕۆزی و ئەجەلی تەواو نەبێت) کەواتە کەی زەلیل دەبیت؟ کاتێ تەسلیمی شەیتان دەبیت، وە کاتێ هەواو ئارەزوت لە ڕازی بوونی خوا

دوورت دەخەنەوە ، کاتێ متمانەت بەخوا نامێنێت، وەهەروەها کاتێ متمانەت بەم نەتەوەیە نامێنێ.. ئەگەر تووشی هەموو ئەمانە بویت چی ڕوو دەدات؟ ئەوە ڕوودەدات کە لەم سەد ساڵەی دووایدا ڕوویدا.. دوژمنت زەلیلت دەکات.. ئای کە چۆن زەلیلیەکە.. زەلیلی و دوژمن.. چۆن دەتوانین بەرگەی ئەوە بگرین...

بیر لە ڕۆژگاری تەتەرەکان بکەرەوە: ئافرەتێکی تەتەری دێت و قسە لەگەڵ دەپیاود دەکات و دەڵێت: شمشێرم پێ نیە تا بتان کوژم.. ڕوو بکەن بەلای دیوارەکەدا تا شمشێرێك دێنم و دەتانکوژم، ئەوانیش دەترسان و دەلەرزین بۆ کوێ ڕادەکەن لەدەستی تەتەرەکان؟ ئافرەتەکە بە شمشێر دەیانکوژێت!.. بەڵێ لە ڕۆژگاری تەتەرەکاندا بارودۆخی موسڵمانان بەو شێوەیە بوو.. حاڵ ئەمڕۆشمان بەو شێوەیەیە.. بەڵام تا هیممەتمان بژێنینەوە هەندێ هەڵوێست و نموونەی سەربەرزی موسڵمانانت نیشان دەدەم..

## ئێمە خەڵکانێکی زەلیل بووین... خوای گەورە بە هۆی ئیسلامەوە سەربەرزی کردین

تەماشای کەسایەتی پێشەوامان عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بکە، ئەو ڕۆژەی کە موسڵمان بوو- نەك دوای دە ساڵ لە موسڵمان بوونی- بەڵێ ئەو ڕۆژەی کە موسڵمان بوو.. چوو بۆلای پێغەمبەرﷺ و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئێمە لەسەر هەق نین؟ فەرموی(بەڵێ) ووتی: ئەی ئەوان لەسەر ناهەق نین؟ فەرمووی (بەڵێ).. ووتی: ئەی بۆچی کاری ئێمە بە نهێنی بێت؟ فەرمووی: (تۆ چیت پێ باشە ئەی عومەر؟)ووتی: بچین و ئاینەکەمان ڕابگەیەنین... ئیتر پێغەمبەرﷺ ناوی نا (الفاروق) واتە: (بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە هەق و ناهەقی جیا کردەوە..(إبن مسعود) دەڵێت: لەو ڕۆژەوەی عومەر موسڵمان بوو، ئێمەش سەربەرز بووین، عومەری کوڕی خەتاب ﷺ ئەو ڕۆژەی ڕۆشت بۆ فەتحی قودس، (إبن الجراح) و (منداڵێکی)لەگەڵدابوو.. خۆی و منداڵەکە بە نۆرە سواری حوشترەکە دەبوون، کە نۆرەی منداڵەکە دەهات، عومەر ﷺ دادەبەزی تا ئاو بخوات و دانەویەوە بۆ گۆمی ئاوەکە.. (أبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح) پێ ی ووت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، لەبەردەم خەڵکیدا نا، خەڵکی چاوەڕوانن کلیلەکان...و....و... بیەن بە تۆ..

ـرـتى بە قوڕاویەوە دەچیت بۆلایان.. عومەریش وەڵامی دایەوە و ووتی: ئەی ئەبو عوبەیدە، ـى ئەگەر کەسێکی کە ئەم قسەی بکردایە.. ئەی ئەبو عوبەیدە، ئێمە زەلیلترینی خەڵکی ـرویـن... وەك ئەوەی بڵێت: سەربەرزی بە پۆشاك نیە، یان بەو شتەی کە خەڵکی سورای ـدبینت بەڵکو سەربەرزی بە دەروونەکانە.. تەماشاکە چۆن پەروەردە دەکرێت ـدەروونەکاندا... بەڵێ ووتی: ﴿ ئێمە زەلیلترینی خەڵکی بووین، خوای گەورە بەهۆی ـیسلامەوە سەربەرزی کردین، ئەگەر سەربەرزی و سەرفرازی لە غەیری ئیسلام داوا ـکەین، ئەوە خوای گەورە زەلیلمان دەکات..﴾ سوێندتان ئەیەم بەخوا.. ئەم ووتەیە بە ـوی ئاڵتون بنووسن و لەبەری بکەن بە منداڵەکانتان.

## ئایا ئاین لێ ی کەم بکرێتەوەو منیش زیندووبم؟؟

پێشەوامان ئەبوبەکر ﷺ دەبینین لەجەنگەکانی هەڵگەڕاوەکاندا، خەڵکی هەڵدەگەڕانەوە لە ئاینی ئیسلام. هەیانبوو دەیوت: چۆنە هەندێ لە فەرمانەکانی خوا واز لێ بێنین و بیانبەخشین لەزەکات و لە جزیە.. عومەریش ﷺ ووتی: با ئەو هەقەیان بەیێ.. ئەبو بەکر ﷺ ڕاپەڕی و ووتی: تەنانەت تۆش ئەی عومەر .. بەگریانێکی ناسکانە ووتی: ئایا ئاین لێی کەم بکرێتەوەو منیش زیندوو بم؟ ئایا بەجەرگیت لە جاهیلیەتا و لاوازیت لە ئیسلامدا ئەی عومەر؟! بەخوا ئەگەر دەستم ببەستنەوەو نەیدڵن لەکاتێکدا داویانە پێغەمبەرﷺ دەجەنگم لە سەری لەگەڵیاندا

## چونکە سەربەرز بوو کوڕێکی سەربەرزی پەروەردە کرد!

تەماشای ئەم ئافرەتە مەزنە بکە: ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ﷺ ، تەمەنی هەشتا ساڵەو عبدالله ی کوڕی زوبەیرش لەگەڵ حەجاجدا دەجەنگێ، حەجاجیش دەیکوژێت... سێ ڕۆژ لاشەکەی لەمەککەدا هەڵدەواسێ.. هەموو خەڵکی وایان پێشبینی دەکرد کە ئەسماء بچێت بۆلای و داوای لێ بکات بیکاتەوە.. بەڵام سەرسام بوون بەرامبەر بە عیززەت و سەربەزی ئەو ئافرەتە نائاساییە.. ڕقی لە دڵی حەجاجدا چاندو حەجاج چوو بۆلای و لێ ی پرسی: (

ئایا بینیت چیم کرد بەکوڕەکەت؟ ئەسمائیش بەو پەڕی داناییەوە وەڵامی یایەوە: (من دەتبینم دنیای ئەوت خراپ کرد، وە ئەویش دەبینم ئاخیرەت و قیامەتی تۆی خراپ کرد).

الله... کێ وەکو تۆ ئارامگرە ئەی ئەسمائی کچی ئەبو بەکر؟! کێ وەکو تۆ دانایە، کە دانایەکەت زاڵ بوو بەسەر سۆزتدا؟! ئەمە نموونەو مەبەستی ئێمەیە لە بارەی سەربەرزیەوە.

## لەستەمی ئاینەکانەوە.. بۆ دادپەروەریی ئیسلام

تەماشای کەسایەتیەکی وەك (رَبعي بن عامر) ﷺ بکە کە موسڵمانان ناردیان وەکو باڵوێزێك تا ئاینی ئیسلام بگەیەنێت.. مەلیکی فارسەکان ووتی: ئەمە عەرەبیەو لە عەرەبی بیابانە ، بە دوو شت چاوبەسی ئەکەن: زێڕو ماڵی بۆ ڕادەخەین بە پانتاییەکی زۆری ئەو بیابانە، ئەوکاتە دەزانێت ئێمە چەندە دەوڵەمەندین وە جاریەش دادەنیشێنین بەدرێژایی فەرشەکان تا دەگاتە لامان... (رەبعی کوڕی عامر) دابەزی بە ڕمەکەیەوە هەموو فەرشەکانی خراپ کرد– ئەو زانی مەبەستی ئەوان چیە – تاگەیشتە لای ڕۆستەم کە ئەو بەزەلیلی دیار بوو، ڕەبعیش بە سەربەرزی، ڕۆستەم ووتی: چیتان هێناوە؟ ووتی: خوای گەورە ئێمەی ناردووە تا بەندەکان ڕزگار بکەین لە بەندایەتیکردنی بەندە بۆ بەندایەتیکردنی پەروەردگاری بەندەکان، وە لە تەسکی دنیا بۆ فراوانی دنیاو ئاخیرەت(ڕۆژی دوایی)، وە لە ستەمی ئاینەکان بۆ دادپەروەری ئیسلام..  بەڕاستی سەربەرزیەکی ڕازاوە بوو کە لە دڵی ئەو عەرەبە ئازادەدا چەسپی بوو کاتێ کە دەیزانی ئەو تەنها بەندەی خوای گەورەیە..

## وامعتصماه

تەماشای ئەو ئافرەتە بکە کە سەربازێك لە ڕۆمەکان لەیەکێ لە بازاڕەکاندا زللەیەکی لێ دەیات، ئەویش هاوار دەکات: وامعصماه.. موعتەصەمیش نامەیەك دەنێرێت بۆ ڕۆمەکان.. و دەڵێ: لە موعتەصەمەوە بۆ سەگی ڕۆمەکان.. ئەو ئافرەتەم بۆ ڕەوانە بکەرەوە بەڕێزو بەعیزەتەوە، وە ئەگەر نا لەشکرێکت بۆ دەنێرم سەرەتاکەی لای تۆبێت و

کۆتاییەکەی لای من.. ئەمە چ سەربەرزیەکی شەریفانەیە؟!. ئای دەروونی ئێمە چەندە پێویستی بە هاوشێوەی.. ڕەزوومەندی ئەو نموونانەیە!!..

## چۆن سەربەرزی دەگەڕێتەوە بۆ موسڵمانان؟

نموونەکان زۆرن ئەگەر باسیان بکەین کۆتاییان نایەت.. بەڵام چۆن عیززەت و سەربەرزی بۆ ئەم نەتەوەیە دەگەڕێتەوە؟؟

یەکەمیش شت: پێویستە بگەڕێیتەوە بۆلای خوا: (مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا)(فاطر:١٥)...واتە: (هەر کەسێ سەربەرزی و گەورەیی دەوێ (لەخوای بوێ)، چونکە بەڕاستی هەموو گەورەیی و دەسەلاتێ هەر بۆ خوایە)

وەکاتێك دەزانین بەرنامەی ئێمە مەزنترین بەرنامەیە و نەتەوەی ئێمە مەزنترین نەتەوەیە (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لاَ يَعْلَمُونَ) (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ)

## چۆن سەربەرزی دەگەڕێتەوە بۆ موسڵمانان؟؟

دەگەڕێتەوە، کاتێك متمانەمان هەبێت کە ڕۆزی و ئەجەل و چارەنوسی ئێمە هەمووی بەدەستی خوای تاك و تەنهایە.. پێشەوامان عەلی ﷺ دەڵێ: چ ڕۆژێك ڕابکەم لە مردن: ڕۆژێ کە مردن دیاریکراوە، یان ڕۆژێ کە مردنی تیا دیاری نەکراوە؟ ئەو ڕۆژە مردنی تیا دیاری نەکراوە، مەترسە چونکە دیاری نەکراوە تیایدا، وە ڕۆژێ کە مردنی تیا دیاریکراوە، هیچ ڕاکردوویە رزگاری نابێت لێ ی.. چەند کەسێ یەن بۆ لای ئافرەتێك و پێ ی دەڵێن: بلێ بە عومەری کوڕی خەتاب کەمێردەکەت نەبات بۆ جیهاد.. ئیتر کێ نان بۆ منداڵەکانت پەیدا بکات؟ ووتی: من مێردەکەمم ناسیوە نان پەیدا کەرە و وام نەناسیوە ڕۆزی دەربێت ئەگەر نان پەیداکەریش بڕوا، خۆ ڕۆزیدەر (الرزاق) ناڕوات!! پێش ئەوەی کۆتایی پێ بێنم، حەز دەکەم ئەوەتانیێ بلێم کە (العزه) لە زۆربەی شوێنەکان لە قورئاندا هاتووە بە دانایی و بە ڕەحمەت...حەزدەکەم بە فەرموودەیە کۆتایی پێ بێنم (من جاءه مؤمن فأذله ولم ينصره، وهو قادر على أن ينصره، أذله الله يوم القيامة على رؤوس الخلائق)رواه الأمام أحمد في مسنده... واتە ( ئەوەی موسڵمانێ بێت بۆلای و ژێری خات و سەری نەخات، لەکاتێکدا

بتوانێت كە سەریخات، خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتا بە بەرچاوی هەموو خەڵكەوە ژێری دەخات) پەروەردگارا بە ئیسلام سەربەرزمانكەو ئیسلامیش بە ئێمە سەربەرز كە...

# ﴿تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خوا﴾

## بۆچی تەوبە دەكەین و لەچی تەوبە دەكەین؟

هەرچەندە باس لە تەوبە بكەین و..كات و گرنگی زۆری بدەینێ بەخوی گرنگێتیدەر: لە ڕێكخستن و ژیانی نەتەوەی ئیسلامیدا، بێگومان ئەو بارودۆخەی كە ئەمڕۆ تیایدا دەژین وامان لێدەكات باسی گرنگی تەوبە كردن بكەین، و گرنگی گەڕانەوە بۆلای خوا.. و: ئەگەر بمانەوێ بپرسین بۆچی تەوبە بكەین؟ وە تەوبە لەچی بكەین؟ پرسیارانێكی زۆرە ئێمە دێت بە بیرماندا و پێویستە وەلامی بدەینەوە.. ئەو هەموو جەنگ و كوشتارەی كە ئەمرۆ تیایدا دەژین سەدان كوژراو.. خەڵكی دەربەدەر، ماڵی وێرانە بوو، منداڵانی هەتیو. گەنجانی فەوتاو.. با بگەڕێینەوە بۆ لای خواو دەست بكەین بە تەوبەكردن و تا ئەوەی لەناخماندا هەیە بیگۆڕین.

گەنجێك بە هەستە ناسكەكانی خۆی بە ڕاشكاوانە پێی ووتم: دەترسم ئەوەی بەسەرماندا دێت لەجەنگ و لە نەهامەتی بەهۆی گوناهی منەوە بێت...ئەوە شتێكی مەحاڵنیە...گوناهی من و گناهی تۆ و گوناهی كەسانی تر كەڵەكە دەبن، تا بەر بەستێك دروست دەكەن لە نێوان ئێمەو لە نێوان خوادا ﷻ لەبەر ئەوە پێویستە تەوبە بكەین و بگەڕێینەوە بۆلای خوا.. چونكە خوای گەورە فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ) (الرعد١١).... واتە: ( بێگومان خوای گەورە هیچ گەلێك ناگۆڕێت. تا خۆیان گۆڕان بەسەرخۆیاندا نەهێنن)

ڕاستت فەرمووە ئەی پەروەردگاری شكۆدار.. بێگومان ئێمە پێویستمان بە گۆڕانی ڕیشەیی هەیە.

## کێ لە ئێمە هەڵە ناکات

کاتێ ئادەم ﷺ سەرپێچی خوای گەورەی کرد، بە بەهشتا دەگەڕا، خوای گەورەش ـێ پرسی: ئایا دەتەوێ لەمن ڕابکەیت ئەی ئادەم؟ ووتی: نەخێر، بەڵکو بەهۆی شەرمەوە لە تۆ پەروەردگارم.. لە سیفەتەکانی خوای گەورە ڕەحمەت و لێخۆشبوون و میهرەبانیە.. ئەگەر بێگوناه دروست بکراینایە ئەم سیفەتانە چۆن چۆن بەدیار دەکەوتن لەناو دروستکراوەکاندا؟

ووێنای بکەن ئەگەر ئەم شەو ڕووبکەیتە خواو پێی بڵێیت: دەگەڕێمەوە بۆلای تۆ ئەی خوایە، و تەوبە دەکەم پەروەردگارا، و لێم خۆشبە، ئایا لێمان وەرناگرێت؟ بەڵێ، لێمان وەردەگرێت چونکە ئەو بەبەزەیترینی بە بەزەییەکانە بۆ بەندەکانی، من پێش ئەوەی بە تۆ بڵێم بەخۆم دەڵێم کێ هەیە بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ بێ هەڵە بێت.

بەڵام هەیە ڕۆدەچێت لەتاوانەکەیدا، هەشە بە خێرایی دەگەڕێتەوە لە تاوانەکەی، دەی تۆ مەچۆرە ڕیزی بێ ئاگایانەوە. خوایەگیان بمانپارێزیت لێ ی.

## دامەزراو بەو دەست پێبکەو.. هەنگاو بنێ

با دەست بە تەوبە بکەین، و نەگەڕێینەوە بۆسەر گوناهەکان، و بڵێین: پەروەردگارا ئەمڕۆ دامەزراومان کە لەسەر تەوبەکردن، وە دامەزراومانکە لەسەر شەونوێژ، خوایەگیان دەرمان مەکە لە قاپیەکەی خۆت، بەڵکو ئەو تەنگەتاوی و ئەو جەنگانەی بەرۆکی گرتووین چارەسەر بێت، ئای شەوی تەوبەکردن چەند جوانە، شەوێکە ڕەحمەت دادەبەزێ بۆ سەر بەندەکان، شەوێکە فریشتەکان دەدەبەزن تا دەوری تۆبەکاران بگرن. تۆش وێنای بکە ئەگەر ئەم نەتەوە سووربیت لەسەر تەوبەکردن ئەوکاتە حاڵی ئێمە چۆن دەبێت؟ بێگومان زۆر باشتر دەبێت

## نەکەی خۆت بەزل بزانیت و ڕۆ بچیت لەتاواندا

...ند کەس هەیە سورە لەسەر گوناهەکەی و خۆی بەزل دەزانیٚ، خەڵکی زۆریش دەبینن و هەوڵ نادەن بیگۆڕن، ئایا ناتوانیٚ تامی هەموو دنیا بگۆڕێت ئەگەر تەوبە بکات، چونکە خوای گەورە تەوبەکەی قبوڵ دەکات، و دەفەرمویٚ: (وَمَا ذَلِكَ عَلَى اللّٰهِ بِعَزِيزٍ)(إبراهيم:٢٠) واتە: ( ئەوەش بۆ خوا گران و زەحمەت نیە)

لەوانەیە ئەو مەینەتی و نارەحەتیەی بەسەرمانەوەیە تەنها بە تۆبەکردنی کەسێك ... بچێت : (حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ) ئەوەی لە ئێمەدا داوا دەکرێت تەنها ئیرادەو توانایە، ... واز لە گوناهەکانمان بێنین و خواش لێمان وەردەگرێ بەڵام تەوبە بکەین لە گوناهە گەورەو بچوکەکان، لە گوناهانێك کە ئێمە هیچ ئەرزشێکمان بۆ دانەناوە ئیتر توشی جەنگ و مەینەتی و برسێتی و هەموو شتێکی تر بووین.. با تەوبە بکەین لە کەمتەرخەمیمان لەبانگەواز کردن بۆ لای خوا، بانگەوازی خۆبەزلزانان یان تەنانە ... ئەوانەی بەخۆیان دەڵێن ئێمە ئیمانداارین، ئەوە و ئەوەمان لە قورئان لەبەرە و تۆبەیان نەکردووە لە گوناهانێك و لە کۆمەڵێ هەڵە کە پێیان وایە حساب نیە لەسەریان (يَاوَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لاَ يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلاَ كَبِيرَةً إِلاّ أَحْصَاهَا )(الكهف:٤٩) واتە: ( ئەم نامەو دەفتەرە چیە، هیچ کردەوەیەکی بچوك و گەورەی جیٚ نەهێشتووەو تۆماری کردووە)

با تەبە بکەین لە کەمتەرخەمیمان... ئایا ئەوەی بەسەر موسڵمانانندا دێت لە جیهاند بەهۆی ئەوەوە نیە ئەم نەتەوەیە بێئاگایە لە ئاینەکەی؟ دوعاکان چەند زۆرن، وە ئەو ئیماندارانە چەند زۆرن کە بەهەڵە لە ئاینەکەیان تێگەیشتوون.. ئەو لاوەی لە کۆلێژەکەید دەرناچێت، دەبێتە پێشەنگێکی خراپ بۆ لاوەکانی تریش.. زۆرن ئەو کەسانەی بانگەواز دەکەن بۆی خوا بەشێوازی توندو نەفریناوی کە هیچ عەقڵانی نیە..چەندین کەس هەیە و گومان دەبەن کە هەڵەکانیان ئاسان و بچوکن و خوای گەورە دەفەرمویٚ: (وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِنْدَ اللّٰهِ عَظِيمٌ ) (النور:١٥) واتە (بە ئاسانی تەماشای دەکەن ، بەڵام لای خوا مەزنە)

## بێئومێدی مەبن لە ڕەحمەتی خوا

گویٚ لە فەرمایشتی پەروەردگار بگرن لە قورئانە پیرۆزەکەیدا :( قُلْ يَاعِبَادِي الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ ، لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللّٰهِ إِنَّ اللّٰهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ

ـرّحِيمُ ) (الزمر:٥٣)... واته:﴿ ( ئەی محمد ﷺ) پێیان بڵێ ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێ﴾

بەڵێ بە ڕاستی زیادە ڕەوی زۆرمان کردووە پەروەردگارا.. وە ئێمە دەزانین کە پێغەمبەر ﷺ هیچ ئایەتێ بەڕادەی ئەم ئایەتە دڵخۆشی نەکردووە.

ئەی کەمتەرخەمی داکۆکیکەر لەسەر گوناە، ئایا کاتی ئەوەت نەهاتووە تەوبە بکەیت، ئایا کاتی ئەوەت نەهاتووە کە بگەڕێیتەوە بۆلای خوا؟ بەخوا کاتی هاتووە تۆ لە هەموو کەس زیاتر پێویستت بە تەوبەو گەڕانەوە هەیە بۆلای خوا.. لەوانەیە هەندێ کەس بپسن: ئایا تەوبەی من مەینەتی هەموو ئەم نەتەوەیە چارەسەر دەکات؟ بەڵێ ئەمە راستە، بەڵگەش بۆ ئەمە فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ ( اذا اشتكى منه عضو، تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى ) (بخاري:٦٠١١ـ مسلم ٦٥٢٩) واتە ( ئەگەر ئەندامێکی لەش ئازاری هەبێت، هەموو ئەندامەکانی تر تا دەیانگرێت و شەونخونی دەکێشن) ئایا دەزانیت؟ ئەو ڕۆژەی تەوبە دەکەیت، لەو ڕۆژەوە براکەت بە زوڵم لێکراوی لەهیچ پارچەیەك لە پارچەکانی زەوی خوا نامرێت.. گوێ لە فەرمایشتی پەروەردگار بگرە (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ )( البقرة:٢٢٢) واتە (بێگومان خوای گەورە تۆبەکەران و خۆ پاککەرەوەکانی خۆش دەوێت) گوناهەکان کەڵەکە بوون و کەس گوێ لە فەرمایشتی خوای گەورە ناگرێت : (أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ )( التوبة١٠٤ ) واتە (ئایا نازانن کە بێگومان خوای گەورە خۆی تەوبە لە بەندەکانی وەردەگرێت) وە خوای گەورە دەفەرموێ: غَافِرِ الذَّنْبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ) (غافر:٣) واتە (لەگوناهان خۆش دەبێ و تەوبەش وەردەگرێت)

دوای هەموو ئەم ئایەتانە، ئایا هەر سووریت لەسەر گوناهەکان و تەوبە نەکردن؟ ئایا سەرکەوتن ناخوازیت بۆ برا زوڵملێکراوەکانمان لە هەموو شوێنێك؟..

هەندێ جار، دەپرسین ئیرادەو توانای خوا ﷻ چیە؟ خوای گەورە چی ئەوێ لێمان؟ وەڵام: (وَاللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَنْ تَمِيلُوا مَيْلاً عَظِيمًا(٢٧)يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا ) ( النساء: ٢٨،٢٧)...واتە: ( وە خوا دەیەوێت لێتان ببورێت، بەڵام ئەوانەش کە شوێن ئارەزوات کەوتوون دەیانەوێ کە

لاتان بدەن بە لادانێکی گەورە، خوا دەیەوێت کە ئەرکتان لەسەر سووك بکات، چونکە مرۆڤی بە لاوازی دروستکردووە)

بەڵێ خوای گەورە دەیەوێ بارگرانی ڕۆژی قیامەتتان سوك بکات، وە دەیەوێ ئەو فیتنەو مەینەتیانەی سەرتان لابەرێت، ئایا تەماشای ڕیزبەندی ئایەتەکانت کرد؟ خوای گەورە دەفەرموێ: (وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا ) مادام تۆ لاوازیت بۆچی تەوبە ناکەیت تا ئەو لاوازیەت لەسەر نەمێنێت و بیگۆڕیت بۆ سەربەرزی لە بری ئەوەی زەلیل بیت؟ بەڵێ ئەوە خۆبەزلزانینە حوکمڕانی دڵە سەرپێچیکەرەکانە..

ئایا هەر تاوان و گوناه لای تۆ لەسەرەوەی تەوبەوەیە؟ وا گومان دەبەم لە خەڵکی وەڵامیان لەلایە، وە بەبێدەنگی وەڵام دەدەینەوە، کە بەهۆیەوە وڵاتمان توشی نەهامەتی کردووەو ئومێدەکان و حەزەکانمان پێ وێران کردووە.

## بۆ خۆیان زاڵمن

گوێ لە فەرمایشتی پەروەردگار بگرە (وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ (الحجرات:١١) واتە: ( ئەوەی تەوبە نەکات ئەوە لە زاڵمەکانە)

خوایەگیان بۆ کێ؟ ئەوانە بۆ خۆیان زاڵمن، خوای گەورە مرۆڤەکانی کردووە بە دوو بەشەوە: تۆبەکارو زاڵم و سێهەمی نیە، زوڵمیش دەگەڕێتەوە بۆ دەروون و خود، چونکە خاوەنەکەی خۆبەزلزانە و (پەنابەخوا)وا دەزانێت پێویستی بە خوا نیە..

سوێندت ئەیەم بە خوا وەڵامم بەرەوە، دوای هەموو ئەمانە بۆچی سووریت لەسەر گوناهو تاوان؟ بۆچی سووریت لەسەر نەگەڕانەوەت بۆلای خوا ﷻ؟ بۆچی سوریت لەسەر سوپاس نەکردنی (المنان) لەسەر ئەو هەموو ڕۆزی و بەڵگەو نیشانانەی لەسەرت؟ جێ ی داخە هەندێ کەس دەبینیت کە باسی خۆی دەکات و دەبینێت دەڵێ: من ئیمانم بە خوا هەیەو ئەو فەرزانەی داوەتی بەسەرمدا بەزیادیشەوە پێی هەڵدەستم.. وە من دڵنیام ئەوانە بەباشی لەم ئایەتە تێنەگەیشتوون (وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ) النور: ٣١) واتە ( هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەی باوەڕداران تا ڕزگارو سەرکەوتوو بن) وە من دەخوازم کە خەت بهێنن بەژێر (الْمُؤْمِنُونَ) دا، ئیماندار

جۆن دەبێت تەوبە بکات لە کاتێکدا ئیماندار بێت؟ کەواتە ئەمە باشترین بەڵگەیە لە خوای دەیهێنێتەوە کە تەوبە پێویستە تەنانەت لەسەر ئیماندارانیش، چونکە بەهۆی ئەوەوە یادمان دەخاتەوە کە هیچ کەسێ نیە بێگوناه و توان بێت، بەڵام بەندەی ئیماندار ئەوکەسەیە شەرم دەکات رۆبچێت لە تاواندا، بۆیە بە خێرایی دەگەڕێتەوەو تەوبە دەکات و داوای لێخۆش بوون دەکات لە خوای گەورە..

## تەوبەکردنی پێغەمبەر ﷺ ی بێگوناه

خوێنەی ئازیز ئایا دەزانیت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إني لاتقاكم وأعلمكم بالله وإني لأستغفر الله في اليوم والليلة أكثر من سبعين مرة ) (إبن ماجة:٣٨١٦).. واتە ( بێگومان من لە ئێوە بە تەقواترو زاناترم بە خوای گەورە، وە بێگومان من لە شەو و رۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێبوردن لەخوای گەورە دەکەم) وە لەهەندێ فەرمودەدا دەفەرموێ( زیاتر لە سەد جار) (إبن ماجه: ٣٨١٥)...

باشە ئەگەر پێغەمبەر ﷺی بێگوناه و هەڵبژێرراو ئاوا بووبێ، ئەبێ ئێمە چۆن داوای لێبوردن بکەین.. وە دەبێ لەشەو و رۆژێکدا ئێمەی مرۆڤی گوناهکار دەبێ چەند جار تەوبە بکەین..

ئازیزانم.. خوای گەورە ﷻ لە کتێبەکەیدا دەدوێت لەگەڵماندا: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ) (ال عمران ١١٠)) واتە: (ئێوە (موسڵمانان)باشترین گەلێك بوون بۆ خەڵکی هێنرابێتەدی ، فەرمان دەدەن بەچاکە، و جڵەوگیری دەکەن لە خراپە)

ئایا تۆ لەو ئوممەتە وەصفکراوەی کە لە قورئاندا باسکراوە؟ ئایا تۆ بە راستی خۆشەویستی خوایت؟.. دەخوازم وابیت، خۆشت بخوازە کە وابیت.

## شادیی خوای گەورە بە تەوبە کردنی بەندەکەی

خوێنەری ئازیز ئایا دەزانیت بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئەوەندە دڵخۆشە بە تەوبەکردنی بەندەکە، زیاتر لە دڵخۆشی بەندەکەی بەتەوبەکەی خۆی؟..

ئەوەی لە تۆ دەخوازرێت ئەی ئیمانداری بەرێز پەرستشی دڵە، و پەرستشی کردەیی ئایا تۆ توانیوتە هەماهەنگی بکەیت لەکۆکردنەوەیاندا؟ پرسیارانێکی زۆرن، سیستەمی ژیانی رۆژانەت رێك نابێت تا وەڵامیان نەیەیتەوە، پێغەمبەر ﷺ نموونەیەکمان بۆ دێنێتەوە کە دەتوانین بیکەین بە بەڵگەیەك لەسەر دڵخۆشی خوای گەورە بە بەندە تۆبەکارەکەی (جارێکیان پیاوێك بە بیابانێکدا دەڕوات و وولاخەکەیشی پێیەو خواردن و خواردنەوەی پێیە، وولاخەکە بەغار ڕایکرد تا دوور کەوتەوە لەخاوەنەکەی، بۆیە بێزاریی و بێئومێدی دڵی ئەو پیاوەی داگرت، چالێکی لە ناوەڕاستی بیابانەکەدا هەڵکەندو دانیشت تیاید، چاوەڕوانی مردنی دەکرد، دوای بێئومێدی لە گەڕانەوەی وولاخەکەی، چەند ساتێکی نەخایاند وولاخەکەی بەخواردن و خواردنەوەکەیەوە گەڕایەوە، و لە راسەری پیاوەکەدا وەسا، پیاوەکەش تەماشایکردو وویستی حەمد و سەناو سوپاسی خوای گەورە بکات، بەهۆی زۆریی دڵخۆشیەکەیەوە هەڵەیکرد لە گوزارشکردن لە سوپاسکردنەکەی ووتی پەروەردگارا، تۆ بەندەی منی و منیش خوای تۆم.. پێغەمبەر-ص- فەرموی (أتدرون؟ إن الله أفرح بتوبة عبده من هذا الرجل)(مسلم:٦٨٨٧)... واتە: ( ئایا دەزانن، خوای گەورە لەم پیاوە زیاتر دڵی خۆش دەبێت بە تەوبەی بەندەکەی)

خوای گەورە شەو و رۆژ تەوبەی بۆ ڕەخساندووین، و ئێمەش پشتمان تێکردووە، ئایە ئێمە لە کوێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ داین: (إن الله يبسط يده بالليل ليتوب مسيء النهار، ويبسط يده بالنهار ليتوب مسيء الليل) (مسلم: ٦٩٢١) .. واتە: ( خوای گەورە بەشەودا دەستی دەکاتەوە تا تاوانبارانی ڕۆژ تەوبە بکەن، و بەڕۆژیشدا دەستی دەکاتەوە تاوەکو تاوانبارانی شەو تەوبە بکەن) لەگەڵ ئەوەشدا سورین لە پشت تێکردنمان بۆی.

ئەگەر تۆ بێزار بوویت لە نمایشکردنی تەوبە بۆ خۆت و تەوبەکردنت، ئەوە من بێزار نابم لەو کارە، فەرموو گوێ لەم چیرۆکە بگرە بەڵکو پاڵ بە هەندێ کەسەوە بنێت بۆ تەوبەکردن و کاریگەریی هەبێت..

## ڕەحمەتی پاشایەکی زۆردار

دەگێڕنەوە، کەپاشایەکی مەزن دەبێت هەندێ کۆیلەی دەبێت کاریان پێ دەکات، دوژمنێکیش یەت بۆلای پاشا،و یەکێ لە کۆیلەکانی هان دەدات کە دوور کەوێتەوە لەپاشاکەی بە بەهانەی ئەوەی ئەو پاشایە ماندووت دەکات بەو هەموو ئەرك و کارانەو چاکەیشی کەمە بۆ تۆ، وە من بەختیاری و خۆشگوزەرانی زیاترت پێ دەبەخشم، ئەگەر دوور کەویتەوە لەو پاشایە، بۆیە ئەو کۆیلە قبوڵی کرد لە پێناوی ئەوەدا کە ژیانێکی ڕێزدارانە بژی، لە پڕ درۆی ئەو دوژمنە دەرکەوت و وەك بانگەشەی دەکرد هیچ خۆشی و ئاسوودەییەکی بەکۆیلەکە نەبەخشی، بۆیە سەر لەنوێ گەڕایەوە بۆ بەر قاپی پاشاکە و بیری دەکردەوە، ئایا قبوڵی دەکات یان نا؟ لە پڕ ئەو کۆیلەیە پاشای بینی کە بەگەرمی پێشوازی لێکرد، باشە ئەگەر ئەمە حاڵی بەندەیەك بێت لەگەڵ بەندەیەکی تردا، ئەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێت لەگەڵ خوای لێبوردەو میهرەباندا..ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە تەوبە بکەین؟

لەوانەیە ئەم چیرۆکەی تر ڕوونتر و ئاشکراتر بێت لەسەر قبوڵکردنی خوای گەورە بۆ تەوبەکانمان لەهەر کاتێکدا بێت.. ڕابمێنە ئەگەر کوڕێك یاخی بێت لە دایکی و بەشەڕ بێ و دایکە کە لەماڵ دەریکاتە دەرەوە ئەو کوڕەش بەشەقامەکاندا وێڵ بێت و پاشان بگەڕێتەوە لەبەردەم دەرگای ماڵی خۆیانا بخەوێت، ئایا ئەو دایکە دەستبەرداری کوڕەکەی دەبێت هەر لە دەرەوە بێت؟ نا، نەبەخوا؟ دەبینیت بەبێ لۆمەکردن باوەشی بۆ دەکاتەوە، حاڵی ئێمەش ئاوایە کاتێك سەرپێچی خوای گەورە دەکەین، تەنها تەقە لە دەرگاکەی بدەین بێ گومان دەرگای بەزەیی و تەوبەمان بۆ دەکاتەوە.. لێرەدا ئەم فەرموودە قودسیە پرشنگ دەداتەوە: ( من تقرب الي شبرا، تقربت إليه ذراعا، ومن تقرب إلي ذراعا تقربت إليه باعا، ومن أتاني يمشي أتيته هرولة) (الإمام أحمد في مسنده (٤١٣/٢) ...واتە( ئەوەی بستێك لێم نزیك بێتەوە من باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەوەی باڵێك لێم نزیك بێتەوە من گەزێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەوەی بە پیادە بێت بۆلام من بەڕاکردن دەچم بۆ لای)

## کاریگەری تاك لەسەر کۆمەڵ

ئەگەر ویستت دڵنیا بیت کە سەرپێچی یەك بەندە ئازار بە تەواوی نەتەوەیە دەگەیەنێت، فەرموو تۆ و ئەم چیرۆکە: چیرۆکی پێشەوامان موسا ﷺ و بەنی ئیسرائیل

موسا ﷺ لە شارێك بوو بۆ ماوەیەك باران نەدەباری، خەڵکەکەش دەترسان برسی تینویان بێت، بۆیە داوایان لە موسا ﷺ کرد کە نوێژە بارانەیان پێ بکات موساش نوێژی کرد و هەردوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان داوای باران بارینی دەکرد لە خوای گەورە بەڵام خوای گەورە وەڵامی نەیانەوە، بۆیە موسا پێغەمبەر ﷺ سەری سوڕماو ووتی پەروەردگارا تۆ بەڵێنت پێداوم کە وەڵامم بدەیتەوە، خوای گەورەش فەرمووی: لەناوتاند بەندەیەك هەیە ٤٠ ساڵە سەرپێچی من دەکات، باران نابارێنم هەتا نەچێتە دەر لەناوتان موساش ﷺ لایکردەوە بەلای گەلەکەیداو هاوایکرد: لەناوتانا پیاوێك هەیە سەرپێچی خو دەکات، باران نابارێت تا نەچێتە دەر لەناومان، پیاوەکەش لەناویاندا خۆی باش دەناسی کاتێ پیاوەکە چاوەڕوان بوو تا کەسێکی تر بچێتە دەر و بەڵکو ئەم نەبێت، بەڵام کەس نەچووە دەرەوە، و پیاوەکە ووتی: پەروەردگارا ئەگەر بچمە دەرەوە ئەوە حەیام دەچێت ئەگەر لەناویشیانا بمێنمەوە ئەوە گەلەکە لە تینواندا دەمرن، پەروەردگارا پەردەپۆشم کە لێم خۆشبە، ئەوە من لە ئێستاوە تەوبەی خۆم ڕادەگەیەنم، بۆیە ئیتر باران باری، موسا ﷺ ووتی: پەروەردگارا باران باری و کەسیش نەهاتە دەرەوە، خوای گەورەش هەواڵی تەوبەی ئەو سەرپێچیکەرەی پێ ڕاگەیاند و فەرمووی: باران باری بە تەوبەکردنی بەندەکەم کە پێشتر سەرپێچی دەکردم، پێشەوامان موساش ﷺ ووتی: پێم نیشان بدە ئەی پەروەردگارە. خوای گەورە فەرمووی: کاتێ سەرپێچی دەکردم نیشانی کەسم نەدا، ئایا ئێستە فەزحی بکەم نیشانتانی بدەم دوای ئەوەی کە تەوبەی کردووە؟!..

ئایا بینیت سەرپێچی پیاوێك خەریك بوو نەتەوەیەك بەهیلاکا بەرێت.. بێگومان خوای گەورە تەوبەکردنی ئێمەی پێخۆشە.. لالانەوەی گوناهکاری پێخۆشە کاتێ داوای لێخۆش بوون و لێبوردن دەکات. وە هەروەها دەگێڕنەوە کە دەشتەکیەك یەت بۆلای پێغەمبەر ﷺ و دەڵێت: گوناهێکم کردووە ئایا خوای گەورە تەوبەکەم قبوڵ دەکات: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەڵێ، ووتی: ئەی ئەگەر گەڕامەوە سەر گوناهەکە، فەرمووی: دەنوسرێت.. ووتی: ئەی ئەگەر تەوبەم کرد، فەرمووی: دەسڕێتەوە.. ووتی: ئەی ئەگەر گەڕامەوە سەر

ـەکە؟ فەرمووی: دەنوسرێت.. ووتی ئەی ئەگەر تەوبەم کرد؟ فەرمووی دەسڕێتەوە..
ووتی: تاکەی هەر دەسڕێتەوە؟ فەرمووی: (إن الله لا يمل من المغفرة حتى يمل العبد من الاستغفار ) (الزبيدى في (إتحاف ساده المتقين (١٧٨/٩)..واته( بێگومان خوای گەورە
ـقەت نابێت لە لێبوردن هەتا بەندەکە بێتاقەت دەبێت لەتەوبەکردن) ..

## مەرجەکانی تەوبەکردن

ئازیزانم مەرجەکانی تەوبەکردن سیانە
١- پەشیمانی لە گوناه
٢- وازهێنان لە گوناهەکە
٣- سور بوون لەسەر نەگەڕانەوە بۆ گوناهەکە...

ئادەم ﷺ کتێك دەرکرا لەبەهەشتا.. خوای گەورە دوا لەگەڵیداو فەرمووی ئەی ئادەم تۆ وەکو چوونی پاشا بۆلای پاشا دەهاتیت بۆلای من، بەڵام ئێستا تۆ بەیت بۆلام وەکو هاتنی بەندە بۆلای پاشا، ئەمە خۆشە بەلای منەوە ئەی ئادەم، گوناهێك بکرێت و تۆش بەزەلیلی بگەڕێیتەوە بۆلامان خۆشەویسترە لەلام لە گوێڕایەڵیەك کە ڕیاکاری تیابێت بۆمان، ئەی ئادەم ناڵەو لالانەوەی گوناهکاران خۆشترە لەلام لە ڕیاکاریی گوێڕایەڵان

## بەزەیی خوا فراوانە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ( ما من عبد يقوم فيتوضا فصلى ركعتين فيحسن ركوعها وسجودها، ثم يسغفر الله تعالى إلا وغفر الله له)... واته :( هیچ بەندەیەك نیە هەستێ و دەست نوێژ بگرێ و دوو ڕکات نوێژ بکات و بە چاکی ڕکوع و سجود بەرێت پاشاند داوای لیبوردن لە خوای گەورە بکات، بێگومان خوای گەورە لێی خۆش دەبێت)
با هەست بەم فەرموودە قودسیە بکەین:( يا أبن ادم انك ما دعوتني و رجوتني غفرت لك على ماكان منك ولا أبالي، يا بن آدم، لو بلغت ذنوبك عناب السماء ثم استغفرني لغفرت لك (الترمذي: ٥٣٤٠)... واته: ( ئەی نەوەی ئادەم پاڕابیتەوە لێم و تکات لێ

کردبم لێت خۆش بووم لەسەر ئەوەی لەسەرت بوەو گوێم نەیاوەتێ، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر گوناهەکانت بگەنە ئاسمان و پاشان داوای لێبوردن بکەیت ئەوا لێت خۆش دەبم)

لە فەرمودەیەکی قودسی تردا دەفەرموێ : ( أذنب عبد ذنبا، فقال: يا رب أذنبت ذ فاغفر، لي، فقال: قد علم عبدي أن له ربا يغفر الذنوب جميعا قد غفرت لعبدي)... واتە بەندەیەك گوناهێکی کرد، ووتی: پەروەردگارا، گوناهێکم کردووە، لێم خۆش فەرمووی: بەندەکەم زانی کە پەروەردگارێکی هەیەو لە هەموو گوناهەکان خۆ دەبێت منیش خۆش بووم لە بەندەکەم)

دەی ئەی خوێنەری خۆشەویست.. تۆبە بکە لە هەموو گوناهەکان و بگەڕێرەوە . لای خوا.. بەگریان و پەشیمانیەوە بگەڕێرەوە بۆ لای .. نەکەی ئیتر سوور بیت لەسە گوناهکردن.. (کەعبی کوڕی مالیك) کاتێ تەوبەکەی خوای گەورەوە وەرگیرا و . قورئاندا دابەزی بۆ پێغەمبەرﷺ پێی ووت: (أبشر بخير يوم مر عليك منذ أن ولتك أمك (البخاری: ٤٤١٨، ومسلم: ٦٩٧٤)... واتە: ( مژدەت لێ بێت بە خێردارترین رۆژ کە بەسەرتا گوزەرا، لەوکاتەوەی کە دایکت تۆی بووە)

کەواتە خێردرارترین رۆژمان ئەو رۆژەیە کە تەوبە دەکەین و خوای گەورە تەوبەکەمان قبولّ دەکت، لە نیاز ڕاستی و سوور بوون لەسەر تەوبە، تەنها ئەوە ماوە کە بلّێم: تەوبە کردن لە مەزنترین و بەهاترینی رۆزیەکانە کە خوای گەورە پێی بەخشیوین هەتا بچینە بەهەشتی پڕ لە رۆزیی لەگەلّ صالّحانی هەلّبژێراودا..

# بەهای کات

## بەهاترین شتە کە خاوەنیتی!

ئەگەر لێت بپرسم: بەهاترین شت لەژیانتدا کە خاوەنی بیت چیە؟ ئەبێ وەڵامی تۆ چی بێت؟؟!! سامان؟ ...منداڵ؟... جوانی؟...زانست؟..... تەندروستی؟.

لەوانەیە.. هەموو ئەو شتانە، بەهادار بن بەڵام بەهادارترین شت نین.. هەموویان یەکسان نین بە هیچ لەبەردەم بەهای کات لە ژیانماندا.

بەڵێ.. بەهاترین شتێ کە خاوەنی بین دوای ئیسلامی بوونمان....کاتە!!.

ئایا هەست بەوە دەکەیت؟ لەوانەیە قسە کردن لەو بارەیەوە هیچ شوێنەوارێ لە دەروونماندا جێ نەهێڵێت.. چونکە ڕانەهاتوین گرنگی بەکات بیەین.. بەڵام... لەگەڵمدا هەنگاو بە هەنگاو وەرە.. ئەوکاتە دەزانیت کارەکە کە لەوە مەترسیدارترە کە گومانی بۆ دەبەیت..

## خێردار ترین نەتەوە

کاتێ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەخوێنیتەوە.. هەست دەکەیت کە خوای گەورە زۆر سوێند بە کات و زەمان دەخوات.. پەروەرگارمان ﷻ سوێند بە شتێ ناخوات ئەگەر بەهادار نەبێت..

وەك ئەوەی خوای گەورە پێت بڵێت: ئاگادار بە بەچی سوێند ئەخۆم... بەکات!..

خوای گەورە بە هەموو دەمەکانی کات سوێند دەخوات: (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى (١)وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى) (الليل :١،٢)...واتە: ( سوێند بە شەو کاتێك کە (زەوی)دادەپۆشێ، وە بە ڕۆژ کاتێ کە ڕووناك دەبێتەوە).. (وَالضُّحَى(١)وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى) (الضحى: ٢٦١)..واتە: ( سوێند بە چێشتەنگاو، وە سوێند بە شەو کاتێك کە ئارام دەگرێ (بزرنگێتەوە) ) ..

(وَالْفَجْرِ(١)وَلَيَالٍ عَشْرٍ) (الفجر:٢،١) واتە: (سوێند بە بەرەبەیان، وە بە دە شەوی سەرەتای مانگی (قوربان) )... (وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا(١)وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاَهَا) (الشمس، ١،٢) ..واتە: سوێند بە خۆرو ڕوناکیەکەی، وە سوێند بە مانگ کە دوا بە دوای ئەو هەڵدێ).. (وَالْعَصْرِ (العصر: ١) واتە (سوێند بەکات و سەردەم). (فَلاَ أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ)(الانشقاق:١٦) وتە (سوێند بە سوری کەناری ئاسمان)..

**بابەتەکە چیە؟!**

دەیەوێ پێت بڵێ: باش تەماشاکەو بیر بکەرەوە بزانە سوێند بەچی دەخۆم.. بەهاترین شتێ کە پێم بەخشیویت.. کاتە!..

وە ئاگاداربە:- (حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ)(الرعد:١١) نەتەوەیك هەست ناکات کە کات بەهاترین شتی ئەوە.. وە ناتوانێ ببێتە نەتەوەیکی مەزن.. وە ناتوانێ لەسەر پێ ی خۆی بوەستێ.. کاتێ ئەم ئایەتە دەخوێنیتەوە (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) (آل عمران: ١١٥) واتە ( ئێوە خێردارترین نەتەوەیەکن کە هەڵبژێرراون بۆ خەڵکی ) دڵمان پارچە پارچە دەبێت بۆ خێردارترین نەتەوە... خێردارترین نەتەوە ئەگەر تەماشای بکەیت.. بە ماندوێتی و بەشەکەتی دەیبینیت...

بەڵام خێردارترین نەتەوەیە بە چی؟. ئەگەر ببێتە خاوەنی ئەو ڕۆزیەی کە خوای گەورە پێ‌ی بەخشیووەو ئەمیش بە پێ‌ی خۆی بەکاکاری دێنێت.. بەوە دەبێتە خێردارترین نەتەوە.. ئایا ئێستە هەست بە بەهای کات دەکەیت؟... ئومێدەوارم!..

## ئاینێکە ڕێز لەکات دەگرێت

خوێنەری بەڕێز ئایا دەزانی هەموو دروشمەکانی ئیسلام پەیوەندیان بەکاتەوە هەیە؟ هەر پێنج نوێژەکە پەیوەستدارن بە چیەوە؟

پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا : (یارسول الله أي ألاعمال أحب إلى الله؟ قال (الصلاة على وقتها) (مسلم: ٢٥٠) واتە ( ئەی پێغەمبەری خوا چ کردارێك خۆشەویسترینە بەلای خواوە؟ فەرمووی ( ئەنجامدانی نوێژ لەکاتی خۆیدا)

گویٚ لـەم ئایەتە پیرۆزە بگرە (إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا ) النساء:١٠٣) واتە: ( بەڕاستی نوێژ، هەمیشە لـەسەر باوەڕداران، فەرزکراوێکی کات بۆ دیاریکراوە)

وە ڕۆژوو گرتن لـە ڕەمەزاندا؟ بەکات دیاری دەکرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ) ( الترمذي: ٦٨٤) واتە: ( بە بینینی مانگ ڕۆژوو بگرن و بە بینینی مانگ بیشکێنن) وە هەروەها ئەم ئایەتەش ئاماژە بەوە دەکات: (أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ) (البقرة: ١٨٤) واتە: ( چەند ڕۆژێکی دیاریکراوی ژمێردراوە، جا هەر کەس لـە ئێوە نەخۆش بووە یان لـەسەفەردا بوو (بە ڕۆژوو نەبوو)، ئەوە پێویستە بەو ئەندازەیە لـە ڕۆژەکانی تردا قەزایان بکاتەوە، وە پێویستە لـەسەر ئەوانەی کە زۆر بەنارەحەتی دەتوانن بەڕۆژوو بن، فیدیەیان لـەسەرە کە خۆراکی هەژارێکە، ئینجا هەر کەسێ زۆرتر بریتی (فیدیە)بدات ئەوە باشترە بۆی، وە ئەگەر بە ڕۆژوو بن بۆ خۆتان باشترە، ئەگەر بزانن)

دەڵێی ئاماژەیە بۆ گرنگی پێدانی کاتی تەواوی ڕەمەزان..چونکە مانگی ڕەمەزان کاتێکی کەمە و دەڕوات.. وە هەروها حەجیش پەیوەستدارە بەکاتەوە: (الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ) (البقره: ١٩٦) واتە:﴿ (کاتی)حەج لـە چەند مانگێکی دیاریکراودایە﴾ واتە دیاریکراو و زانراوە، ئەگەر نەچیتە کێوی عەرەفات لـەکاتی دیاریکراوی خۆیدا (٩)ی (ذوالحجة) ئەوە حەجەکەت لـەدەست چووە، چونکە (حەج عەرەفەیە) وە کاتی وەستان لـەو شوێنەدا زانراوە.

تەنانەت زەکاتی ماڵ و سامان.. پێویستە ساڵێك تێپەڕێت بەسەریدا ئینجا زەکات بدەیت.

هەموو ئەمانە تا بە ئاگابێیتەوە: کە کات زۆر زۆر سەنگین و بەهادارە.. بەبیٚ هودە نەیفەوتێنیت!..

## وەڵامم بەرەوە.. و لە مەبەستەکە تێبگە!

ئایا دەزانیت کە ئەو داهێنانە گرنگەی موسڵمانە پێشینەکان لەسەردەمی گەشەکردندا گرنگیان پێدابوو بریتی بوو لە سەعات؟ وە موسڵمانان سوور بون لەسەری و گەشەیان پێدەداو دایاندەنا لە گۆڕەپانە گشتیەکانداو لە هۆڵی ناوکۆشکەکاندا.. وە زۆر بەهادارو بەنرخ بوو لە دڵیاندا..

بۆچی؟... چونکە ژیانی موسڵمان پەیوەستە بەکاتەوە.. کەواتە ئەم نەتەوە مەزنە چیە ئەی ئێمە بۆ دەبێ وا نەبین؟

هەموو ئیمانداریکی پابەند بەشەرعی پەروەردگاریەوە پێویستە رێز لە گرنگی کات بگرێت لە ژیانیاندا.. گوێ لەم چیرۆکە بگرە: لە نێوان من بیانیەکدا مەوعیدێ هەبوو، من کەمێك دواکەوتم لە مەوعیدەکە.. کاتێ پێی گەشتم، لێی پرسیم ئایا تۆ موسڵمانیت؟ ووتم: بەڵێ!.. ووتی: ئایا نوێژ دەکەیت؟ وتم: بەڵێ! ووتی : ئایا رۆژوو دەگریت؟ وتم بەڵێ! ووتی: ئایا حەجت کردووە؟ وتم: بێگومان! ووتی: ئایا نوێژی جومعە لەکاتی خۆید دەکەیت؟ ووتم بەڵێ، بێگومان!..

لەوکاتەدا ووتی: موسڵمانان زۆر سەیرن، ئاینەکەیان فێری کاروباری مەزنیان دەکات. بەڵام ئەوان لاناکەنەوە بەلای گرنگی ئەو کارانەدا، وەك ئەوەی هەموو ناخی هەژاندبێت. وەك ئەوەی پێی ووتبم: تۆ کەسێکی دیندار نیت، چونکە بەهای کات نازانیت.. هەستم کرد تۆمەتبارم دەکات، چونکە ئاینەکەم فێری ئەوەم دەکات!.. ئیتر بۆچی پابەند نەبم؟

ئایا تۆ لە ژیانتدا هەستت بە گرنگی و بەهای کات کردووە؟!.. باشە.. ئایا تۆ دینداریت؟!.. وەڵامی ئەم پرسیارە بەرەوە دای ئەوەی تەماشای بەهای کات دەکەیت لای خۆت!!

## ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُمْ﴾ !(ئایا تەمەن و کاتمان پێ نەیان)

ئایا پێشتر بیرت لەوە کردووەتەوە کە بەڵگە هێنانەوە لەسەر نەوەی ئادەم لە رۆژی قیامەتا هەر پەیوەنید بەکاتەوە هەیە؟!.. ئایا بەڵگەت دەوێ؟.. کەواتە گوێبگرە بزانە خوای گەورە چی دەڵێ بەکافرەکان کاتێ کە دەڵێن: پەروەردگارا نەزان بووین و لە بیرمان چوو..

دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَنْ تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ نَصِيرٍ﴾ (فاطر: ٣٧) .. واتە ( ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن، ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێ بیرکاتەوە تیایدا بیر بکاتەوە، وە ترسێنەرتان بۆ نەهات، دەی (ئەو سزا) بچەژن چونکە هیچ یاریدەرێك بۆ(بێباوەڕ) ستەمکاران نیە) ئێمە تەمەن و کاتیشمان پێدان.. ئایا گوێت لێیە؟ ناوی ناون زاڵمەکان.. زوڵمیان لە خۆیانکرد و کاتێ تەمەنیان فەوتاندو سودیان لەکاتەکانیان نەبینی.

## لاویتیت بەچی گوزەراند

گوێ لەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگرەو بەباشی ڕابمێنە لێ ی: ( لا تزول قدم ابن آدم يوم القيامة من عند ربه حتى يسأل عن خمس: عن عمره فيما أفناه، وعن شبابه فيما أبلاه، وعن ماله من اين اكتسبه وفيما أنفقه، وماذا عمل فيما علم )(الترمذي:٢٤١٦).. واتە: ( دوو پێ ی نەوەی ئادەم لە ڕۆژی قیامەتا لەبەردەم خوادا ناجوڵێت تا پرسیاری پێنج شتی لێ نەکرێت: تەمەنی بەچی تەواو کرد؟ وە لاوێتی بەچی بەسەر برد، وە ماڵەکەی چۆن پەیدا کردو لە چیدا خەرجی کرد، وە چ کارێکی بە زانیاریەکانی خۆی کرد)

تەماشاکە چۆن قۆناغی لاوێتی تایبەتمەند کردوە. هەرچەندە هەر بەو تەمەنەش کە پرسیاری یەکەمی لێکردووە.. بەڵام قۆناغێکە حسابی تایبەتی خۆیی هەیە.. بەدرێژی:

فلان ڕۆژ کاتت بەچی بەسەربرد؟ کاتێ سەعات (٤)ی بەیانی بوو خەیاڵت بەلای چیدا ئەچوو بەبێ ئامانج، و کەناڵەکانی تەلەفزیۆنت دەگۆڕی.. چیت دەکرد لەوکاتەدا؟ وەکاتێ گۆڤارەکەت گرت بەدەستەوەو سێ سەعات دانیشتیت قسەی بەتاڵ و بابەتی بێ ئەرزشت دەخوێندەوە، چیت دەکرد؟! ئەی لاو کاتێك سواری ئۆتۆمبێلەکەت بوویت و بەشەقامەکاندا بەبێ هودە دەسوڕایتەوە.. تا بەیانی.. چیت دەکرد؟!..

لێپرسینەوەیەکە بەدرێژی..

بەڵام... ئایا ئەمە نەتەوەی محمدە ﷺ ؟ ئایا ئەمە ئەوکاتەیە کە خوای گەورە سوێندی پێ دەخوات.. و لەڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەر دەکات؟

ووێنای ئەندازەی ووردەکاری بکە لە حسابدا: موحاسەبە دەکرێیت لەسەر هەمو خولەکێك!.. نەخێر.. نەك هەموو خولەکێك.. بەڵکو لەسەر هەموو هەناسەیەك کە هەڵ دەمژیت!..

تەمەن بریتیە لە کۆمەڵێ ساڵ.. ساڵەکانیش دابەشکراون بەسەر ڕۆژەکاند ڕۆژەکانیش بەسەر سەعاتەکاندا.. سەعاتەکانیش بەسەر خولەکەکاندا.. خولەکەکانیش بەسەر هەناسەکاندا!..

ووێنای بکە، ئەگەر هەموو هەناسەیەك کە دەچێتە سنگتەوە بریتی بێت لە سنوقێك پێویستە پڕی بکەیت.. یان هەموو هەناسەیەك کە دەردەچێت خەزێنەیەکی داخراو بێت ڕۆژی قیامەتیش خەزێنەکانی تەمەنت دەکرێتەوە: یەکەم: خاڵیە!.. دووەم:خاڵیە... سێیەم قسەی ناشرینی تیایە... چوارەم: گرنگیپێدانی بێ ئەرزشی تیایە!... پێنجەم: خاڵیە!!.

پاشان. ئای کەدڵخۆشیت! خەزێنە پڕەکان دەرکەوتن: هاە! نیوسەعات هەزار هەناسەی تێدایە، هەزار خەزێنە ئامادە بوونی وانەیەکی تێدایە، پاشان نوێژ کردن بە کۆمەڵ .. کارێکی مەزنە.. هەزار.. زیکری خوای تیایە.. زۆر باشە..هەزار.. کاری دڵسۆزی تیایە کە خزمەتی ئاینەکەتت پێ کردووە. ئای کە چەندە دڵخۆشیت!.. پاشان.. خاڵیە. خاڵیە! ئەوە ئەو تەمەنەیە کە لێپرسینەوە دەکرێیت لەسەری.. ئایا زانیت کە زۆرترینی ڕۆژیە کە تۆ خاوەنی بیت

ئێستا هەڵبژێرە.. دەتەوێ خەزێنەکانی تەمەنت بەچی پڕ بکەیتەوە؟ دەتەوێ سەرمایەی خۆت لەژیانتدا لەچیدا خەرج بکەیت.. بەڵام بزانە.. هیچ نارەحەتیە ناگاتەوە بەنارەحەتی حەسرەتدا.. وەك ئەو کەسە مەبە شتێکی بەنرخ بفرۆشێ بە شتێکی بێ نرخ!!..

وە ئاگاداری شتێکبە.. من دەمەوێ هەوڵێك بیەم تا چەمکی کات و گرنگیەکەی لە ژیانماندات بۆ ڕوون بکەمەوە.. لەکاتێکدا دەبینین ئەمە گرنگ نیە لەجیهانی ڕۆژئاوا چونکە ئەوان زۆر بەتەواوی کاتەکانیان قۆزتوەتەوە و سوودیان لێ بینیوە.. چونکە ئەم مانایە بەتەواوی لەبیرو هۆشی خەڵکی ڕۆژئاوادا چەسپیوە.. لەبەر ئەوە پێشی ئێمەیان داوەتەوە.. بەڵام هێشتا کات لای ئێمە هیچ بەهایەکی نیە.. لەکاتێکدا کات بریتیە لە ژیان!!..

## ئەگەر هەندێ لەکاتت لەدەست چووە.. با هەموویت لەدەست نەچێت!

ئەگەر مرۆڤێکت بینی و هەزار جونەیهی پێ بوو.. و فڕێ ی دایە ناو دەریاوە!.. چی پێ دەڵێیت؟!.. ئەو کەسەش تەمەنی و هەناسەکانی دەفەوتێنێ بەبێ سود وەك ئەو پیاوە وایە!.. لەبەر ئەوە..حەسەنی بەصری ووتەیەکی جوانی هەیە.. دەتوانیت هەموو بەیانیەك بیخەیتە پێش چاوت دەڵێ:( لەگەڵ هەموو خۆرهەڵهاتنێکدا ئەو ڕۆژە بانگ دەکات ئەی نەوەی ئادەم، من ڕۆژێکی نوێم شایەتم لەسەر کردەوەکانت.. بمقۆزەرەوەو سودم لێ ببینە.. ئەگەر لە دەستت چووم تا قیامەت ناگەڕێمەوە). تابیعیەکی بەڕێزیش دەڵێ : (ئەی نەوەی ئادەم.. بێگومان تۆ بریتیت لە هەناسەکان و ڕۆژەکان.. ئەگەر ساتەکەت و ڕۆژەکەت ڕۆشت ئەوە بێگومان هەندێکیانت لەدەست چووە و ئەگەری ئەوە هەیە ئەگەر هەندێك بفەوتێت.. بێتە هۆی فەوتانی هەمووی)

کەواتە کات بریتیە لە ژیانت.. ژیانیشت ئەو هەناسانەیە کە دێنە دەرەوە لە سنگت..

سوێندت ئەیەم بە خوا.. سووربە لەسەر قوزتنەوەو سود لێبینینی کاتەکانت..

نەکەی بچیتە گۆڕەکەتەوەو ڕصیدێکی باشت نەبێ لە کردەوەی چاك کە چاوەڕوانت بێ.. وە ئەگەر نا!.....

## وردەکارترین پێوەر

زۆر گرنگە.. بەو شێوەیە بژیت ئاگاداری هەموو هەناسەیەکت بیت کە دەردەچێت.. و هەموو ساتێك کە تێدەپەڕێ لە تەمەنت.. (إبن القیم) دەڵێ: (هەموو هەناسەیەك و هەموو ئارەق ڕشتنێك کە دەردەچێت بۆ غەیری گوێڕایەڵی خوا یان سودێك لە ژیاندا.. ئەوە لە ڕۆژی قیامەتا ئەو هەناسەیە بەو پەشیمانی و حەسرەتەوە دەرچووە)!

**هەموو هەناسەیەك؟.. ووشەیەکی ترسناکە**

هەموو هەناسەیەك بۆ شتێ نەهاتبێتە دەر کە ڕەزامەندی خوای تیا بێت یان سوودی خێزانەکەت یان وولاتەکەت یان کۆمەڵگاکەت.. ئەوە ئەو هەناسەیە بە حەسرەت و پەشیمانیەوە دەرچووە.

برای ئازیزم.. ئەمە مەسەلەیەکی ئیمانیە، پێویستە لەسەرمان گرنگیەکی زۆری پێ بدەین.. گرنگیدانت بەکات بریتیە لە کاروباری بەندایەتیت بۆ خوا.. لەبەر ئەوە گوێگر؛ بزانە زانایان لەو بارەیەوە چی دەڵێن: ( لە نیشانەکانی غەزەب و قینی خوا بۆ بەندەکەی کات فەوتاندنە... وە لە نیشانەکانی خۆشەویستی و ڕەزامەندی خوا بۆ بەندەکەی: ئەوەیە ئیش و کارە (بەسودەکان)ی زیاتر بێت لەکاتەکانی.. واتە: تۆ چاوت نوقاندووەو لە شوێنی خۆتا دانیشتوویت.. و دەتەوێ ڕقی خوا یان ڕەزامەندی خوا بزانیت لەسەرت: تەماشاکە ئایا کاتەکانت فەوتاندووە یان سودیان لێ دەبینیت لەکاری چاکەدا؟ ئەگەر بۆت دەرکەوت کارەکانت زیاترن لەکاتەکانت ئەوە خوای گەورە خۆشی دەوێیت! ئاخ و ئۆف مەکە لەوەی یان بڵێیت: ژیانێکی نارەحەت.. و ماندووکەرە! نەخێر.. چەندە کاروبارەکانت زۆر بێت ئەوەندە دڵخۆشبە پێیان.. و پەروەردگارمان ڕازیە لێت!

بەڵام ساتێك چاوەڕوانبە.. ئیش و کارە بەسوودەکان.. کاتەکانت پڕیەتی لە ئیش و کار کە نیەتەکان دیاریان دەکەن: لە پێناوی ئاینەکەمدا و لە پێناوی نەتەکەمدا و لە پێناوی کۆمەڵگاکەم و وولاتەکەمدا.. ئەمە پێوەرێکی زۆر ووردەکارە بۆ ڕازیبوون و غەزەبی خوای گەورە..

## لاوێتی + بەتاڵی(بۆشایی)= سەرەتای تاوان و سەرپێچی

ئەگەر بەتاڵی پشکی زۆری هەبێت لەکاتەکانتدا.. ئەوە ئاگاداری ئەو مەترسیە بە!. چونکە سەرپێچیکردن لە بەتاڵیەوە سەرهەڵدەدات.. سەرەتای سەرپێچیکردن: لاوێتی وکاتی بەتاڵیە!

خێزانی عەزیزی میسر بۆیە وویستی یوسف ﷺ بەرەو خراپە بەرێت چونکە–ژنانی شار بەتاڵ بوون.

بەهای ڕابواردن بەکات لەم ئایەتەدا جوان دیارە : (بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتْ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ) (یوسف: ٣١) واتە (ناردی بەدوایاندا، ئامادەی کرد بۆیان شوێنی (خۆشی دانیشتن و) شان دادان، وە هەریەك لەوان چەقۆیەکی پێدان (بۆ میوە لەتکرد)، ئەوسا ووتی: (یوسف) وەرە بۆ ناویان (با بتبینن) )

وێنای ئەو کاتە بکە کە بەسەری بردووە!!.. ئایا هەموو ئەوانە لە ئەنجامی بەتاڵیەوە سەرچاوەیان نەگرتووە؟! کەسانێکی بەتاڵ و بێکار.. گوناهیش زاڵ دەبێ بەسەریاندا! بەتایبەتی کچان.. ترسی زۆرمان هەیە لە کچان کاتێ کە بەتاڵن و بێکارن ئایا دەتەوێ وێنەیەك لە بەتاڵی و بێکاری نەتەوەی پێشەوامان محمد ﷺ ت لەم سەردەمەماندا پیشاندەم؟ ئەو نەتەوەیەی خوای گەورە سوێندی بۆ دەخوات بەکات.. پەرستشەکانی پەیوەندیدارن بەکاتەوە.. خەڵکەکەی ناچنە بەهەشتەوە یان دۆزەخ تەنها بە بەهای کات نەبێت؟

پێمان ناخۆشە وا دەڵێین، بەڵام ئەوەیە واقیعە تاڵەکە:

لاوێك (١٢) سەعات دەخەوێت.. و بانگ لە دایکی دەکات: (کەس خەبەرم نەکاتەوە)خۆم بەشێنەیی هەڵدەستم.. هیچ کارێکم نیە پێ ی هەستم!)

وانەی زانکۆش؟!.. ناچم بۆ وانەی یەکەم! کورسیەکان بە چۆڵی دەمێنێتەوە.. و لاوانیش لەدەرەوەی هۆڵەکەن و چایی دەخۆنەوەو قسەدەکەن!.. هێشتا کچانیش چەندین سەعات لەبەردەم ئاوێنەدا بەسەردەبن بۆ چاکردنی میکیاج و خۆ ڕازاندنەوەو جل لەبەر کردن.. ژنانیش چەندین سەعات خۆیان لە گەڕان بەناو بازاڕو دوکانەکان و بینینیاندا بەسەر دەبەن.. کێ منداڵەکانت پەروەردە بکات؟.. ئەو خزمەتکارەی لەماڵەوەیە!.. گرنگ نیە ئەو خزمەتکارە چۆن پەروەردەیانکات و چی بچێنێ تیایاندا!.. ئافرەتانێکیش کاتەکانیان بەسەر دەبەن لە یانەکاندا بەبێ سود.. ئەمە بێجگە لە قسە کردنەکانی مۆبایل و تەلەفۆن لە نیوەشەودا لە نێوان کچ و کوڕی فەوتاودا.. قسانێك دەکەن کە هیچ بەهایەکی نیە (کۆمپانیاکانی مۆبایلیش بەتایبەتی لە کوردستان نرخی قسە کردنەکانی نیوەشەو هەرزان دەکەن خەریکە دەیکەن بە خۆڕایی و بە بێ بەرامبەر، ئایا هەرزانکردنی قسەکانی نیوەشەو

خزمەت بە چ توێژێکی ئەم میللەتە دەکات بێجگە لە هەرزەکاران و لاوانمان..
فەرمانبەرەکانیش کاتێ دەچن بۆ فەرمانگە دوا دەکەون..
ئایا دەزانیت لە کۆمپانیاکاندا ئێستا فەرمانبەر ١٥ خولەك لەرۆژێکدا کار دەکات؟ هەقی هەشت سەعات کار کردن وەردەگریت، لەکاتێکدا پێویستە پارەی تەنها (١٥ خولەك وەربگریت!!..
ئەمە چیە؟ ئەمە چیە ئەی ئومەتی محمد ﷺ ! تەمەن دەفەوتێت. بەلاَم نەك تەنها تەمەنی خۆت دەفەوتێت.. بەلَکو تەمەنی هەموو ئەم نەتەوەیە. و لە رۆژی قیامەتیشدا خۆت دەفەوتێنیت!..

## تاکات بەسەر نەچووە!

ئایا دەبێ چەنێك لەکات فەوتابێت، کە دەمانتوانی لەو کاتانەدا چاك بین لەگەلَ باوك و دایکماندا، وە تەنانەت ئەگەر بە ئاگا هاتبینەوە.. ئەوان لە ژیان دەرچوو بوون. پەشیمان دەبین چونکە کاتێ کە لە ژیاندا بوون چاك نەبوین لەگەلَیاندا..
جارێکیان پیرە مێردێکم لە مزگەوتا بینی.. لاوان بەدەوریەوە بوون. تەماشایەکی کردو دەستی کرد بە گریان..
لێم پرسی: مامەگیان بۆچی دەگریت؟.. بە حەسرەت و پەشیمانیەوە کە بە دەنگیدا دیار بوو، ووتی: خۆم رانەهێنا لەسەر هات و چۆی مزگەوت و نوێژ تا تابەسالاَ نەچووم. بۆیە تەماشای ئەم لاوانەم کرد بە دەورمدا و گریام چونکە تەمەنی خۆمم فەوتاند و پێشتر نوێژم نەدەکرد.. ئای بۆ دلَخۆشی ئەوان!..
ئەبێ چەند ئافرەت کە بەسالاَ چووبن ئینجا بالاَیان پۆشی بێت.. و تەمەنیش بەسەر چووبێت. ئەی کەسی دیندار، ئەبێ چەند کەس بە حەیرانی و فەوتاوی مابنەوەو تۆش دەت توانی دەستیان بگریت و رێ نیشاندەریان بیت، و ئەو کارەت نەکردوە؟ و تەمەلَیت هەلَبژاردووە و کاتیش فەوتاوە.. ئەم نەتەوەیەش بوو بە ئامانجی تیری دوژمنانی بە هۆی ئەو هەموو دیندارە تەمەلاَنە و.. پیاوچاکە بە هیلاکا چوانە.. و خواپەرستە یارییێکراوانە!..

ئەوەی ئەمڕۆ ڕوو دەدات بەسەر ئەم نەتەوەیەدا لە قەیرانەکان، ئامانجێکی سروشتیە بۆ ...ەوەیەك كاتی فەوتێنراوەو فەوتاندویەتی.. ئێمە دەمانەوێ زۆر ترین ژمارەی بێئاگایان و ...وان بە ئاگا بێنینەوە!.. چونکە کات تەنها موڵکی ئێمە نیە... موڵکی نەتەوەیکە ...ەکی لە تۆ دەوێت.. ئەگەر لەسەر ئەو بێئاگاییەماینەوە، ئەوە چارەنوسێکمان دەبێت ...ە خوازیاری نین..

پرسیار لە هەموو ئەو کەسانە دەکەیت کە ئەگەر تەمبەڵ نەبن لەوانەیە بەئاگا بێنەوە..

## ئایا کاتت دەکوژیت؟! ئەوە تاوانە!

کات فەوتاندن تاوانە!.. ئایا ئەوە دەزانیت؟..

ئەو کەسانەی کاتەکانیان دەکوژن.. ئەوانە لە چایخانەو قاوەخانەکاندا دادەنیشن و ...میان نیە بێجگە لە (چاو نێرگەلە) و....! ئەم نەتەوەیە لە خەتەردایە و تۆش ... نیشتوی؟!.

ئەگەر لێشی بپرسیت چی دەکات؟ پێت دەڵێ: کات دەکوژم.. ئایا واناڵێت؟!.

ئەو داماوە نازانێت کە بێگومان خۆی دەکوژێت(نەك کات)!.. ئەوە خۆکوشتنێکی هێواشە..

بەڵام بەداخەوە کەس سزا نادرێت لەسەری!..

...وێنای بکە ئەم نەتەوەیە سوود لە دەیەکی کاتی وەردەگرێت.. وەك ئەوەی بە چارەکی ...سی)یەکانمان هەناسە بدەین!.. وەك ئەوەی نەتەوەیەك بین جگەرمان لەکار کەوتبێت!.. ...بێ جوڵە!.. بەڵێ .. ئەمە خراپترین تاوانە... لەبەر ئەوە بیانیەکی چالاك یەت و سوود وەردەگرێت لە خێروبێرمان و بەباشی دەیقۆزێتەوە.. یەت و کۆمپانیایەك دەکاتەوەو خێرو بێری وولاتمان دەبات.. بێگومان!... چونکە خاوەن ماڵ خەوتووە.. و دەرگاش کراوەتەوە..

دەبێ هەست بە مەترسی فەوتانی کاتەکانمان بکەین.. ئەگەر خەبەرمان نەبێتەوە لەو ...بوونەمان کە درێژەی کێشاوە، گرنگی بەهەموو شتێکی ئەم نەتەوەیەمان نەیەین.. ئەوە زیانەکانمان زیاد دەکات..

وه توشی شتانێك دەبین كه نایخوازین و ڕۆژێ لـه ڕۆژان نەهاتووه بەخەیاڵماندا.. (إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ) (الرعد:١١) ....واته: ( بەڕاستی خوا (بارو حاڵی) هیچ گەلێك ناگۆڕێ، هەتا ئەوان خۆیان (بارو حاڵی) خۆیان نەگۆڕن وه كاتێ كەخوا بیەوێ هۆزێك تووشی بەلاّ بن، هیچ بەرگرێكی بۆ نیه، و جگه لـەو (خوا)هیچ یارمەتیدەرێك و پشتوانێكیان نیه) ئەگەر هەست بەوه نەكەین كه كات زۆر بەهاداره.. وه ئەو خولـەكەی تێدەپەڕێت، ئەگەر موسڵمان نەگەڕێتەوەبۆ ئاینەكەی.. ئەگەر هانی بەرهەمهێنانێكی ناوخۆی نوێ نەیات.. ئەگەر كۆمپانیایەكی سەركەوتوی نوێ بنیات نەنێ.. ئەگەر تیایدا لاوان فێر نەبن و بەزانست خۆیان پڕ چەك نەكەن.. ئەگەر ئەمانه ڕوونەیەن.. ئەوه هەتا سەد ساڵی تریش سەركەوتن ئەستەمه...

ئەی موسڵمانان سەد ساڵی تر چاوەڕوان بن مادام بێئاگان لـه گرنگی و بەهای كات.. خەبەرت بێتەوه.. و هەست بكەیت كه ئەو خولـەكه چەند بەهاداره لـه ژیانتدا.. و لـەناخی خۆتا بڕیار بدەیت نایەڵی بەبێ هوده بڕوات.

## چی زۆر گرنگه بەلاتەوه

لـەبەردەممدا ڕووداوێك ڕوویدا هێنامیه گریان، چونكه پڕ بوو لـه مانای بریندارکەرو ناخۆش بۆ هەر كەسێ كه كات و فیكری سەرقاڵ بكات به شتێكەوه.. كه پێویست وایه گرنگی بەكارێك بدات خزمەت به دۆزی گشتی موسڵمانان بكات..دوو لاوەكه لـه زانایەكیان پرسی:(ئایا دروسته عەورەتی یاریزانان لـەكاتی یاری تۆپی پێدا دەركەوێت؟...)

ئاگاداربه.. ئەمه پەراوێز كردنی مەسەلـەیەكی فیقهی یان ئاینی نیه.. بەڵكو بەدڵنیاییەوه سووربوونه لـەسەر ڕێزگرتنی ئەولـەویات (كارەگرنگەكان) لـه ژیانماندا و كامەیان زۆرتر گرنگه بۆ ئیسلام و موسڵمانان زاناكەش وەلاّمێكی پڕ پێستی دایەوه، ( ئەوەی كه من دەیزانم ئەوەیه كه ئیسلام دەیان ساڵه عەورەتی دەركەوتووه، كەسیش ڕاناچڵەكێ بۆی یان بەئاگانایەتەوه)

دەگەڕێمەوەو دەڵێم: ئەوە پەراوێز کردنی مەسەلەیەك نیە لە مەسەلەکانی ئیسلام...
ـکو مەسەلەی گرنگی دانە بە گرنگ و بەگرنگتر
دەی..هەستە.. بەئاگا بێرەوە... کار بۆ ئاینەکەت بکە... تۆبە بکەو ژیانت و دنیات
ـیێ بکەرەوە... و تەمەنت و کاتت و ئاینت و ژیانت مەفەوتێنە..

## ـەنگاییەکی سەیر

تەماشای بەئاگایی موسڵمانانی پێشوومان بکە.. چۆن ئەم نەتەوەیە گەیشتنە ترۆپکی حیهان.. کاتێ کە کاتەکانی خۆیان قۆزتەوە.. ژمێریارێك دەڵێت: ( بەخوا، ئەگەر کات بە ـ‌ڕە بکڕدرایە، ئەوە هەموو سەروەت و سامانم بۆ خەرج دەکرد و کاتم پێ دەکڕی تا حزمەت بە موسڵمانان بکەم)
ـوتیان : لە کێت دەکڕی؟
ـوتی: (لە بێکارو بەتاڵەکان!..)
خوا پشت و پەنات بێ ژمێریاری بەڕێز!... ئەو بیرۆکە جوانەت لە کوێوە بۆ هات؟!..
ئەی بۆچی تۆ بیرو بۆچونی مەبەستدارو بەسوورد نایەت بەخەیاڵتدا و کای خۆتی پێ دەوڵەمەند بکەیت؟
.. دەی .. هەستەو شتێ بکە... بجوڵێ..
ئەی تۆ خاتوونی بەڕێز کە هەموو هەوڵێکت ئەوەیە تەماشای تەلەفزیۆن بکەیت و شۆفێری بکەیت.. ئایا دروستە شتی وا؟!
تۆ لە نەتەوەی محمدیت ﷺ و ئەوە بکەیت؟ بیر بکەرەوە.. بیر لە دەروازەیەك بکەرەوە کە بەهۆیەوە خزمەت بە ئاینەکەت و کۆمەڵگاکەت بکەیت و بەهۆیەوە سوود لە تەمەنت و کاتت وەربگریت.. وە زۆر لە خوا بپاڕێرەوەو تا ئەو کارەت بۆ ئاسانکات.. برۆ فێری زمانێك ببە.. کتێبێك بخوێنەرەوە.. هەر شتێك .. بەڵام بەبێ ئامانج کاتت بەفیڕۆ مەدە.. سەرسام بووم بەلاوێك.. دکتۆر بوو.. کەسێکی زۆر سەرقاڵ بوو.. پرسیاری تەفسیرێکی لێ کردم، منیش ووتم: کتێبێکی گەورە هەیە، بەڵام زۆر جوانە، ئەویش تەفسیری

(في ظِلال القُرآن)ی (سَید قُطْب)ە.. دوای چوار ڕۆژ کە بینیمەوە زۆر سەر سام بووم کاتێک کە ووتی: بەرگی یەکەمیم خوێندەوە!

پێم ووت : بەڕاستە؟

ووتی: بێگومان!.. بینیم زیاتر فێر دەبم و زیاتر و زیاتر قورئانەکەمم خۆش دەوێت..

ئەو لاوە زۆر سەرقاڵە کاتی دانابوو کە لەمیانیەوە ئاشنا ببێت بە کتێبە پیرۆزەکەمان ک قورئانی مەزنە.. ئایا ناتوانی سوود لەکاتەکانت و بەتاڵی کارەکەت وەربگریت؟!..

## وویست و خواستێك... وەك شاخەكان بەرزن

ئایا دەزانیت نوسەران و دانەران وەستان لە نوسینی کتێب، چونکە کەسیان شت نەدەبرد بخوێنێتەوە؟.. چونکە خەڵکی کاتیان بە فیڕۆ دەدەن لە خوێندنەوەی شتانێکی ‌ی مانادا: فلان ئافرەت چۆن قژی دادەهێنێت.. فلان ئافرەت چۆن پۆشاك دەپۆشێ. فلان چۆ دەڕوا بەرێوە، ئەوانە گرنگ نین بەلامانەوە؟ چۆن حەز دەکات باوا قژی داهێنێ!.. ئێمە بەهای کەس کەم ناکەینەوە.. بەڵام ئەوە مەسەلەیەك نیە.. دۆزی ئێمە زۆر لەوە گەور ترە..

ئەبێ چەند پارچە زەوی بێ بەرهەم بوو بن بەهۆی لاوێکی خەوتوو و خواست ویستێکی تەمەڵەوە؟..

ئەبێ چەند کۆمپانیا ئیفلاسی کردبێت بەهۆی فەرمانبەرانێکەوە کە کاریان نەدەکرد؟!.

لەبەرامبەریشدا.. تەماشای لاپەڕە گەشاوەکانی مێژوومان بکە کە چەند خواست خەمیان گەورە بووە بۆ سوود وەرگرتن لەکات و لە نەوەکانی پێشوومان..

ئەوە تا زانای بەناوبانگ (إبن الجوزی)پیاوێك دەیوەستێنێ و پێی دەڵێ: وەرە با پێکە چەند قسەو باسێ بکەین(دەمە تەقێ بکەین)ئەویش ووتی: کەواتە خۆر بوەستێنە!!..

(إبن عقیل) کتێبیکی زەبەلاحی نوسیوە ناوی کتێبی (الفنون)ە پێکهاتووە لە (٨٠٠ بەرگ.. کە بەڕاستی گەورەترین کتێبە کە لە ئادەم-علیه السلام-ەوە دانرابێت-إنشا الله- هەتا قیامەت.

إبن عقيل –رحمه الله– ووتی:(من ئێستا تەمەنم هەشتا ساڵە، خاوەن خواست و ویست و عەزیمەتم و سوود لەکات وەردەگرم و وا دەزانم تەمەنم بیست ساڵە)

دەیوت: (من وەکو ئێوە نان ناخۆم) واتە: کاتم نیە تا وەك ئێوە نان بخۆم..

وتیان: چۆن نان دەخۆیت؟

وتی: (ئاو دەکەم بەسەر کێکەکەدا تا دەبێت بە هەویر، دوایی بەپەلە دەیخۆم تاکاتم بەفیڕۆ نەچێت)! بەهۆی ئەوەوە ئەم نەتەوەیە لەسەر پێی خۆی وەستاو سەدان ساڵ درێژەی کێشاو سەرەرایەتی نەتەوەکانی کردووە، تاریکستانی ئەوانی ڕووناك کردەوە.. لەوانەیە بڵێیت: ئەوە هەمووی سروشتەوەیە!.. کێ وا دەکات..

باشە.. وامەکە.. بەڵام ٤ سەعات دامەنیشە بۆ نان خواردن لە چێشتخانەدا!.. هەموو ڕۆژێ لاوان دەچنە دەرەوە بۆ چێتخانەکان بۆ نانی نیوەڕۆ و ئێوارە.، ٤ سەعات دادەنیشن بە نیازی نان خواردن! دەشڵێن بێگومان ئەم نەتەوەیە سەردەکەوێت؟! نەتەوەی وا چۆن سەردەکەوێت ئەگەر خواردنی هەموو خواست ویستێك بێت؟ ئایا ئەو کاتانەی لەوێ بەسەری دەبەیت دەتوانیت جۆگە هەڵکەنیت و باڵەخانە بنیات بنێیت و نەخوێندەوارێك فێر بکەیت کە چۆن قورئان بخوێنێتەوە!..

## تەمەنانێکی پیرۆز

کەسانێك هەن کەم دەژین.. بەڵام مێژوو سەدان ساڵ هەر باسیان دەکات.. کەسانێکیش هەن دێنە ژیانەوەو دەڕۆن.. ناویان لە فایلی مێژوودا دەسڕێتەوە.

بەهای تەمەن ساڵانێکی درێژ نیە وك هەندێك وا گومان دەبەن.. بەهای تەمەن بەو کارە گەورانەیە کە مرۆڤەکە پێی هەڵدەستێ.. پێشەوامان (ئوسامەی کوڕی زەید) ﷺ سەرۆکایەتی سوپایەکی دەکرد و تەمەنیشی (١٦)ساڵ بوو.. هەموو سوپایەك نا. سوپایەك هاوەڵانی پێغەمبەری تێدابوو.. پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دەفەرموێ (وإن كان لخليقا للإمارة) (البخاري:٤٤٦٩) واتە: لایەقیەتی و توانای هەیە بەسەریدا..

ئەوەش (محمد الفاتح)ە.. شارێکی فەتح کرد کە زۆر سەخت بوو بەلای موسڵمانانەوە.. شاری (قوستەنتینیە–ئەستانبوڵی ئێستا) تەمەنیشی (٢٣)ساڵ بووا وە پێشەوامان (سەعدی

کوڕی مەعاز) کاتێ موسڵمان بوو تەمەنی (٣٠)ساڵ بوو.. کاتێکیش وەفاتیکرد(٣٧) ساڵ بوو.. پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی: (إهتزت عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ) (مسلم: ٦٢٩٥، الترمذي:٣٨٤٨) واتە: (عەرشی خوای گەورە بەهۆی مردنی سەعدی کوڕی مەعازەوە هاتە لەرزین).. لەکاتی هەڵگرتندا جەنازەکەی سووك بوو .. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (إن الملائكة كانتْ تَحْمِلُهُ)(الترمذی:٣٨٤٩) واتە ( فریشتەکان جەنازەکەی ئەویان هەڵگرتبوو)..

ئاه ئەی سەعد ژیانێکی فەرو بەرەکەتت هەبوو.. لەو حەوت ساڵەدا چیت کرد تا گەشتیت بەو پلەو پایە؟ بێگوماس سوودی لە هەموو کاتەکانی بینیوە و هیچ ساتێکی نەفەوتاندووە بۆ غەیری خزمەتکردن بە ئاینی خوای گەورە.. ئیمامی نەوەوی-ڕەحمەتی خوای لێ بێت-دانەری کتێبی (رِياضُ الصالِحِين) کاتێ وەفاتیکرد تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو.. ژنی نەهێنابوو.. دەیان ووت: بەهۆی سەرقاڵیەوە بەزانستەوە ژنی نەهێناوە..ئایا دەزانی چەند کتێبی داناوە؟ ٥٠٠ کتێب

ئایا دەزانی ئیمامی نەوەوی چۆن نانی خواردووە؟ دەڵێ : (وەڵڵاهی نان ناخۆم و ناخەوم تا نەکەوم!)

کاتی نەبووە بۆ ئەوە.. هەتا دایکی پێی دەڵێ: کوڕی خۆم.. خواردنم بۆ ئامادە کردوویت.. ئەویش دەڵێ: دایکە.. سەرقاڵم بە زانستەوە.. دایکی دەڵێ: خواردنەکەم ئەهێناو ئەمیا پێ‌ی و بەخۆی نەئەزانی.. بانگی بەیانی لەکارەکانی تەواو دەبوو، دەیوت: دایکە.. کوا خواردنەکە؟ منیش پێم دەوت: خواردنم یایتێ کوڕی خۆم، ئەویش دەیویت: بەخوا سەرقاڵ بووم!

ئەوەیە ئوممەتی (محمد) ﷺ کە سەرکەوتن دادەبەزێت بۆی.. بەو نموونانەوە نەتەوەکان دەبوژێنەوە..

## بنیات نانی نەتەوەیەکمان دەوێت؟!

پێشەوامان عومەر ﷺ قسەیەکی جوانی هەیە.. ڕادەی سوور بوونی دەردەخات لەسەر کاتی و لەسەر تەمەنی کە نابێ بەبێ هوودە بیفەوتێنێ.. دەڵێ: (کەی بخەوم؟ ئەگەر بەشەو

حەرِم هەقی پەروەردگارم لە دەست دەچێت، .. وە ئەگەر بە ڕۆژ بخەوم هەقی ڕەعیەتەکەمم
ـەدەست دەچێت! ئیتر کەی بخەوم) ئایا وێنەیەکی ترت دەوێ سەبارەت بە سوود وەرگرتن
ـەکات لە پێناوی ئوممەتی ئیسلامدا؟ ئەم زانایە ئەبو یوسف (قوتابی ئیمامی ئەبو حەنیفە)لە
ـەنی سەرە مەرگدا لە هۆش خۆی دەچێت، کاتێ بەتەوە هۆش خۆی قوتابیەکەی لە پاڵیدا
دەبێت، پێی دەڵێ:(وەرە با موناقەشەی مەسەلەیەك بکەین: ئایا باشتر وایە مرۆڤ بە پێ
ـڕات بۆ حەج یان بە سواری وڵاخ؟! قوتابیەکەش پێی دەڵێ: ئەی ئیمام، ئەمە کاتی ئەوە
یە(کاتی گیاندانە) ئەویش بە دڵنیاییەوە دەڵێ: کوڕی خۆم، بەخوا ئەگەر ساتێکیش لە
تەمەنم مابێت و بتوانم ڕێنومایی موسڵمانانێك بکەم بۆ ئیسلام ئەوە ئەو کارە دەکەم!!!
ئێستا ڕات چۆنە! لە ساتانی گیاندانداا دەترسێ کاتی بەبێ هودە بەسەر بچێت!
بیانویەکی ترت دەوێت؟ سەدان وێنەم لەلایە ئەگەر بتەوێ، چونکە ئێمە نەتەوەیەکین
پڕیەتی لە نموونەی ئەو جۆرە پیاوانە..
(ئەبو رەجەب)ی زانای فەرموودە دەڵێ: (بەم پەنجانەم زیاتر لە (٢٠٠٠)بەرگ کتێبم
نوسیوەتەوە، کۆی ئەو کتێبانەی داناوە دابەشیان کردووە بەسەر ژمارەی ڕۆژەکان
تەمەنیدا.. تەماشایانکردوو هەر ڕۆژێك ٩ کتێبی بەرکەوتووە!!
ئەوانە چۆن پیاوێك بوون؟ ئەوانە پیاوانێك بوون وویستویانە نەتەوەیەك بنیات بنێن..
**ئەو نەتەوەیەش بنیاتنراو (١٤٠٠)ساڵ مایەوە..**
ئەم (١٠٠) ساڵەی دوایی هات.. کە خواست و خەمی لاوان تیایدا ڕەنگ و جۆری
مۆبایلە... ئەژیم و ئەخۆم و گەشت دەکەم.. و (٦)سەعات تەماشای یاری تۆپی پێ دەکەم.
و کەناڵەکانی تەلەفزیۆن دەگۆڕم.. ئێستا کۆمەڵێ کەناڵ دانراون تەنها بۆ کات فەوتاندن..
بەڵکو بۆ ئاین و ڕەوشت فەوتاندن نەك بۆ بنیات نانی نەتەوە..
ئەی لاوەکان.. تکاتان لێ دەکەم بەخەبەر بێنەوەو ئەگادار بن بزانن بۆ کوێ دەچن..

## کێبڕکێ ی کات بکە

ئایا دەزانیت، ئەو مانایە لە ووتەی خوای گەورەوەیە؟ گوێ لە فەرمایشتی پەروەردگار
بگرە: (وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ) (آل

عمران:١٣٣)واته: (پێشبڕکێ بکەن بۆ لێبوردنێکی گەورە لەلایەن پەروەردگارتانەوە، و: بەهەشتێك کە پانیەکەی (بەئەندازەی)ئاسمانەکان و زەویە کە ئامادەکراوە بۆ لەخوا ترسان)

(سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ) (الحديد: ٢١)واته : پێشبڕکێ بکە بۆ (بەدەستخستنی)لێخۆش بوون لە لایەن پەروەردگارتانەوە، وە بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بەوێنەی پانتایی ئاسمانەکان و زەویە دانراوە بۆ ئەوانەی باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هەیە، ئەوە بەخششی خوایە دەیدا بە هەر کەسێ بیەوێ، وە خوا خاوەنی بەخششی گەورەیە)

(إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ ) (الانبياء ٩٠) واته : ( بێگومان ئەوان (پێغەمبەران پێشبڕکێیان دەکرد لە (ئەنجامدانی)کردەوە چاکەکاندا)ئایا وێنای دەکەیت؟! (أُوْلَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ )( المؤمنون: ٦١) واته: (ئەوانە پەلە دەکەن لە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکاندا، وە بۆ ئەوە ئەوانە پێشبڕکێ دەکەن)

دەڵێ ی لە گۆڕەپانی پێشبڕکێداین.. قۆڵمان هەڵماڵیووەو بەخێرایی ڕادەکەین..

نزیك لەمانای ئەو ئایەتانە.. فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوایە ﷺ بەباشی بیخوێنەرەوە.. و لە ژوورەکەتدا هەڵیواسە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (بادِرُو بالأعْمَالِ سَبْعًا) واته خێراکەن و بەخێرایی حەوت کار ئەنجام بدەن پێش ئەوەی حەوت شت ببێت (بادِرُو بالأعْمَالِ سَبْعًا: هَل تَنْظُرُونَ إلا فقرا منسيا، أو غنى مطغيا، أو مرضا مفسدا، أو هرما مفندا، أم موتا مجهزا، أو الدجال فشر غائب ينتظر، أو الساعة والساعة أدهما وأمر (الترمذي: ٢٣٠٦)

واته: ( پێش وەخت حەوت کار ئەنجام بدەن، ئایا چاوەڕوانی هەژاریەکی باس نەکراون، یان نارەحەتیەکی ستەمکارانە، یان پیریەکی پەککەوتە بوون ، یان مردنێکی ئامادە. یان دەجاڵ کە خراپترین شتێکی نادیارە کە چاوەڕوانی بکرێت، یان ڕۆژی قیامەت، کە بەڕاستی ڕۆژی قیامەت زۆر نارەحەت و سەختە)

دەی.. هەستەو خێراکەو مونافەسەی زەمەن بکە.. و سوود لە کاتەکانت ببینە.. چونکە کات وەك زێڕ وایە.. نا نەبەخوا! کات بەهادارترە لە زێڕ.. زێڕ کرین و فرۆشی پێ

ـ ﺗَﺮﻳﺖ بەڵام کات ئەگەر ڕۆشت هەرگیز ناگەڕێتەوە.. وە ئەگەر کاتت فەوتا.. تەمەنیشت ـﺮﺗﻪوە..

## ▪ بگەیت بە پلەو مەقامی پیاوان

برای بەڕێزم.. کاتت تەمەنی تۆیە.. دەی تەمەنت بەهەرزان مەفرۆشە تا کاڵایەکی بێ ـﺣی پێ بکڕیت بە نرخێکی هیچ..

ئەو کاتە هەر لە ناڕەحەتی و ناخۆشیدا دەبیت لە ئەنجامی خەرج کردنی کاتی خۆت ـﺰاڕی سەرگەردانی و بۆشایی و فەوتاندا..

ماناکانی پیاوەتی لەخۆتدا جێگیر بکە.. خۆت بە شێوەیە نیشانی خوای گەورە بدە کە ـزی بێت پێت!!

ـ ﻨﻪگەڵمدا ئەم سروودە بڵێرەوە:

ـ قلت قولا كنت للقول فاعلاً وعزم مضائي كافلي وضميني

ـشر عني بالوفاء بشاشتي وينطق نور الصدق فوق جبيني

ـ تە: ئەگەر قسەیەك بکەم بەکردەوەوە ئەنجامم داوە

وە سور بوون لەسەر کارو ویست و خواست زامنی منە

مژدەدەرە بەمن بەوەفا، دڵخۆشیم

وە نوری ڕاستگۆیی لە تەوێڵمدا قسەدەکات

# ﴿ جێگیر بوون لەسەر هەق ﴾

## کوا ڕەقیی پۆڵا؟!

پۆڵا کانزایەکی زۆر ڕەقە، تەنانەت بە نموونە دەیهێننەوە بۆ کەسێکی خاوەن هێزو بەتوان.
و دەڵێن: ئیرادەیەکی پۆڵاینی هەیە! بەڵام ئەم کانزایە سیفەتێکی تری هەیە بە خێرایی گەرد دەبێت و .. بە خێرایی سارد دەبێتەوە!!..نازانم بۆچی زۆربەی خەڵکی ئەو سیفەتەی پۆڵایان هەڵگرتووە.. و سیفەتی ڕەقی و بەرگە گرتنی پۆڵایان هەڵنەگرتووە! ئێمە بۆ ماوەیەکی کەم بە توندی حەماسەت دەمانگرێت.. پاشان گەرمیی حەماسەتەکە دادەبەزێت تا دەگاتە پلەی بەستن!.

وە لە مەسەلەکانی ئەم نەتەوەیەشدا لاوان حەماسەت دەیانگرێت.. بەهۆی ئەو حەماسەتەوە ئومێدیش لە تۆدا نوێ دەبێتەوە.. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم.. هەر یەکەمان بە ڕێگایەکدا دەڕوات وەك ئەوەی هەر هیچ نەبووبێت!..

ئایا مەسەلەکە چارە سەر کرا؟.. نەخێر!..

بارودۆخە چۆنە؟!.. هەر وەك پێش حەماسەتەکەمان وایە!..

کەواتە کێشەکە لە چیدایە؟.. بریتیە لە ساردی حەماسەتمان!...

ئایا هەر کۆدەبینەوە تاکار بکەین و بیر بکەینەو و شتیك بکەین؟.. نەخێر!..

ئەمە شتێکە بێگومان جێگای ترس و ڕاڕایە.. چونکە بووە بە کێشەیەکی گشتی لەم نەتەوەیەدا!

## وێنەیەکی خەمناك!!

کێشەکە لە ئارادایە.. چونکە چەندین ووێنەو جۆری هەیە.. پلەی حەماسەتمان بەرز دەبێتەوە پێی پاشان دادەبەزێ بۆ سفر!.. هێشتا ووێنەی خەمناك دەبینین.. کە پێویستی بە گۆڕانە:

کچێك لە ڕەمەزاندا حەماسەت دەیگرێ و دەبێتە بالاپۆش و فەرزەكانی ئەنجام دەدات..

ـشان... واز لە بالاپۆشی دێنێت!..

پیاوێك بۆ ماوەیەكی زۆر بەرەو ڕووی بەرتیل دەبێتەوە... پاشان.. بەهۆی سادەترین

هۆكارەوە.. قبوڵی دەكات!..

پیاوێك دەبێتە دیندار و ڕێگای خواپەرستی دەگرێت.. و هەموو نوێژەكانی لەكاتی

خۆیدا لە مزگەوتا دەكات.. پاشان وردە وردە.. پەرستشەكانی كەمدەبنەوە... و سارد

دەبێتەوە!...

پیاوێك دەبینیت دەڵێت: زەمەنێك من بەردەوام نوێژی بەیانیم بە جەماعەت لە مزگەوتا

دەكرد.. پاشان سەرقاڵی ژیان كەمەندكێشی كردم.. و منیش وازم لێ هێنا!! ئایا ئەمەیە

ئوممەتی محمد ﷺ ئوممەتی ئاینی هەق و شەریعەتی تەواو؟..

## سروشتێكی دەروونیە.. یان خویەكی خراپە؟!

دەزانیت.. دوژمنانی ئیسلام ئاگاداری ئەم سیفەتەی موسڵمانانن..

كاتێ حەماسەتمان سارد دەبێتەوە دێن و كێشەكانیان لەگەڵماندا چارەسەر دەكەن..

كاتێكیش حەماسەت گرتوینی وازمان لێ دێنن چی دەكەین بیكەین: هیتاف بكێشین و

كاربكەین و بجوڵێین و ڕەتیان بكەینەوە.. چونكە دڵنیان دوای ئەوە لە بیرمان دەچێتەوە و

واز دێنین..

وە ئەو كاتەش لەكاتی بێئاگاییماندا ئەوەی بیانەوێت دەیكەن! ئەوان لە چارەسەری

كێشەكانیان لەگەڵماندا پشت بە جەنگی سارد دەبەستن بۆ ماوەیەكی درێژ...چونكە دەزانن

ئێمە خێرا خاو دەبینەوە ... واز لە كاروبارە هەستیارەكان دەهێنن .

بەڵام بۆچی حەماسەتی خەڵكی سست و خاو دەبێتەوە؟

ڕۆژیی دەروون سەرقاڵ دەكات .. ماڵ و منداڵ دەروون سەرقاڵ دەكەن..دنیا دەروون

سەرقاڵ دەكات.. بژێوی ژیان.. باشە..دوای ئەوە.. كێ دۆسیەكانی ئەم نەتەوەیە هەڵگرێ ؟

ئایا نابێ حەماسەتمان هەبێت بۆ ئەوە؟

تۆ لە ئەندێشەدا دەژیت؟!

بۆچی لـه ئەندێشەدا دەژیم؟!

چونکه سروشتی دەروونی مرۆڤایەتی سارد دەبێتەوە!

بەڵام ئێمه زیاد لـه پێویست بە خێرایی سارد دەبینەوە!..

باشە چیت ئەوێ لـه ئێمە؟!

دەمەوێ ڕێژەی ئەو کەسانەی سارد دەبنەوە و شتەکانیان لـەبیر دەچێتەوە کەم بنەوە...کەسانێکی چەسپاو و جێگیرم دەوێت..دەڵێیت من چەسپاو و جێگیرم و خاو نابمەوە..تا کەی؟...تا مردن!

ئەستەمە هەموو خەڵکی را و قسە و بۆچونیان وەك تۆ وابێت!..

بەڵام بۆچی ئەو کەسە چەسپاو و جێگیرە تۆ نەبیت؟ تۆ چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ ئەی ئێوە؟!

چیمان لێ داوا دەکرێت؟! ئەوەیە مەسەلەکە... بەردەوامی و جێگیر بوون لـه دڵـت و ژیریت و هەست و نەستدا.. با کەمیش بن.. هاوەڵان لـه سەرەتادا کەم بوون.. بەڵام چەسپاو بوون و پابەند بوون بە هەقەوە هەتا مردن.. چونکە هەق ئەوە دەیەنێت کە بۆی بژیت.. و چەسپاو بیت لـه پێناویدا.. و کاری بۆ بکەیت با سەرخەرانی هەقیش کەم بن..

## لەسەر چی جێگیر بین؟

تۆش دەڵێیت باشە لـەسەر چی جێگیر بین؟

جێگیریی داواکراوە لـه سێ شتدا

١- جێگیربوون لـەسەر هەق بە گشتی.. هەقی ئاشکرا و ڕوون.

٢- جێگیربوون لـەسەر سەرخستنی ئاین.

٣- جێگیربوون لـەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە.

پێویستە دەرك بە گرنگی هەر یەکێك لـەم خاڵانە بکەیت.. چونکە بە ڕاستی ئەمانە لـه سیفاتی موسڵمانی ڕاستەقینەن.. پێغەمبەر ﷺ لـەسەر ئەمە ژیاوە و دوای خۆیشی هاوەڵان بە ڕێبازەکەی ئەودا ڕۆشتوون... لـەبەر ئەوە پێویستە خۆت ئامادە بکەیت...

**جێگیر بوون پێچەوانەی نەرم و نیانی نیە**

ههندێ لاوی خوێنگەرم پێیان وایە کە جێگیر بوون واتە وشکی و سەرسەختی..نەخێر هەرگیز وانیە.. چونکە جێگیر بوون لەسەر هەق پێچەوانەی نەرم و نیانی نیە، وە پێچەوانەی دەرسەنگی نیە لە کاروباردا.. بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین نموونەیە بۆ ئێمە..
بەڵکو جێگیربوون لەو شتانەدا کە چەنوچوون هەڵناگرێ و لەو راستەقینە ئاشکرایانەدا کە هیچ مشتومڕێکی تێدا نیە..
بۆ نموونە بالاپۆشی فەرزە.. جێگیر بوون لەسەری کارێکە ئەگەری پاشگەز بوونەوەی نیە...دنیا هەستێ و هەڵنەستێ ... چەنکە فەرزە!..وە بەرپەرچدانەوەی زوڵم و ستەم هەق و رەوایە.. جێگیر بوون لەسەری کارێکە ئەگەری پاشگەزبوونەوەی نیە...
بەڵێ.. نەرم و نیانی پێویستە بۆ ڕازیکردن و گەیاندنی فیکرو بیرۆکە.. بەڵام جەوهەری فیکر جێگیرەو نابێ تەنازولی لێ بکرێت.
دوای ئەو هەڵوێستانەی بۆت دەگێڕمەوە و دوای ئەوە مانای جێگیر بوون لەسەر هەقت بۆ دەردەکەوێت.. هەرچەندە گۆڕان بەسەر دەورووبەرەکەتدا بێت.. چونکە هەق ناگۆڕێت با سەردەم و کاتیش بگۆڕێت..

## چەند نموونەیەك سەبارەت بە جێگیر بوون لەسەر هەق

### ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

لەسەردەمی ئیمامی ئەحمەددا، فەیلەسوفەکان سەبارەت بە قورئان کە فەرمایشتی پەروەردگارە شتانێکیان دەوت کە شەرع قبوڵی ناکات، کارەکە ئەوەندە بەردەوام بوو تا هەندێ کەس بڕوایان پێکردن.. ئیمامی ئەحمەدیش بەرگری لە بیروباوەڕمان دەکرد و بەرگری کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەکرد.
ئەوانەی ڕاو بۆچونی تریان هەبوو کەوتنە دژایەتیکردنی ئەم.. داوایان لێکرد قسەکانی بگۆڕێت ، ئەمیش ڕازی نەبوو.. ئەوە هەقێکی ئاشکرایە و مەسەلەیەکی براوەیە..
وە بەهۆی نکوڵیکردنی و جێگیر بوونی لەسەر هەق و بیروباوەڕەکەی خرایە بەندینخانەوە.. دەیوت: (من ناترسم لە فیتنەی بەندیخانە، چونکە بەندیخانە وماڵی من وەك

یەك وان، وە ناترسم لە فیتنەی کوشتن، چونکە گەیشتن بە شەهادەتە.. بەڵام لە فیتنەی قامچی دەترسم، بردیان شەلاقی لیّ بدەن، لەسەر ڕوخساری ئیمام ئەحمەد ترس دەبینرا..
کاتیّ کە بردیان بۆ گۆڕەپانەکە، دزێکی بەناوبانگ کە لەسەردەمی ئەودا بوو ناوی (أبو الهیثم الطیار)بوو هەستی بەو دڵەڕاوکێیەی کرد لە ڕوخساریدا، پیّی ووت: ئەی پێشەوا.. من بە درێژایی ژیانی دزێتیم(١٨٠٠٠)قامچیم لێدراوە، و لە سەرناهەقیشم، بەڵام خۆڕاگر بووم، دەی تۆ خۆڕاگر بە لەسەر هەق!
پاشان بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی: ئەی پێشەوا، تۆ ژیانێکی سەربەستانە ژیایت، وە ئەگەر بیشمریت بە شەهیدی دەمریت.. ئیمام ئەحمەد ووتی: ئەو دامەزراو و چەسپاوی کردە ئیمامی ئەحمەد هەموو شەویّ دوعای بۆ (أبو الهیثم الطیار) دەکرد و دەیوت:
(اللهم أغفر لە) کاتیّ کورەکەی لێی پرسی: باوکە، ئەو کەسێکی دزە، ووتی: بەلاّم چەسپاو و دامەزراوی کردم..

## جێگیربە لەسەر هەق.. ئەوکاتە دەبینیت چۆن خوای گەورە ڕێنومایت دەکات بۆ جێگیر بوون

ئیمامیان برد و لێیاندا.. ئەو جەلادەی لیّ ی دەیا دەیوت: ( لێدانێکی وام لێدەیا لە فیلم بیایە بەهیلاکا ئەچوو؟.. هەموو جارێك ئامادە دەبوومەوە بۆ لێدانی بە خۆمم دەوت: قەمچی ئەم جارەیان لە دەمیەوە یەتە دەرەوە، بەهۆی داماڵینی پێستی پشتیەوە!.. پیاوێك بەلایدا ڕەت دەبێت لە کاتێکدا کە لێی دەدەن، پێی دەڵیّ: ئایا ئاوت بۆ بێنم ؟
تەماشای دەکات و دەڵێت: من بەڕۆژووم!
تەماشای ئەو جێگیر بوونە بکە... هەندیّ کەس لەوانەیە تووشی ئازارێکی سووك یان خەمێکی کەم بووبن بۆ خزمەتکردنی ئەم ئاینە وازیان لە سونتەکان و قورئان خوێندن هێناوە.. پیاوێکیش یەت بۆ لای ئیمام ئەحمەد و پیّی دەڵیّ: ئەی کوڕیّ حەنبەل لاواز بوویت، و خاوەن ماڵ و منداڵیت (مەبەستی ئەوە بوو: چیان دەویّ وا بڵیّ با تۆش بحەسێیتەوە!)..

ئەویش لە وەڵامدا ووتی: ئەگەر ئەوە عەقڵ و ژیری تۆ بێت ئەوە من حەسامەوە! پاشان
ـــە تەماشایەکی کردوو ووتی: (سەیری خەڵکی بکە، یەك قسەیان لە من دەوێت،
ـــحیـــکانی زانایەك زەلیلی و رسوایی هەموو جیهانە)
جوان توانیی جێگیر بێت؟ .. چونکە ئیمام ئەحمەد لە سەر جێگیر بوون ژیابوو، راهاتبوو
ـ گەشێدا.. یەکێ لە قوتابیەکانی دەربارەی ئەو دەڵێت: (بیست ساڵ هاوەڵی ئیمام ئەحمەدم
کردووە، هاوین و زستان گەرماو سەرما، شەو و رۆژ، هەر رۆژێك بینیبێتم لە دوێنێ زیاتری
ـیبووە!)
جێگیربوونێکی سەیر لە سەرهەق و کارکردن بۆی توێشوو وەرگرتن لە
سەرچاوەکانی..

## موجاهید عومەر موختار

نموونەیەکی تر لەسەر جێگیر بوون لەسەر هەق: شێخی موجاهید عومەر موختارە...
جیهادی دەکرد و تەمەنی (٧٣) ساڵ بوو.. بەسەری بردبوو لە ناسینی هەق و جێگر بوون
ـە سەری... باسی ژیانی ناکەین ... بەڵام دیمەنێك لە ژیانی باس دەکەین.. ساتانێکی کەم..
بەڵام گوزارشە لە جێگیر بوونێکی زۆری ئەو پیاوە.. ئەوەش کاتێ کە دەستگیر کرا لەلایەن
دەوڵەتی ئیتالیاوە تا دادگایی بکرێت..
ئەم دیمەنە عومەر موختارمان نیشان دەدات کە وەڵامی پرسیارەکانی ئەفسەرە ئیتالیەکە
دەداتەوە:
– ئایا جەنگایت لەگەڵ دەوڵەتی ئیتالیا؟
+ بەڵێ.
– ئایا خەڵکیت هاندا لەسەر ئەو جەنگە؟
+ بەڵێ.
– ئایا تۆ دەزانیت سزای ئەو کارەت چیە؟
+ بەڵێ.
– ئایا دان بەوەدا دەنێیت کە ووتت؟

+ بەڵێ

– چەند ساڵە تۆ لەگەڵ دەسلاَتدارانی ئیتالیا دەجەنگیت؟

+ نزیکەی ١٠ ساڵە

– ئایا پەشمانیت لەو کارەی کە کردووە؟

+ نەخێر

– ئایا دەزانیت کە لەسێدارە دەدرێیت؟

+ بەڵێ.

قازیەکە لە دادگاییەکەدا پێی ووت: من دڵتەنگم کە کۆتاییەکەت بەو شێوەیەیە! عومەر موختاریش بە متمانە بەخۆبوون و دڵنیاییەوە وەلاَمی دایەوە: بەڵکو ئەمە باشترین ڕێگایە کە کۆتایی ژیانمی پێ دەهێنم!..

قازی هەوڵی دەدا پاشگەزی بکاتەوە، پێی ووت حوکمی لێبوردنی گشتیت بۆ دەردەکەم بەرامبەر بەو کارەی کە بۆ موجاهیدەکان بنووسیت لە لیبیا کە جیهاد بوەستێنن دژی ئیتالیەکان، ئەویش تەماشایەکی کردو ئەم ووتە زێرینەی پێ ووت: ( ئەو پەنجە گەورەیەی کە لە هەموو نوێژێکدا شایەتی دەدات کە پەرستراو نیە بێجگە لە خواو محمدیش پێغەمبەری خوایە، نابێ ووشەی (باطل) ناهەق بنووسێت.. مرد.. بە شەهیدی مرد.. بەلاَم بە زیندوویی مایەوە لە دۆسیەو فایلی ئەو نەمرانەدا کە جێگیرن لەسەر هەق.

## سەعیدی کوڕی جوبەیر

نموونەی سێیەم سەبارەت بە جێگیر بوون لەسەر هەق: تابیعی بەڕێز (سەعیدی کوڕی جوبەیر)ە لەسەردەمی (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی)دا.. کە زاڵمێکی خوێنڕێژ بوو. پێشەوامان (سەعید) وەستا بەڕوویدا و تەحەددای دەکرد و دژی زوڵمەکەی دەجەنگا، تا دەستگیر کرا.. هێنایان تا بیکوژن.. حەجاجیش بە گاڵتە پێکردنەوە (دەیشیزانی ناوی چیە) لێ ی پرسی؟ ناوت چیە؟

ووتی: سەعیدی کوڕی جوبەیر... (سعید) واتە بەختیار

حەجاج ووتی: بەڵکو تۆ (بەدبەختی کوڕی جوبەیر) یت (ناوەکەی پێچەوانە کردەوە)

سەعیدیش وەڵامی دایەوە: دایکم زانا ترە بەناوی من، کاتێ کە ناوی نام.

حەجاجیش بە تورە ییەوە ووتی: نەگبەتیت و دایکیشت نەگبەت و بەدبەختە

سەعیدیش ووتی: ئەوکەسە بەدبەختە کە دەچێتە دۆزەخەوە، ئایا تۆ غەیب دەزانیت؟

حەجاجیش ووتی: دنیای تۆ دەکەم بە ئاگرێکی بڵێسەدار

سەعیدیش ووتی: بەخوا ئەگەر بمزانیایە ئەوە بەدەستی تۆیە، ئەوە لە بری خوا تۆم دەپەرست! حەجاجیش ووتی: بۆچی ڕات کرد لە من؟

سەعید ووتی: (فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ ) (الشعراء : ٢٠ )واتە ( ڕامکرد لە دەستان کاتێ ترسام لێتان)

حەجاج ووتی: شێوازی کوشتنێك بۆ خۆت هەڵبژێرە ئەی سەعید..

سەعیدیش ووتی: بەڵکو تۆ بۆخۆتی هەڵبژێرە، بەهەر شێوازێ بمکوژیت خوای گەورەش بەو شێوازە تۆ دەکوژێت!

حەجاج ووتی: بە شێوازێ دەتکوژم تا ئێستە پێش تۆ کەسم وانەکوشتووە. وە دوای تۆش کەس وا ناکوژم.

سەعیدیش ووتی: کەواتە تۆ دنیای من خراپ دەکەیت، و منیش قیامەت و ئاخیرەتی تۆ خراپ دەکەم..

ئیتر حەجاج بەرگەی ئەو هەموو جێگیریەی ئەو پیاوە مەزنەی نەگرت، بانگی کرد لەپاسەوانەکان و ووتی: بیبەن بیکوژن!

سەعیدیش کاتێ لەگەڵ بکوژەکەیدا ڕۆشت پێکەنی.. حەجاج بە تورەییەوە بانگی کرد: چی تۆی هێنایە پێکەنین؟

سەعید ووتی: پێکەنینم بە چاو سووربی تۆیەت بەرامبەر بەخوا،و بەزەیی خوا بەسەر تۆوە!

بۆیە تورەیی حەجاج زیادی کردو هاواری لە پاسەوانەکان کرد: سەری ببڕن!!

سەعیدی ووتی: ڕووم بکەنە قیبلەوە... پاشان شمشێرەکەیان دانا لەسەر گەردنی...سەعید وتی: (وَجهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذي فَطَرَ السماواتِ وَالأرْض حَنيفاً مُسْلِماً وما أنا منَ الْمُشْرِكِينَ)واتە :

(من ړوی خۆم وەرئەگێڕم بۆ لای زاتێك كە ئاسمانەكان و زەوی بەدیهێناوە تەنها ڕوو لەخو ئەكەم بە موسڵمانی وە بێگومان من لە هاوبەش پەیدا كەران نیم)

حەجاج ووتی: ڕووی وەرچەرخێنن لە قیبلە!

سەعید ووتی (وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ) (البقرة/١١٥)

واتە: ( ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەر بۆ خوایە، كەواتە ڕوو بكەنە هەر لایەك (لە نوێژی سوننەتدا) ئەوە ڕووگەی خوا لەوێیە)

حەجاج ووتی بەڕوودا بیخەن

سەعید ووتی: (مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى)(طه/٥٥)

واتە (لەم زەویەوە دروستمان كردوون، دووبارە دەتانگێڕینەوە ناو زەوی (بەمردویی). جارێكی تر لەو زەویە دەرتان دێنینەوە (بۆلێ پرسینەوە) )

حەجاج هاواریكرد: سەری ببڕن! زمانت بۆ ئەوەندە خێرایە بە ووتنی قورئان ئەی سەعیدی كوڕی جوبەیر

سەعید ووتی: أشهد ان لا إله إلا الله، وأن محمداً رسول الله... گیانم بكێشە ئەی حەجاج هەتا لە قیامەتدا پێت دەگەمەوە.. پاشان دوعایكرد: (خوایەگیان دوای من زاڵی نەكەیت بەسەر كەسی تردا..

سەعید كوژرا و شەهید بوو.. سەیر لەوەدا بوو دوای مردنی هەموو شەوێ حەجاج هاوری دەكرد بۆ چی سەعیدی كوڕی جوبەیر وازم لێ ناهێنێت! هەركاتێ دەمەوێ بخەوم قاچم دەگرێت

تەنها دوای (١٥) ڕۆژ حەجاج مرد.. دوای سەعید-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- زاڵ نەبوو بەسەر كەسی تردا.

## ئیبراهیم ئوممەتێك بوو

ئایا جێگیر دەبیت لەسەر هەق هەر چۆنێك بێت؟! ئایا وەك ئەو پیاوانە جێگیربوون دەناسیت؟!

ئەگەر هەموو خەڵكی سارد ببنەوە و هەڵبخلیسكێن ئایا تۆ جێگیر دەبیت..

ئایا ئەگەر هەوو خەڵكی نوێژیان لەبیر بچێتەوە، تۆ لەبیرت ناچێتەوە.
ئایا ئەگەر هەموو خەڵكی بێئاگا بوون لە خوا تۆ بێئاگا نابیت و سەرپێچی ناكەیت..
ئایا ئەگەر هەموو خەڵكی بێزار بن و لابدەن لەهەق تۆ لانادەیەت.
ڕاستە گۆڕانكاریەكانی دنیا وا دەكات كە جێگیربوونمان كەمێك نارەحەت بێت.. وەك پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە سەردەمی ئێمە فەرمویەتی (يأتي على الناس زمان، الصابر على دينه كالقابض على الجمر)(الترمذي:٢٢٦٠)واتە: ( سەردەمێك دێت بەسەر مرۆڤەكاندا، ئەو كەسەی كە ئارامگرە لەسەر ئاینەكەی وەك كەسێك وایە سكڵی ئاگری گرتبێت)
بەڵام ئەستەم نیە.. پێغەمبەر ﷺ توانی گۆڕان بەسەر دەروونی هاوەڵانیدا بێنێت دوای ئەوەی كە ئەوان پێشتر لە جاهیلەیەت و نەزانین و دەمارگیریدا دەژیان..
خوای گەورە سەبارەت بە دەروونی مرۆیی دەفەرموێ (قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا(٩)وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا(١٠) )( الشمس ٩-١٠) واتە: ( بەڕاستی ڕزگاری بوو ئەوكەسەی كە دەروونی خۆی پاك كردەوە، بێگومان نائومێد بوو ئەوكەسەی كە نەفسی خۆی (بەگوناه) وون و تاوانبار كرد، پێغەمبەر -ص- دەفەرموێ: ( إنما العلم بالتعلم، وإنما الحلم بالتعلم، وإنما الصبر بالتصبر) (إبن حجر في (فتح الباری)(١-١٦١) واتە: (بێگومان زانست بە فێربوونە، بێگومان لەسەرخۆیی بە لەسەرخۆ بوونە، وە بێگومان ئارامیش بە ئارامگرتنە)
نەخۆشیە دەروونیەكان وەكو نەخۆشیە جەستەییەكان وایە، بێگومان دەرمانی هەیە..
وەك پێغەمبەری ﷺ دەفەرموێ (مامن داء إلا وجعل له دواء إلا الهرم)
(أبو داود: ٣٨٥٥، الترمذي:٢٠٣٨، وإبن ماجة: ٣٤٣٦)واتە (هیچ دەردێك نیە دەرمانی بۆ دانەنرابێت بێجگە لە پیربوون و بەساڵاچوون)
دەی تۆش جێگیربە.. با لە جێگیر بوونەكەتدا نەتەوەیەك بیت..
وەك چۆن پێشەوامان ئیبراهیم عليه السلام نەتەوەیەك بوو.

## ﴿جێگیر بوون لەسەر سەرخستنی ئیسلام﴾

**ئاینەکەت.. ئاینەکەت!**

لە هەموو جەنگێك لە جەنگەکانی موسڵمانان پێغەمبەر ﷺ دروشمێکی هەڵدەبژارد که لەسەر ئاڵاکان بنوسرێت، تا عەزیمەتی هاوەڵان بەهێز بێت.. تا پاڵنەرو هاندەریان بێت ئەگەر خەمەکانیان خاو بوویەوە تا لە دڵیاندا بچەسپێت و جێگیر بن.

دروشمی جەنگی بەدر (أحد....أحد) بوو، دروشمی جەنگی (ئوحود)یش (دینك...دینك...لحمك...دمك)بوو.. واتە (ئیانەکەت....ئاینەکەت... گۆشتی تۆیە.. خوێنی تۆیە)

دروشمانێك هەموویان گوزارشیان لە جێگیر بوون دەکرد.. وەك ئەوەی پێت بڵێت براکەم بۆ ئیسلام بژی.. و جێگیر بە بۆ کارکردن بۆی.

ئاینەکەت ئاینەکەت.. بێگومان گۆشتی تۆیە خوێنی تۆیە.. بۆ نموونە واتە ئەگەر دڵۆپێك خوێنی تۆ بەرین و لەژێر میکرۆسکۆبدا دایبنێن ئەمە دەردەکەوێ: (من ئاینەکەم خۆش دەوێت) بەڵێ بێگومان ئاینەکەت گۆشت و خوێنی تۆیە.. خۆشت ویستووە تا ئەو خۆشویستنە بەناو خوێنبەرەکانتا هاتوو چۆ دەکەن.

لەجەنگی (خەندق)یشدا، دروشمیان بریتی بوو لە (یا منصور...أمت.. أمت) واتە (ئەی سەرخەر.....ئەمرم...ئەمرم).. تۆ سەرخەریت.. سەرخەر مادام وایە دەبێ پێشکەوم و شەڕ دەکەم و دەمرم. وە ئەگەر بیشمرم ئەوە مردن دۆڕاندن نیە.. وە تۆ سەرخەریت، وە خوا زامنی ئەوەی کردووە لە ژیانتداو لە مردنتدا ئاینەکەت.. ئاینەکەت.. گۆشتەکەت.. خوێنەکەت.. ئایا دەتوانیت ئاوا جێگیر بیت لەسەر ئاینەکەت؟ خەڵکی دوای هەواو ئارەزوویان کەوتوون و تۆش دەست بە ئاینەکەتەوە گرتووە؟ .. خەڵکی دەڵێن: حەماسەت هیچ سوودێکی نیە بۆ ئەم مەسەلەیە و تۆش جێگیریت؟ بۆچی پێویستمان بەمە هەیە..

چونكە ئیسلام زۆر بەهادارە.. ئاینت بەهادارە.. پێویستە خۆشت بوێت لەهەموو شتێك زیاتر.. جێگیر بوون لەسەر ئاینەكەت: ئەوەیە كە بڵێیت: چی بێ و نەبێت پابەندم بە ئاینەكەمەوە.. وە بەردەوام دەستی خەڵكی دەگرم.. وە بەردەوام ئاین بیری هاوەڵانم دەخەمەوە.. گوێ نایەم بەهەر كەس گاڵتەم پێ بكات.. گوێنایەمێ هەر كەس بەهای ئەم كارەی من كەم بكاتەوە.. گرنگ ئەوەیە بە ئاسایشترین ڕێگاو چاكترین ڕێگاو دروسترین ڕێگا كە خوای میهرەبان فەرمانی پێداوین بانگەواز بكەم، كە پێغەمبەرە بەڕێزەكەی لەسەری چووە.

## بانگەواز بكە... بەدانایی

دەمەوێ جەخت لەسەر خاڵێكی گرنگ بكەم كە بەستراوە بە جێگیربوونەوە و بە شێوەیەك هەندێ لە لاوان لەو بڕوایەدان كە جێگیر بوون هەمیشە بەواتای تەنگەتاوی و شەڕ دێت.. نەخێر.. پێویستە جێگیر بم، بەو پەڕی جێگیر بوون. بەڵام بەو پەڕی خۆشەویستی و بەزەیی لەگەڵ خەڵكدا دەدوێم..

بەڵێ واز لە بانگەوازی خەڵكی و دەستگرتنی خەڵكی ناهێنم.. چونكە ئەم دڵەی ناخم سارد نابێتەوە و هەمیشە بەپەرۆشم بۆ خۆشویستنی ئیسلام و ڕێزی ئیسلام.. وە ئەم خۆشەویستی و ئەم پەرۆشیە دەگوازمەوە بۆ دڵی خەڵكی.. بەدانایی.. و بە ئامۆژگاری چاك.. و بەزەیی.. و دڵسۆزی... وەك چۆن خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرە نازدارەكەی داوە.. كە نێرەرو ڕەحمەتە بۆ جیهانیان (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ) (النحل : ١٢٥)...واتە: (بانگەواز بكە بۆ لای خوای گەورە بە دانایی و بە ئامۆژگاری چاك)

چونكە لە بنچینەدا ئەم ئیسلامە ئاینی خۆشەویستی و ڕەحمەت و ئاكاری بەرزو جوانە..

## قورئان بانگت دەكات: جێگیر بە!

پێغەمبەر ﷺ هەر وەك خاتوو عائیشە ﵂ هەواڵمان پێدەدات– ئاكاری بەپێی قورئان بوو!..

لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ هەمیشە لە نوێژەکاندا ئەم دووعایەی دەکرد (یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك) (الترمذي:٣٥٢٢-٣٥٨٧) ، واتە( ئەی گۆڕەری دڵەکان دڵم جێگیرکە لەسەر ئاینەکەت)

بەڵام ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستی بە جێگیر بوونی دڵی هەیە؟! ئایا تۆ پێویستیت بەو بانگەوازە هەیە ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵێ.. چونکە جێگیربوون لەسەر سەرخستنی ئاین کارێکی مەزنە، و بەهادارە.. و گرنگە.. بەڵکو مەزنترین شتە کە خوا دابێتی بە نەتەوەیە..

ئەو شتانە چەند زۆرن کە بە حەماسەت بووی بۆیان..بەڵام پاش هەفتەیەك لە بیرت چووەتەوە؟

با سەرخستنی ئیسلام بە بەهاداری لە دڵتا بمێنێتەوە.. وە هەروەها جێگیر بوون لەسەری ... ئەمە مەزنترینی سیفەتەکانی گۆڕانە کە کۆی بکەیتەوە

گوێ لە قورئان بگرە چۆن لە کۆمەڵێ ئایەتی زۆردا هانت دەدات و پاڵت پێوەدەنێ و بانگت لێ دەکات: جێگیر بە.. جێگیر بە (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ) (الانفال ٤٥) واتە: (ئەی ئەوانەی کە باوەڕدارن ئەگەر کۆمەڵێکتان بینی ئێوەش جێگیر بن، وە زۆر یادی خوای گەورە بکەن بەڵکو ڕزگارتان بێت

گوێ لەم ئایەتانە بگرە کە لەگەڵیدا هەست دەکەیت کە هەمووگەردوون.. و مێژوو هەمووی هاوار دەکەن: جێگیر بە!

( وَكَأَيِّنْ مِنْ نَبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُم فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ) (ال عمران: ١٤٦) واتە:(زۆر لە پێغەمبەران جەنگ و کوشتاریان کردووە لەگەڵیاندا زۆر لەزانایان و خواناسان، جا سست و دەستەپاچە نەبوون بەهۆی ئەوەی کە دووچاریان بوە لە ڕێی خوادا، وە بێهێزو لاواز نەبوون و سەریان شۆڕ نەکردووە بۆ دوژمن، وە خوا خۆڕاگرانی خۆش دەوێ)

ئایا تێگەیشتیت؟ (ماوَهَنُوا)...(ما ضَعُفُوا) (مَا اسْتَكَانُوا)... ئەوانە (ربيون) کەسانێکن پەیوەستدارن بە پەروەردیارانەوە.. جێگیرن!

(وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلاَّ أَنْ قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ(١٤٧)فَآتَاهُمْ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) (آل

عمران:١٤٧-١٤٨) واته: ( هەر ئەم ووتەی ئەوان بوو کە دەیان ووت پەروەردگارا لێمان ببوورە لەگوناهەکانمان و زیادە ڕەویمان لە کاروبارماندا، وە پێکانمان جێگیر بکە (لەجەنگدا) و سەرمان بخە بەسەر کۆمەڵی بێ بڕواباندا، بە هۆی ئەوەوە خوا پێی بەخشین پاداشتی دنیاو پاداشتی چاك و شیرینی ڕۆژی دوایی)

بۆچی؟ چونکە ئەوانە کەسانێکی جێگیرن: ئەمڕۆ هەموو ئوممەت بەرەنگاری بوەتەوە..

مەسەلەکە مەسەلەی کۆمەڵێ کەسی دیاریکراو نیە..هەموو نەتەوە پێویستی بە جێگیر بوون هەیە.. ئەمە دۆسیەی ئەو لاوەیە کە ئاواتە خوازە جێگیر بێت لەسەر ئیمانەکەی.. مەسەلەی ئەو کچەیە کە ئاواتە خوازە جێگیر بێت لەسەر بالاپۆشی.. هەموو نەتەوە پێویستە جێگیر بن.. تا کارو کاروانەکە بەردەوام بێت لەڕۆشتن.

گوێ لە فەرمایشتی خوای گەورە بگرە: ( الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ )( ال عمران:١٧٣) واتە: ( ئەوانەی کە خەڵکی پێیان ووتن: بێگومان خەڵکی کۆبوونەتەوە بۆتان بە لەشکر و ئێوەش بترسن لێیان).. خەڵکی هەموو هێزێکیان بۆ تۆ کۆ کردووەتەوە.. ئەوان چاویان بڕیوەتە ئێوە.. بەڵام جێگیر حاڵی بەم شێوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ:-

(فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ) ( ال عمران : ١٧٣) واتە: (کەچی ئەوان (ئیمانداران) بەمە باوەڕیان زیاد بوو، وە ووتیان، هەر خوامان بەسە، چەند پشت پێ بەستراوێکی چاکە)

(فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنْ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذو فَضْلٍ عَظِيمٍ ) (ال عمران: ١٧٤) واتە: (ئینجا گەڕانەوە (بۆ مەدینە) بەبەهرەی گەورەوە (کەسەلامەتیە)، و فەزڵ و پاداشت لەلایەن خواوە، هیچ زیان و ناخۆشیەکیان تووش نەبوو، ئەوانە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتن، وە خوا خاوەنی بەهرەی مەزنە) وە هەروەها هەمیشە: جێگیر پێویستە لە کۆتایدا بیباتەوەو سەرکەوتوو بێت، چەند بیترسێنن و گاڵتەی پێ بکەن.. (إِنَّمَا ذَلِكُمْ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِي إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ )( ال عمران:١٧٥) واتە: ( بەڕاستی ئەوەی ئێوە (سارد دەکاتەوە)تەنها شەیتانە کە دۆست و (برادەری)خۆی دەترسێنێ، جا لێیان مەترسن، وە لە من بترسن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن)

ئايا بينيت چۆن قورئان ئاراستەت دەكات بەرەو جێگیربوون؟ بەڵێ بە دڵنیایەوە ئێمە پێویستیمان بەكەسانێكی جێگیر هەیە.. سوور بن لەسەر ئیصلاح.. سووربن لەسەر گۆڕان.. ئیمانیان بەوە هەبێت لە جێگیربووندا سەركەوتن هەیە.. مادام ئەوانە (پشت و پەنایان خوایەو تەنها خواش باشترین پشت و پەنایە)

لەبەر ئەوە پێشەوامان (إبن عباس) ﷺ دەیوت (حسبنا الله ونعم الوكيل) كاتێكیش پێشەوامان ئیبراهیم ﷺ خرایە ئاگرەكەوە هەروای فەرموو.. وە پێشەوامان موسا ﷺ وای فەرموو كاتێ هاوەڵەكانی پێیان ووت: (خەریكە پێمان دەزانن (إِنَّا لَمُدْرَكُون) كاتێ لە قەراغ ڕووبارەكەدا وەستابوون و فیرعەون و سەربازەكانی بەدوایانەوە بوون.. وە یارانی محمد ﷺ وایان ووت كاتێك (الَّذِينَ قَالَ لَهُمْ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ) (ال عمران: ١٧٣) واتە (ئەوانەی كە خەڵكی پێیان دەوتن بەڕاستی خەڵكی (بێ باوەڕ) لە شكرو كۆمەڵی زۆریان كۆكردۆتەوە لە دژتان، كەواتە بترسن لێیان، كەچی ئەوان (ئیمانداران)بەمە باوەڕیان زیاد بوو، وە ووتیان: هەرخوامان بەسە، وە چەند پشت پێ بەستراوێكی چاكە)

وە كاتێ ئیمانداران لەشكری حیزبەكانیان بینی، كە دە هەزار جەنگاوەر بوون هاتبوون بۆ جەنگ لەگەڵیاندا.. سروشتیە كە بترسن.. بەڵام كەسی جێگیر ناترسێت.. چیان ووت؟ ( قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلاَّ إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا (الاحزاب: ٢٢) ... واتە: ( ئەمە ئەو بەڵێنەیە خواو پێغەمبەرەكەی بە ئێمەیان دابوو، خواو پێغەمبەرەكەی ڕاستیان فەرموو، (ئەو هەموو هێزی كوفرە)تەنها ئیمان و ملەكچیان پێ‌ی زیادی كرد)

( ئەوەیە كە خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی بەڵێنی پێداوین) هەرچەندە حیزبەكان كۆبوونەتەوە بۆ جەنگ لەگەڵماندا.. بەڵام ئێمە هەر لەسەر هەقین.. خواو پێغەمبەرەكە ڕاستیان فەرمووە...... بەڵكو ئێمان و جێگیربوونیان زیادیكرد.....بەڕاستی.... ( مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ ) (الاحزاب: ٢٣) .. واتە (لەناو ئیمانداراندا پیاوانێك هەن)

## ئەگەر بۆ ئیسلام بژیت، بەگەورەیی دەژیت!

ئایا ڕامایت لە ئایەتەکانی پێشوو؟ وەك ئەوەی قورئان بەپاڵ پاڵت پێوە بنێت: جێگیر بە ـەکەی بێئاگا بیت.. نەکەی خواربیتەوە.. با ئیسلام دڵت و ژیریت و ژیانت و هەست و ـەستت پڕ بکاتەوە.. با دۆسیەی (مانەوەی ئەم ئاینە بە بەهاداری) گرنگترینی دۆسیەکان بێت ـەژیانتدا.. ئای کە هەژاریت ئەگەر تەنها بۆ ئەوە بژیت بخۆیت و بخۆیتەوەو هاوسەرگیری ـکەیت و منداڵت بێت و بمریت..

بە بچوکی دەژیت و بە بچوکی دەمریت... بەڵام کێ بژی بۆ ئەم مەسەلەیە کە ئیسلام هەمیشە ئاڵای شەکاوە بێت.. ئیسلام سەنگین و بەهادار بێت.. ئەوە بە گەورەیی دەژی و بەگەورەیی دەمرێت.. وە بەختەوەر دەبێت و هەموو چرکەیەك لە ژیانی پڕ دەبێت ـە شادی و سەربەرزی..وە لەزەت لە ژیانی دەبینێت و ژیانی ماناو بەهای مەزنی دەبێت.. چونکە لە مەسەلەیەکی مەزنەوە هەڵێنجراوە: من دەژیم تاوەکو ئاینەکەت سەنگین و بەهادار بێت ئەی خوای جیهانیان وە بە درێژایی مێژوو کەسانێك هەبوون کە وویستویانە بە گەورەیی بژین و بەگەورەیی بمرن، کەسانێك لە پێناوی خوادا قوربانیان داوە بەگیان و ماڵ وە ئامادەباش بوون قوربانی بدەن بە ژیانیان و دەروونیان و منداڵیان لە پێناوی ئایندا..

ئەی تۆ ناتوانی وا بکەیت.. لەوە کەمترت لێ داواکراوە.. ئەوەیە کە ئاین خۆشەویسترین شت بێت لە ژیانتدا. و بەهاترین شت بێت لە ژیانتدا.. و خەونی ژیانت ئەوە بێت کە ئیسلام بەسەربەرزی ببینیت.. ئەمەیە دۆسیەی ژیانی تۆ.. بخوازیت خەڵکی لە خۆشیدا بژین.. و باوەڕیان بە خوا هەبێت.. وە ئەمە ڕوو بدات: (سورم لەسەر سەرخستنی ئیسلام ( وە هەمیشە گەرمم و سارد نابمەوە)..جێگیرم لەسەر ڕێنمایی خەڵکی بۆ خێرو خۆشی.. جێگیرم لەسەر کارکردن بۆ ئەم ئاینە..تاوەکو ئیسلام سەربەرز بێت و هەمیشە گەشاوە بێت

## چەند نموونەیەکی جێگیر بوون لەسەر سەرخستنی ئیسلام

چەند نموونە و بەسەرهاتێکت بۆ دەگێڕمەوە لەسەر سەرخستنی ئیسلام.. تا هەست بەوە بکەیت کە جێگیر بوون سیفەتی موسڵمانانە لەهەموو کات و شوێنێك... نمونەکانیش:

نمونەی نەوجەوانێکی ژیرە.. و نمونەی ئافرەتێك... و دواهەمینیشیان یەکێ لە هاوەڵانە... ت ببینیت کە جێگیر بوون تەنها تایبەتمەند نیە بە پیاوانەوە... وە تایبەت نیە بە تەمەن یان قۆناغێکی تەمەنەوە..

## جێگیری نەوجەوان و ساحیرەکە

فەرموودەیەکە (موسلیم : ٧٤٣٦)، ڕیوایەتی کردووە، لە میانی ئەوەوە پێغەمبەر ﷺ نموونەیەکمان بۆ دێنێتەوە لەسەر جێگیر بوون.. وە هاوەڵانی ئاشنا دەکات بە چیرۆکی ئەو نەوجەوانە.. کوڕێکی بچوك کە تەمەنی (١٢)یان (١٣) ساڵە.... لە صوهەیبەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:﴿ كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلَامًا أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلَامًا يُعَلِّمُهُ فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ إِذَا سَلَكَ رَاهِبٌ فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَسَمِعَ كَلَامَهُ فَأَعْجَبَهُ فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ فَقَالَ إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ فَقُلْ حَبَسَنِي أَهْلِي وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ حَبَسَنِي السَّاحِرُ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَتَى عَلَى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتْ النَّاسَ فَقَالَ الْيَوْمَ أَعْلَمُ آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمْ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ فَأَخَذَ حَجَرًا فَقَالَ اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا وَمَضَى النَّاسُ فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ أَيْ بُنَيَّ أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى فَإِنْ ابْتُلِيتَ فَلَا تَدُلَّ عَلَيَّ وَكَانَ الْغُلَامُ يُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَيُدَاوِي النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الْأَدْوَاءِ فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ فَقَالَ مَا هَاهُنَا لَكَ أَجْمَعُ إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِي فَقَالَ إِنِّي لَا أَشْفِي أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ فَإِنْ أَنْتَ آمَنْتَ بِاللَّهِ دَعَوْتُ اللَّهَ فَشَفَاكَ فَآمَنَ بِاللَّهِ فَشَفَاهُ اللَّهُ فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ قَالَ رَبِّي قَالَ وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِي قَالَ رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلَامِ فَجِيءَ بِالْغُلَامِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ أَيْ بُنَيَّ قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ فَقَالَ إِنِّي لَا أَشْفِي أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ فَجِيءَ بِالرَّاهِبِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ فَأَبَى فَدَعَا بِالْمِئْشَارِ فَوَضَعَ الْمِئْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِيءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ فَأَبَى فَوَضَعَ

ـنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِيءَ بِالْغُلَامِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ فَأَبَى ـفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذِرْوَتَهُ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلَّا فَاطْرَحُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا ـئْتَ فَرَجَفَ بِهِمْ الْجَبَلُ فَسَقَطُوا وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ ـنَ كَفَانِيهِمُ اللَّهُ فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورٍ فَتَوَسَّطُوا بِهِ ـبَحْرَ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلَّا فَاقْذِفُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ فَانْكَفَأَتْ بِهِمْ ـسَّفِينَةُ فَغَرِقُوا وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ

فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ قَالَ كَفَانِيهِمُ اللَّهُ فَقَالَ لِلْمَلِكِ إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ قَالَ وَمَا هُوَ قَالَ تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَتَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ خُذْ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِي ثُمَّ ضَعْ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قُلْ بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلَامِ ثُمَّ ارْمِنِي فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ قَتَلْتَنِي فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ أَخَذَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبْدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قَالَ بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلَامِ ثُمَّ رَمَاهُ فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ فِي مَوْضِعِ السَّهْمِ فَمَاتَ فَقَالَ النَّاسُ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ فَأُتِيَ الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ قَدْ وَاللَّهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ قَدْ آمَنَ النَّاسُ فَأَمَرَ بِالْأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ وَقَالَ مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ فَأَحْمُوهُ فِيهَا أَوْ قِيلَ لَهُ اقْتَحِمْ فَفَعَلُوا حَتَّى جَاءَتْ امْرَأَةٌ وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا فَقَالَ لَهَا الْغُلَامُ يَا أُمَّهْ اصْبِرِي فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ﴾ رواه مسلم.

واته: (لەوانەی پێش ئێوە پاشایەك هەبوو، كە جادوگەرێكی هەبوو، كاتێ جادوگەرەكە پیربوو بە پادشای ووت: من چوومەتە ساڵەوە منداڵێكم بۆ بنێرە با فێری جادووی بكەم، ئەویش منداڵێكی بۆ نارد تا فێری بكات، منداڵەكە لە ڕێگەكەیدا كە هاتوچۆی پیادەی كرد، خواناسێكی گۆشەگیر هەبوو ئەویش لای دانیشت وگوێی لە قسەكانی ڕاگرت پێی خۆش بووە، جا كاتێ منداڵەكە دەچوو بۆ لای جادوگەرەكە بەلای خواناسەكەدا ڕائەبورد و لای دائەنیشت و (دوا ئەكەوت) كاتێكیش دەچوو بۆ لای جادوگەرەكە لێیدەدا، (چونكە دوادەكەوت) سكاڵای ئەوەی لای خواناسەكە كرد، ئەویش ووتی: ئەگەر كاتێ لە جادوگەرەكە ترسای بڵێ لەماڵەوە دوایان خستم، كاتێكیش لەماڵەوە ترسایت بڵێ:

جادوگەرەکە دوای خستم، لەکاتێکدا ئەو لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بوو، ڕۆژێکیان هات بەسەر دەعبایەکی گەورەدا کە ڕێی لە خەڵکی گرتبوو، ووتی: ئەبێ ئەمڕۆ بزانم: داخۆ جادوگەرەکە باشترە یان خواناسەکە؟ بەردێکی هەڵگرت و ووتی: خوایە ئەگەر ئیشی خواناسەکەت لا خۆشەویسترە لە ئیشی جادوگەرەکە ، ئەم دەعبایە بکوژە تا خەڵکی دەرباز بن، بەردەکەی تێگرت و دەعباکەی کوشت و خەڵکەکە دەرباز بوون، ئینجا هات بۆ لای خواناسەکەو ئەمەی بۆ باسکرد، کابرای خوا ناس پێی ووت: ئەی کوڕی خۆم، ئەمڕۆ تۆ لە من باشتری، کارت گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە من دەیبینم، دڵنیابە تۆ توشی گیروگرفت دەبیت، جا ئەگەر گرفتار بوویت، خەبەر لە من نەدەیت، ئیتر مناڵەکە وای لێ هاتبوو کوێری زکماك و بەڵەکی چاك دەکردەوەو لە دەردو نەخۆشیەکانی دیکەش چارەی دەکرد. هاودەمێکی پاشاکە کوێر بوو هەواڵی ئەمی بیستبوو، بەخەڵات و بەرانێکی زۆرەوە هات بۆلای، ووتی: هەموو ئەم دیاریانەم بۆ تۆ ئەگەر چاکم بکەیتەوە، ئەویش ووتی: خۆ من کەس چاك ناکەمەوە، بەڵکو هەر تەنها خوای گەورە و باڵا دەست خەڵکی چاك دەکاتەوە. ئەگەر تۆیش باوەڕ بەخوابێنیت، داوات لە خوای گەورەو باڵا دەست بۆ دەکەم، کە چاکت بکاتەوە، ئەویش باوەڕی بە خوا هێناو خوای گەورە و باڵادەستیش چاکی کردەوە، هاتەوە بۆلای پاشاو لەلایەوە دانیشت، هەروەك چۆن لەوەو پێش دائەنیشت، پاشا پێی ووت: کێ چاوی پێدایتەوە؟ ووتی: پەروەردگارم، ووتی: بۆ پەروەردگارێکی ترت هەیە بێجگە لە من؟ ووتی: پەروەردگاری منیش و تۆیش هەر خوایە، ئەویش گرتی و دەستی کرد بەئەشکەنجەدانی تاوەکو خەبەری دا لە مناڵەکەدا، ئینجا مناڵەکەیان هێنا، پاشا پێی ووت: کوڕە بچکۆلەکەی خۆم، لە جادوگەریدا گەیشتویتە ئاستێك کە کوێر و بەڵەکی زکماك چاك دەکەیتەوە و ئەوە دەکەیت و ئەوە دەکەیت ووتی: من کەس چاك ناکەمەوە، تەنها هەر خوای گەورەو باڵا دەست خەڵکی چاك دەکاتەوە، ئەویش گرتی و دەستی کرد بە ئەشکەنجەدانی، تا خەبەری لە کابرای خواناس دا، خواناسەکەش هێنراو پێی ووترا: لە ئاینەکەت پاشگەز بەرەوە، ئەویش ڕازی نەبوو بانگی کرد هەرەیەك (مشارێك) یان بۆ هێنا. مشارەکەی لەسەر تەوقی سەری دانا تا کردی بە دوو کەرتەوە، پاشان هاودەمەکەی پاشا هێنرا، پێی ووترا: لە دینەکەت پاشگەز بەرەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، مشاری لەسەر سەری

داناو ئەویشی کرد بە دوو پارچەوە، ئینجا منالّەکەیان هێناو پێی ووترا: لە دینەکەت پاشگەز بەرەوە، ئەویش ڕازی نەبوو، بۆیە دایە دەست کۆمەڵێ لە پیاوەکانی و ووتی ببەن بۆ شاخی ئەوێ و ئەوێ سەریخەن بۆ سەر شاخەکە، کە گەیشتنە لوتکەکەی، ئەگەر لە دینەکەی پاشگەز بوویەوە باشە، ئەگەر نا فڕێی دەنە خوارەوە، ئەوانیش بردیان و بەشاخەکەدا سەریان خست، ووتی: خوایە چۆن دەتەوێت ئەمانەم لەکۆڵ بکەرەوە، شاخەکە کەوتە لەرزین و ئەوان کەوتنە خوارەوە، ئەمیش هاتەوە بۆ لای پاشا، پاشا پێی ووت: هاوەڵەکانت چیان کرد؟ ووتی: خوا لە کۆڵمی کردنەوە، ئەویش دایەوە دەست چەند کەسێکی دیکە لە پیاوەکانی و ووتی: ببەن لە بەلەمێکدا هەڵیگرن تا دەگەنە ناوەڕاستی دەریاکە ، ئەگەر لە دینەکەی پاشگەز بوویەوە باشە، ئەگەر نا فڕێیدەنە ناوی، ئەوانیش بردیان، ئەویش ووتی: خوایە چۆن ئەتەوێت ئەمانەم لەکۆڵ بکەرەوە، کەشتیەکە پێیانەوە قەڵپ بویەوەو هەموو نوورقم بوون و ئەمیش هاتەوە بۆ لای پاشا، پاشا پێی ووت: هاوەڵەکانت چیان لێ هات؟ ووتی: خوا لە کۆڵمی کردنەوە، ئینجا بە پاشای ووت: تۆ ناتوانیت من بکوژیت تا چیت پێ دەڵێم ئەوە نەکەیت، ووتی: ئەوە چیە؟ ووتی: خەڵکی هەموو لەیەك گۆڕەپاندا کۆکەرەوەو بمبەستە بەدار خورمایەکەوە، پاشان تیرێك لە تیروکەوانەکەم دەربهێنەو، تیرەکە بخەرە ناو جەرگەی کەوانەکەوەو پاشان بڵێ: بەناوی خوای پەروەردگاری منالّەکەو دوای ئەوە تیرەکەم تێبگرە، ئەگەر تۆ ئەمەت کرد، ئیتر دەمکوژیت، ئەویش خەڵکی هەموو لەیەك خاکدا کۆکردەوەو بە بنکی دارخورمایەکەوە تن بەستیەوە، پاشان تیرێکی لە تیردانەکەی هەڵگرت و خستیە ناو جەرگەی کەوانەکەوەو ووتی: بەناوی خوای پەروەردگاری منداڵەکە، تیرەکەی تێگرت، بەر لاجانگی کەوت، دەستی نایەسەر شوێنی تیرەکەو مرد، خەڵکی هەموو ووتیان باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری منداڵەکە، باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری منداڵەکە، باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری منداڵەکە، زەلامێك هات بۆلای پاشا و پێی ووت: ئایا دەزانی ئەوەی لێی دەترسایت سوێند بەخوا ئەمڕۆ ڕوویدا لێت، خەڵکی تازە باوەڕیان هێنا، ئەویش فەرمانی دەرکرد بە لەغەم (أُخْدُود)لێدان، لەسەر کوچەو کۆڵانەکان لەغەم لێدراو ئاگری تیادا کرایەوە، ووتی: هەر کەس لە دینەکەی پاشگەز نەبوویەوە بیسوتێنن تیایدا، یان پێی بوترێت خۆتی

تێ فڕێدە، ئەوانیش وایان کرد، تاوەکو تەنانەت ژنێك هات منداڵێکی خۆی پێ بوو، سڵی دەکرد لەوەی خۆی تێ فڕێدا..

منالەکە پێی ووت:

( دایە ئارام بگرە، چونکە بەڕاستی تۆ لەسەر هەقی)

## جێگیر بوونی هاوەڵێك

تەماشای جێگیر بوونی یارێك لە یارانی پێغەمبەر ﷺ بکە ئەویش (خوبەیبی کوڕی عودەی)ە پێغەمبەری خوا لەگەڵ کۆمەڵێ هاوەڵدا ناردی تا گەلێکی کافر بانگ بکات بۆ لای خوا.. دوای ئەوەی پەیمانیان بە موسڵمانان دابوو بە ئەمن و ئاسایش.. بەڵام کافرەکان ناپاکیان کرد... هاوەڵەکانیان کوشت... و خوبەیبیشیان بە دیلی برد بۆ مەککە.. پاشان فرۆشتیان بە موشریکەکانی مەککە.. خوبەیب لە جەنگی بەدردا خزمەکانی ئەوانی کوشتبوو خوبەیبیان برد بۆ (التنعيم) (کاتێك لای خەڵکی مەککە کە عەمرە تیایدا حەرامە)بەستیان بە بنی دارخورمایەکەوە تا بیکوژن.. ئەبو سفیان فەرمانیدا بە هەموو گەلەکەی کە لەو جێگایانەی خوبەیب نەیەن کە ڕاستەوخۆ ببێتە هۆی کوشتنی (واتە لە شوێنە مەترسیدارەکانی نەیەن، بەڵکو لەسەرەتادا لە هەردوو دەستی و هەردوو قاچی بەن!)

باسی شتێکی زۆر قورست بۆ دەکەم.. نەچوی بەسەریدا.. ئەی بۆچی شتی ئاسان ناکەیت...؟!

جێگیربە لەسەر بانگەوازکردنی خەڵکی، و تەماشای جێگیری و هێزو پیاوەتی خوبەیب بکە..

کافرێکی زۆر کۆبوونەوە لەسەری.. تیریان ئەنا بەهەردوو دەستی و هەردوو قاچیەوە..

ئەویش جێگیر و سەربەرز وەستابوو قسەی نەدەکرد وەك شاخی جێگیر دەدرەوشایەوە..

ئەی گەنج و لاوەکان.. جێگیریی ئەوەیە!... ئەوە نیە کە شەیتان شتێك بچپێنێ بە گوێتداو تۆش.. بکەویت.. گوێ لە قسانێکی حەماسی بگریت و حەماسەت بتگرێ... پاشان لە بیرت بچێتەوە.. وە ناتەوێ جارێکی تر جێگری و سورر بوونی خۆت نوێ بکەیتەوە!..

با تەماشای ئەو هەڵوێستە جوانەی خوبەیب ﷺ بکەین: پێش ئەوەی کافرەکان تیربارانی بکەن.. ئەبو سفیان لێی نزیك بوویەوەو ووتی: سوێندت ئەیەم بە خوا ئەی خوبەیب.. ئایا ئێستا حەز دەکەیت پێغەمبەر ﷺ لە جێگای تۆدا بێت.. و تۆش لە ناو کەس و کاری خۆتا بیت بێ زیان؟!

ووتی: نا، نەبەخوا.. حەز ناکەم من لە ناو کەسوکاری خۆمدا بم و دڕکێك ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدات، ئیتر چۆن حەز دەکەم لە جێگای مندا بێت؟!

ئەبو سوفیانیش هەردوو دەستی خۆی هەڵگێڕایەوەو ووتی: هیچ کەسێکم نەدیوە کەسێکی تری خۆش بوێت، وەك خۆشویستنی هاوەڵانی محمد بۆ محمد.

تەماشاکە.. ئایا تۆ بەو ئەندازەیە پێغەمبەرەکەتت ﷺ خۆش دەوێت؟ تۆ وەك خوبەیب خۆشت دەوێت .. تەماشاکە.. لەساتانێکی کەمدا خۆشەویستی خوبەیب دەرکەوت و ئەبو سوفیانیش شایەتی لەسەر ئەوەیا!.. پاشان ئەبو سوفیان لێی پرسی؟ ئایا پێش مردنت هیچ دەخوازیت؟ خوبەیب ووتی: بەڵێ، دەمەوێ دوو ڕکات نوێژ بکەم، پێی ووت: بەڵێ وازت لێ دێنین دوو ڕکات نوێژ بکە.. بەڵێ خوبەیب یەکەمین کەس بوو سونەتی دووڕکات نوێژی پێش مردنی ئەنجامدا..

بەڵام خوبەیب دوو ڕکات نوێژی کورتی ئەنجامدا و پاشان ووتی:

خوایەگیان، بەخوا ئەگەر لەبەر گومانی ئەوان نەبوایە کەوا دەزانن من دەترسم لە مردن.. چەندە خوا حەزی بکردایە درێژم دەکردەوە.. پاشان شیعرێکی ڕازاوەی ووت کە گوزارش لە ڕادەی بەهێزی و جێگیربوونی دەکات لە دواهەمین ساتی تەمەنیدا:

ولست أبالي حين أقتل مسلما

على أي جنب كان في الله مصرعي

وذلك في ذات الاله وإن يشأ

يبارك في أوصاك شلوٍ ممزع

گرنگ ئەوەیە بە موسڵمانی مرد.. گرنگ نیە چۆن مرد.. مادام لە پێناوی خواو لە پێناوی ئاینی خوادا مرد.. وە خوای گەورە بەتوانایە لەو لاشە پارچە پارچەکراو و کوت کوتە پیرۆز بکات..

الله.....ئەی خوبەیب.. ئەو هەموو جێگریە چیە؟!

دوای ئەو شیعرە.. دەستی کرد بە دووعا کردن لـێیان دووعایەك دڵی دەهێنایە لـەرزین:

( اللهُم أَحْصِهِمْ عَدَداً.....وَاقْتُلْهُمْ بَدَداً....وَلا تُبْقِ مِنْهُمْ أَحَداً)

(أبو داود الطياسي(١/٣٣٨)، والطبراني في (المعجم الكبير (٥/٢١٦)

واتە (پەروەردگارا بیانژمێرە یەکە بە یەکە.. و بیانکوژە بە پارچەکراوی.. و هیچ کامیان نەهێڵیتەوە)

خەڵکەکەش ترسان... خۆیان یا بەزەویدا.. لـە ترسی ئەوەی دوعاکە نەیانگرێتەوە و لـەناویان نەبات.. تەماشای سادەیی عەقڵیان و لـەق و لۆقی دڵە ترسنۆکەکانیان بکە!.. سەریان دانەواند بۆ سەرزەویەکە لـە ترسانا و سەری خوبەییبیش بە بەرزی دەشەکایەوە.. تاڵە موویەکی ئیمانی و جێگیریەکەی نەدەلـەرزین ...دڵنیابە برای خۆم... تۆ وات بەسەردا نایەت... بەڵام پێویستە یەك شت لـە دڵتدا جێگیر بێت: کە ئیسلام زۆر زۆر زۆر بەهادارو سەنگینە.. وشایانی ئەوەیە بۆی بژیت و لـە پێناویدا جێگیر بیت..

## جێگیریی ئافرەتێك

دوا نمونە، ئافرەتێکە لـە ئیمانداران کە ناوی قژداهێنەری کچی فیرعەونە.. ئافرەتێکی سادە ئیمانی بەخوای تاك و تەنها هێنا و بڕوای بە پێغەمبەر موسا ﷺ کرد.. لـەسەردەمێکدا کە فیرعەون دەیوت: (أَنَا رَبُّكُمْ الأَعْلَى) واتە☹من خوای مەزنی ئێوەم)... ئەم ئافرەتە ناچار بوو لـە ماڵ فیرعەوندا کاربکات تاوەکو چوار منداڵەکەی پەروەردە بکات.. کاری ئەم جوانکردن و ڕازانەوەی کچی فیرعەون بوو کە ئێستە پێی دەڵێن (کەوافیر)... باوەڕهێنانی خویی شاردبوویەوەو دەری نەدەخست.. بەڵام ئەو ئیمانەی لـە دڵدا دەچسپێت بێگومان شوینەواری لـە ئەندامەکانی لـەشدا دیارە.. ڕۆژێکیان قژی کچی فیرعەونی دادەهێنا.. شانەکە لـە دەستی کەوتە خوارەوە، هەڵی گرتەوەو ووتی (بسم الله) ئەبێ چەند جار ئێمە بیرمان چوو بێت بلێین: (بسم الله) لـە سەرەتای هەموو کارێکا کە پێ هەڵدەسین؟ و بەرەکەت لـە کارەکانماندا نامێنێت... و دەپرسین! بۆچی بەرەکەتی تیا نیە؟!..

پەروەردگاری من و تۆو باوکت (الله) ...کچەکە ووتی: دەی بە باوکم دەڵێم! ئافرەتەکە بە جێگیریەکی سەرسامەوە ووتی: خوای من و تۆ و باوکت (الله)یە

سبحان الله! ئافرەتێکی سادەی کارگوزار بەڵام جێگیر لە ئیماندا وەك جێگیربوونی شاخ!..

بەڵێ ئافرەتە کارگوزارەکەیان هێنا بۆ لای فیرعەون، فیرعەون لێ ی پرسی: ئایا بێجگە لە من خوای ترت هەیە؟

ووتی: خوای من و خوای تۆ (الله)یە.

فیرعەون هەوڵیدا پاشگەزری بکاتەوە لە بیروباوەڕەکەی.. پرسیاری کرد: ئایا منداڵ هەیە؟

ووتیان: بەڵێ، چوار منداڵی هەیە.. یەکێکیان شیرەخۆرە.. فیرعەون ووتی: منالەکانیم بۆ بێنن.. چوار منداڵەکەیان بۆ هێنا.. پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە: ئایا بێجگە لە من خوای ترت هەیە؟

ووتی: خوای من و خوای تۆ (الله)یە! فیرعەون ووتی: مانگایەکی ووشکەوە بووم لە مس بۆ بێنن، ناوەکەشی پڕ کەن لە ئاگر.. منداڵی یەکەمیان هەڵگرت و فیرعەون لێی پرسی: ئایا بێجگە لە من خوای ترت هەیە؟

ئافرەتەکە ووتی: خوای من و خوای تۆ (الله)یە.. کوڕی یەکەمیان خستە ناویەوە.. کوڕەکە هاواری لێ بەرز بوویەوە، پاشان لە ئاگرەکەدا یەکالا بوویەوە!! فیرعەون پرسیارەکەی لێکردەوە: ئایا بێجگە لە من خوای ترت هەیە؟؟ ئافرەتەکە ووتی: خوای من و خوای تۆ (الله)یە ! منداڵی دووەمیشیان خستە ناو ئاگرەکەوە.. پاشان منداڵی سێیەم، ئافرەتەکەش جێگیر بوو لە سەر ئاینەکەی .. هەر چەندە جگەرگۆشەکانی لە ئاگرەکەدا دەسوتێنران!..

یاالله!.. ئایا جێگیر بوونت بینی چۆنە؟!.. سوپاس بۆ خوا ئێمە منداڵمان سەلامەتی و بێ زیان دەژین،بەڵام بەلانی کەمەوە پێویستە دست بکەیت کە تۆ بەرپرسیت لە سەرخستنی ئەم ئاینە..جێگیر بوون لەسەر سەرخستنی ئیسلام... ئێمە ئەوە دەخوازین... دەی جێگیربە!..

گەیشتنە سەرەی منداڵی چوارەم.. کە شیرەخۆرە بوو.. دایکە دڵی زۆر داخورپا بۆی.. کە ئەگەر ئەو شیرەخۆرە بخەنە ئاگرەوە، چونکە نەیدەتوانی بەرگە بگرێت، بە تایبەتی پێش کەمێك هەرسێ منداڵەکەی تری لەدەستدا.. دایکی کۆرپەلەکە ووتی: نا... ئەم منداڵە نا..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەو کۆرپە شیرەخۆرە لەو منداڵانە بوو کە لە لانکدا قسە دەکەن وەکو پێشەوامان عیسا ﷺ منداڵەکە بەدایکی ووت: (یا أماه.. اثبتي فَإِنَك عَلى حَق)

واتە: (دایکە گیان.. جێگیر بە چونکە بەدڵنیاییەوە تۆ لەسەر هەقیت)..منداڵە شیرەخۆرەکەیان هەڵگرت و خستیانە ئاگرەکەوە... پاشان پێی ووت: ئایا بێجگە لە من خوای ترت هەیە؟

ووتی : خوای من و خوای تۆ (الله)یە.. ئەویشیان لەگەڵ منداڵەکانی خستە ئاگرەکەوە. بەڵام چیرۆکەکە کۆتایی نەهاتووە... پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکی صەحیحدا دەفەرموێ: (کاتێ من لە شەورەویدا (المِعْرَاج)بووم بەرەو ئاسمان، جوبرەئیلم لەگەڵدا بوو، ووتم: ئەی جوبرەئیل. ئەم بۆنە خۆشە چیە هەموو ئاسمانی پڕ کردووە؟)

جوبرەئیل ﷺ ووتی: ئایا نازانیت؟ پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوە: نەخێر، جوبرەئیل ووتی: ئەوە بۆنی قژداهێنەرەکەی کچی فیرعەونە لەگەڵ منداڵەکانی)

(ئەم چیرۆکە (إبن ماجه) گێڕاویەتیەوە : ٤٠٣٠)

**پاش هەزاران ساڵ... هێشتا بۆنەکەی هەر بڵاو دەبێتەوە..**

برای بەڕێزم ئەوە جێگیر بوونە.....جێگیر بوون لەسەر سەرخستنی ئاین

ئایا دەزانیت بەهێز ترین ئایەت لە قورئاندا کامەیە؟ پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی (شَيَّبَتْنِي هُود) (الترمذی:٣٢٩٧) واتە (سورەتی هود پیری کردم) ئەو ئایەتەش لە سورەتی هودا بریتیە لە (فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ ) (هود:١١٢) واتە: (خۆڕاگر بە ئەی محمد وەك فەرمانت پێدراوەو ئەوانەشی لەگەڵ تۆدا تۆبەیان کردووە)

ئێمە پێوستمان بەوە هەیە.. کە جێگیر بین لەسەر ئیسلام....جێگیربین لەسەر بانگەوازکردنی خەڵکی .. جێگیر بینین لەسەر سەرکەوتنی و هەوڵدان و کارو بەرهەم هێنان... جێگیر بین هەتتا لەمردندا.. تا ئەو ساتەی بەدیداری خوای گەورە دەگەین و

بەزامەند دەبێت لێمان.. و دەگەین بە بەختەوەری و حەسانەوەی نەبڕاوە لە بەهەشتی ڕازاوەدا.

پەروەردگارا بەهەشتی ڕازاوە بکە بە نسیبمان.. وە خۆڕاگریمان پێ ببەخشە لەسەر سەرخستنی ئاینی ئیسلام و دەستگرتن پێیەوە تا ئەو ڕۆژە بەدیدارت دەگەین.. پەروەردگارا ئەی گۆڕەری دڵەکان دڵمان جێگیر بکە لەسەر ئاینەکەت دڵمان جێگیر بکە لەسەر گوێڕایەڵیت.. دڵمان جێگیر بکە لەسەر خۆشەویستیت... دڵمان جێگیر بکە لەسەر کارکردن بۆ ئاینەکەت ئەی بەزەیی ترینی بەبەزەییان.. خوایەگیان لێمان قبوڵ کەیت...

# ﴿ چۆن خۆڕاگر بین ﴾

باسی جێگیریمان کرد لەسەر ئامانج، و جێگیری لەسەر پەرستش، و جێگری لەخواپەرستشا.. و جێگیری لەسەر بیروباوەڕ... و جێگیری دژی سەرپێچیکردن...و جێگیری و خۆڕاگری لەکاتی فیتنەدا..

تۆش دەپرسیت: چۆن جێگیر بم؟ هەنگاو و کردەوەکانم دەوێت بۆ جێگیر بوون، کارەکانی جێگیر بوون چیە؟!.. برای بەڕێزم هۆگری گۆڕانبە، ئارامبگرە،... پێش ئەوەی چەند رازێکت لە قورئاندا بۆ باس دەکەم لەسەر ناجێگیری، ئەو وێنانەی هۆگری گرنگترینی هۆکار و بارودۆخەکانن کە خەڵکانی ناو مەشخەڵ تیایدا دەکەون..و ژمارەی خۆڕاگران کەم دەبێتەوە..

## خوا دەپەرستیٚ لەسەر پیتێك (لەقەراغدا)

لاوێك دیندارەو زۆر بە حەماسەتەوە شوێنی ئەم ئاینە کەوتووە.. دەبینێت کە ئاینداری شتێکی جوانەو مانای جوان دەیات بە ژیانی.. ئەوەندە بەحەماسەتەوە شوێن ئەم ئاینە کەوتووە کە دەتوانیٚ زۆر شت بگۆڕێت و کار لە زۆربەی خەڵکی بکات.. بەڵام لەسەرەتای ڕێگاکەدا لەمپەرێك دێتە بەردەمی شتانێکی لیٚ ڕوودەدات و دوور دەکەوێتەوە لە ئاین..

کەسێکی ئیماندار هەڵەیەك لە مافی ئەمدا دەکات.. لەوکاتەشدا دەڵیٚ: ئەوانە ئیماندارن؟! ئایا شتی وانەبووە؟ ئایا گوێمان لە شتی وا نەبووە؟ بەڵیٚ.. بەداخەوە!.. یان دەڕوات بۆ مزگەوت و پێڵاوە نوێکەی(یان کڵاشەکانی)دەدزن.. ئەمیش دووردەکەوێتەوەو و دەڵیٚ: نا.. ئاین و دینداری و دیندارەکان و هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا ئەوە نەبوو کە وا من گومانم دەبرد ! نەخێر! ... نەکەی بوەستیت و کاروانی دینداریەکەت بوەستێنیت لە

ـری خەڵکیدا!.. ئایا یەك كەس یان تەنانەت كۆمەڵێكی بچووك دەتوانێت نوێنەرایەتی ئەم ـبە مەزنە بكات؟!

پێشەوامان (عەلی كوڕی أبو طالب) ﷺ دەڵێ: پیاوان بەهەقدا بناسە.. هەق بە پیاواندا ـناسە.. واتە: تۆ ئاكارو هەڵسوكەوتی پیاوان لەسەر هەق و ئایین بپێوە.. ئایین ـەڵسوكەوتی مرۆڤەكان دیاری دەكات و چاكە جیا دەكاتەوە لە خراپە.. نەك بە ـچەوانەوە!..

خوای پەروەردگارمان لەگەڵ هەموو بەندەیەكدا دەدوێت سەبارەت بەجێگیر بوون ـسەر ئاین بەهۆی ئەو هۆكارەوە.. ئاگادارمان دەكاتەوە لێی و دەفەرموێ: ( وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ)(الحج:١١) ... واتە ( وە لەناو خەڵكدا كەسی وا هەیە خوا دەپەرستێ لە قەراغدا (لە نێواندا) جا ئەگەر توشی خێرو خۆشی بوو، دڵخۆش دەبێ پێی (بەردەوام دەبێ لە خواپەرستیدا) وە ئەگەر توشی تاقیكردنەوەو بەڵا بوو، بەرەو دوا هەڵدەگەڕێتەوەو پاشگەز دەبێتەوە لە ئاین، زەرەرمەندی دنیاو قیامەت بووە، تەنها ئەوەیە زیان و خەسارەتمەندی ڕوون و ئاشكرا)

ئایا ڕامایت؟ خەسارەتی دنیاو ئاخیرەت دەبێت!... تۆش دنیاو ئاخیرەتت مەدۆڕێنە لە پێناوی هەڵەیەكدا، كە لەلایەن كەسێكەوە ئەنجامدراوە كە بێگوناه نیە.

## لەبەهرەی خۆیمان پێ ببەخشێ

پیاوێك نزیك دەبێتەوە لە خواوەو دەبێتە دیندارو پەرستش و دوعا و ملكەچی زیاد دەكات. بۆچی؟... چونكە داوایەكی هەیە لە خوای گەورە كە بۆی بێنێتە دی!..

تاقیكردنەوەیەكی گرنگی هەیەو كەوتووە.. یان دەیەوێ زەواج بكات.. یان دەیەوێ خوای گەورە دەوڵەمەندی بكات.. خوای گەورەش بەخشندەیە.. چی بوێت دەیداتێ.. پاشان.. كەوتن دەست پێبكات.. پەیوەندی بە ئاینەوە كەم دەبێتەوە... مەشغەڵەتی ژیان سەرقاڵی دەكات ... وجێگیربوون لەدەست دەدات!.... كەسێكی تر.. دەیەوێت شتێكی دەستكەوێت.. بەڵێن بە خوای گەورە دەدات كە دەستی كەوت و ئاواتەكەی هاتە دی ئەوە

خواپەرستیەکەی زیاد دەکات و تۆبە دەکات لە سەرپێچیەکانی و چەسپاو دەبێت لەسەر ڕێگای دینداری...

کاتێك دەگات بە ئاوات و مرادی خۆی... ئەو بەڵێنەی لە یاد دەچێت کە یابوی بە خوای پەروەردگارا!...

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ(٧٥)فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوا وَهُمْ مُعْرِضُونَ(٧٦)فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ) (التوبة: ٧٥-٧٧) واتە ( وە لە ناپاکان کەسانێك هەن کە پەیمانیان داوە بەخوا، سوێند بە خوا ئەگەر خوا لە بەهرەی خۆیمان پێ ببەخشێ، ئەوە بێگومان خێرو چاکە دەکەین، وە بێگومان لە چاکەکاران دەبین، کەچی کاتێ خوا لەبەهرەی خۆی پێبەخشین، ڕژدی و چروکیان تێدا کردوو پشتیان هەڵکرد، لەکاتێکدا ئەوانە ڕوو وەردەگێڕن، ئینجا خواش سەرەنجامی ئەوانی گێڕا بە دووڕوویی لە دڵیاندا، هەتا ئەو ڕۆژەی بەدیداری (خوا) دەگەن، بەهۆی نەبردنە سەری ئەو بەڵێنەی کەدابوویان بەخوا،و بەهۆی ئەوەشەوە درۆیانکرد) بەڕاستی ئەمە وێنەیەکی خراپە.. نەکەیت بکەویتە ناویەوە، نەکەی بەڵێن بە پەروەردگارمان بدەیت و ناپاکی بکەیت لە پەیمانەکەتدا!...

## دەڵێ.... ئیمانم هێنا بە خوا!....

پیاوێك ڕوو دەکاتە خوای گەورە.. دوایی ئازار دەدرێت.. دەپرسیت: چۆن ئازار دەدرێت؟ بەهۆی بەختەوەری و حەماسەت و دڵخۆش بوون و پەرۆشی بۆ ئاینەکەی.. دەست دەکات بە قسەکردن لەگەڵ خەڵکی.. خەڵکیش پشتی تێ دەکەن و ئازاری ئەیەن!... یان گاڵتە بە هاوڕێکانی دەکەن... یان خزمانی و نزیکانی ... زۆری بۆ دێنن و بێتاقەتی دەکەن.. ئەمیش پاشگەز دەبێتەوەو لە جێگیربوونەکەی!.. یان ئافرەتێکی پابەند باڵای دەپۆشێت.. ئازاری دەدرێت لەسەر کارەکەی بەهۆی باڵا پۆشیەکەیەوە... بۆیە واز لە باڵا پۆشی دێنێت.. ئەی کوا ڕاستگۆیی قسەکەت: ئیمانم هێنا بەخوا؟

وە سەبارەت بە نموونەی ئەو جۆرە کەسانە خوای گەورە دەفەرموێ (وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَقولُ آمَنَّا بِاللّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللّهِ ) (العنكبوت) (١٠) واتە: ( هەندێ لە خەڵکی دەڵێن باوەڕمان بەخوا هێناوە، ئینجا کاتێ سزا بدرێ لە پێناوی خوادا لەلایەن کافرانەوە)، ئازارو سزای خەڵکی وەکو ئازارو سزای خوا دادەنێ)

ئایا ئەو داماوە ئەندازەی ئەو ئازارەی لە بیر چوویەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دووچاری دەبوو لەکاتی بانگەوازکردنی خەڵکیدا؟!.. لەگەڵ ئەوەشدا پاشگەز نەئەبوویەوەو حەماسەتی و خۆشەویستنی بۆ ئاینی خواو ڕێنمایی خەڵکی تیایدا خامۆش نەدەبوویەوە.. و دەیفەرموو ( اللهم اغفر لقومي.. فإنهم لا يعلمون)( الامام أحمد في مسنده (الحديث:١/٤٤١) واتە (پەروەردگارا لە گەلەکەم خۆشببە، چونکە بەراستی ئەوانە نەزانن) بە دڵێکی ساف و خۆڕاگریەکی دڵنیایەوە بانگەوازی دەکردن!..

## (وە ماوەیکی دوورو درێژیان بەسەردا تێپەڕی )

وە لە جۆرەکانی ناجێگیری: مرۆڤێکە ساڵانێکی درێژی بەسەربردووە لە دینداریدا.. بەلآم هێشتا تام و چێژی شیرینی ئیمانی نەکردووە.. بێگومان ئیمان شیرینیەکی هەیە، هەموو تاڵیەکی ئەم ژیانە لادەبات..

پەرستشەکانی کاڵ دەبێتەوە.. ئەو ڕۆحە سەرنج ڕاکێشەی تیا نامێنێت کە دەیجولآند.. وە لەکاتی ئەنجامدانی پەرستشەکاندا هەست بە لەزەت ناکات.. دەبێتە ڕۆتینێکی سارد!..

سەبارەت بەوانە، خوای گەورە دەفەرموێ: (أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنْ الْحَقِّ وَلاَ يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمْ الأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ) (الحديد:١٦) ... واتە (ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران، کە دڵیان ملکەچ بێ بۆ ئامۆژگاری خوا، وە ئەو قورئانەی کە ناردویەتیە خوارەوە، وەك ئەو کەسانە (جولەکەو گاور) مەبن، کە لەمەو پێش کتێبی ئاسمانیان پێدرا، وە ماوەیەکی دوور و درێژیان بەسەردا تێپەڕی، ئەنجا دڵیان ڕەق بوو، وە زۆربەیان یاخی و لە سنوور دەرچوون)

دەڵێن کاتێ هاوەڵان لۆمەی خوای گەورەیان گوێ لێ بوو بۆیان، لەتاو شەرم و ترس دەگریان..

کوا گوێپێدانی ئێمە؟!.. کوا ملکەچیمان؟!.. ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دڵەکانمان ملکەچ بن بۆ زیکری خوا؟...

## لە موجاهیدەکان؟

وە نموونەیەکی تر لەسەر ناجێگیری: پیاوێك زۆر بە حەماسەت و هێزەوە ڕوو دەکاتە خوای گەورە، وە بەرگری لەزۆر مەسەلە دەکات کە تایبەتە بە ئیسلام و موسڵمانانەوە و کار بۆ ئیسلام دەکات... پاشان.. سارد دەبێتەوە و حەماسەتی نامێنێ.. ئیتر ئارامگر نابێت لەبەردەم ئەو نارەحەتیانەی یەتە ڕێگای.. خوای گەورە دەفەرموێ: (أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ) (ال عمران: ١٤٢) واتە ( ئایا ئێوە وا گومانتان دەبرد، کە دەچنە بەهەشت، لەکاتێکدا هێشتا خوا دەری نەخستوە ئەوانەی تێدەکۆشن لە ئێوە، وە هێشتا دەری نەخستووە خۆ ڕاگران)

نموونەیەکی تری وەك ئەو: پیاوێك بە خێرایی ڕوودەکاتە خوای گەورە.. پاشان خەمی ژیان و ووردەکاریەکانی و پێداویستیەکانی سەرقاڵی دەکەن... پاشگەز دەبێتەوە لە فیکرەکە.. و سار دەبێتەوە... خوای گەورە دەفەرموێ: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنْ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ ) (التوبة/٣٨) ... واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەوە چیتانە کاتێ پێتان دەوترێ دەرچن (بۆ جیهاد) لە پێناوی خوادا، لە شوێنی خۆتان ناجوڵێن، ئایا ئێوە ڕازین بەم ژیانەی دنیا لە باتی پاشەڕۆژ، دەی کامەیە خۆشی و شادی ئەم ژیانە نزیکە لەبەرامبەر پاشەڕۆژدا کە زۆر کەمە)

لۆمەو سەرزەنشتێکی سەختە دڵان دێنێتە لەزرین!..

بۆ. ئەوانەی بەرێگای ئیماندا ڕۆشتون و پاشان وەستاون یان گەڕاونەتەوەو جێگیرو خۆڕاگر نەبوون. یەك ئایەت ئاگاداریان دەکاتەوە لە مەترسی کارەکەیان.. بە نموونەیەکی جوان باسیان دەکات.. خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلاَ تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنْ بَعْدِ

قُوَّةٍ أَنكَاثاً تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ أَنْ تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ إِنَّمَا يَبْلُوكُمْ اللَّهُ بِهِ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ) (النحل: ٩٢) ... واته: ( وەك ئەو ئافرەتە مەبن کە رێسەکەی کردەوە بە خوری، لەپاش بادان و رِستن و شەتەك دانی، سوێندو پەیمانەکانتان دەکەن بەهۆی ناپاکی و فروفێڵ لە نێوانتانا، لەبەر ئەوەی دەستەو کۆمەڵێك زۆرترو بەهێزترە لە دەستەو کۆمەڵێکی تر، خوا بەوە تاقیتان دەکاتەوە، وە سوێند بەخوا لە رۆژی دواییدا بۆتان روون دەکاتەوە، ئەوەی کە ئێوە تیایدا جیاواز بوون)

یا الله ! ئایا وێنای ئەو ووێنە مانادارە دەکەیت؟! ئافرەتێك بەردەوام کار دەکات تا پۆشاکێکی جوان بچنێت، بەڵام کاتێ دەگاتە گرێ ی کۆتای، پەتەکە بەدەستیەوە دەپچرێت... چنینەکە شاش و ئالۆسکاو دەبێت و ئیتر بۆ هیچ شتێ ناشێت!..

## هەنگاوەکانی سەرەتا بۆ جێگیر بوون

پرسیارەکە سەر لە نوێ سەرهەڵدەداتەوە: چۆن جێگیر بین؟ هەنگاوی کردەیـم پێ بڵێ یارمەتیم بات لەسەر جێگیر بوون... دوای هەموو ئەو شتانەی باسکران سەبارەت بە شێوازەکانی لە راستیدا نارەحەت بوو بەلامەوە ئەو هۆکارانە بەخاڵ نیشان بدەم، چۆن باسی بکەم و لە کوێوە دەست پێبکەم.. بینیم کە یەکەمین هەنگاو بۆ جێگیر بوون.. و یەکەمین رێگا

یەکەم: تێگەیشتنی دروستە بۆ ئیسلام... بەڵێ ئەگەر بەچاکی لە ئاینەکەمان تێبگەین لێ ی پاشگەز نابینەوە، وە لاواز نابین و هەڵە ناکەین..

دووەم: خوێندنەوەی ژیان و بەسەرهاتی پیاوچاکە جێگیرەکان و چیرۆکی پێغەمبەران کە هەمیشە خۆراگر بوون لە پێش هەموویانەوە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ نموونە کتێبی (ژیانی پێغەمبەری مەزن) یان (گوڵاوی سەرمۆر)بخوێنەرەوە...

خوای گەورە دەفەرموێ : (وَكُلاً نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ) (هود: ١٢٠) واتە (هەمووت بۆ دەگێرینەوە لە هەواڵی پێغەمبەران ﷺ ئەوەیە کە دڵی تۆی پێ دامەزراو بکەین، وە لەم سورەتەدا هەق و راستیت بۆهاتووە، وە ئامۆژگاری و پەندیشی تیایە بۆ بڕواداران)

سێ یەم: زیکرو یادکردنەوەی زۆری خوای گەورە، بەتایبەتی وتنی ( لا إله إلا الله) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (جددوا أيمانكم) قيل : يارسول الله كيف نجدد إيماننا؟ قال ﷺ (أكثروا من قول لا إله إلا الله)( الامام أحمد في (مسنده) (الحديث:٣٥٩/٢) واتە ك (ئیمانتان نوێ بکەنەوە.. پرسیاریان لێ کرد: چۆن ئیمانمان نوێ بکەینەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ووتەی: لا إله إلا الله زۆر دووبارە بکەنەوە..)... بەڵێ ئەمە گرنگ بۆ کەسێك کە شیرینی ئیمانی وون کردبێت و گەڕابێتە دواوەو جێگیر نەبووبێت.

چوارەم: ئارامگرتن.... پەلە مەکەو بەری جێگیربوونت بچنەوە.. و ئارامگربە... خوای گەورە دەفەرموێ : (وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ ) (النحل:١) واتە: (پشت بە ئارامگرتنی و نوێژ ببەستن) ... مرۆڤ جێگرنابێت هەتا ئاکاری ئارامگرتن تیایدا پتەو و ڕەسەن نەبێت.

پێنجەم: ئەنجامدانی پەرستشی زۆر، بێگومان ڕۆشنایت پێدەبەخشێ و بەرچاو ڕۆشنت دەکات و هەنگاوت و دڵت فیکرت ڕۆشن دەکاتەوە...

شەشەم: سەرسام نەبوون بەخوود.. سەرسام نەبیت بە خۆت، چونکە بێگومان دەردێکە بۆ کەسی دیندار و ئەو کەسەی بە ڕێگایەکی دروستدا دەڕوات، لە بیری دەچێت کە ئەو زاتەی ئەوەی پێبەخشیوە خوای میهرەبانە بۆیە سەرسام دەبێت بە خۆی وەك چۆن (قارون)سەرسام بوو ووتی: (قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِنْ قَبْلِهِ مِنْ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلاَ يُسْأَلُ عَنْ ذُنُوبِهِمْ الْمُجْرِمُونَ ) (القصص:٧٨) واتە:( (قارون) ووتی: بێگومان ئەم سامانەم پێدراوە بەهۆی زانیاریەکەوە کە هەمە، ئایا (قارون)نەیزانیوە کە بەڕاستی خوا، لە چەرخەکانی پێش ئەمدا لەناوی بردووە، کە سانی وا کە لەو بەهێزتر بوون، کۆڕو کۆمەڵیشیان لەو زۆرتر بووە، (کاتێ سزای خوا هات) پرسیار ناکرێ لە تاوانەکانی ئەم تاوانبارانە)

لێرەوە لاربوونەوەی دەست پێدەکات و جێگیر بوونی لە دەست دەدات..

تێبینی دەکەیت بێگومان هەموو ئەوشتانەی کە باسمانکرد بابەتانێکی ئیمانین.. کەواتە کەسانی تر چۆن جێگیر و خۆڕاگر بن... ناموسڵمانەکان؟... بۆ نموونە (غاندی) جێگیربوونێکی سەیری هەبوو هەتاگەشت بە ئومێدەکانی خۆی... هەرچەندە بیرو باوەڕێکی نادروستیشی هەیە.. نهێنیەکە لەوەدا: ئەوەیە کە مرۆڤەکە خاوەنی دۆسیەیەك بێت

ـەژیاندا... ئەگەر خاوەنی ئامانجێك و مەسەلەیەكی زیندوو بێت و هەمیشە لە ویژانیدا بێت بە شەو و بەڕۆژ .. ئەوە هەموو نارەحەتیەكان لەبەردەوامیدا چۆن دادەدەن... وجێگیر دەبێت!..

دووەم: ڕێزگرتنی خود... سەرنزمی خۆم قبوڵ نەكەم... ڕازی نەبم پێی سەروەرو سەر بەرز نەبێت!...

## هۆكارەكانی جێگیر بوون

ئەمە ئەو هەنگاوە كردەییانەیە كە بەڵێنم پێ دایت.. كە چوار شتە:

یەكەم: دووعا

دووە: هاوڕێیەتی صاڵحان

سێیەم: كار كردن بۆ ئیسلام

چوارەم: دەستگرتن بە كتێبی خوای گەورەوە.. با هەنگاو هەنگاو دەست پێ بكەین

## دووعا چەكی تۆیە

دووعا: واتە پشت بەستن بە خوا ﷻ بە دووعا كردن ... كەواتە دووعا مۆخی عیبادەتە.. لەبەهای دووعا كەم مەكەرەوە... بەكەم سەیری مەكە چونكە بێگومان چەكی هەمیشەیی موسڵمانە.. چونكە جێگیر بوون لەلایەن خواوەیە.. گوێ بگرە ئەم ئایەتە چیمان پێ دەفەرموێ:-

( وَإِنْ كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنْ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِي عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذًا لاَتَّخَذُوكَ خَلِيلاً(٧٣)وَلَوْلاَ أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلاً) (الاسراء: ٧٣-٧٤) ... واتە: ( وە بە ڕاستی نزیك بوو ئەوانە لات دەن، لەوەی كە نیگامان كرد بۆت، بۆ ئەوەی جگە لە قورئان شتێك بۆ ئێمە هەڵبەستیت، (وە ئەگەر گوێڕایەڵیان بویتایە) ئەوە لەو كاتەدا دەیانكردیت بەدۆست و خۆشەویستی خۆیان ،خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو نەكردایە، بە ڕاستی نزیك بوو تۆ، كەمێك بەلایاندا بچیت)

دەستت و لێوت دەگوشیت و دەڵێیت: دوای هەموو ئەمانە ئایا چاوەڕوانی ئەمەمان دەکرد لێت؟!.. بەڵێ برای بەڕێزم... بێگومان کۆمەك لە خواوەیەو بە دڵێکی ملکەچ و دەروونێکی موشتاقەوە داوای بکە.. ئایا دەتەوێت ئیمانت جێگیر بێت؟

ئایا دەتەوێت ساتی مردنت جێگیر بیت کاتێ دەڵێیت: (أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا رسول الله)

ئایا دەتەوێت بەردەوام هۆگر بیت بە ئیسلامەوەو کاری بۆ بکەیت؟

ئایا بە خێرایی ئامادەیت بۆ تەوبە کردن ئەگەر هەڵەیەکت کرد...؟... ئایا هەموو ئەمانەت ئەوێ؟ دەی پشت بە خوا ببەستە... داوای لێبکە جێگیرت بکات.. ئەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێ: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ) (إبراهيم: ٢٧) واتە: ( ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات، بەوتەی بەڕێ و جێ (کە شایەتومانە) لە ژیانی دنیادا و لە ڕۆژی دوایدا، وە خوا ستەمکارانیش گومڕا دەکات، وە خوا هەرچی بیەوێ دەیکات)

ئایا داوای جێگیر بوون دەکەیت؟ لە زاتێکی وا کە جێگیر بوون دەبەخشێت. لە خوای بالاّ دەست.. ئەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێ: (إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلاَئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ) (الانفال: ١٢) ... واتە:( ( بینەوەیر) کاتێ کە پەروەردگارت نیگای بۆ فریشتەکان نارد، کە بێگومان من (خوا)لەگەڵتانم، دەی دڵی کەسانێك قایم و دامەزراوکەن کە باوەڕیان هێناوە، بە زوویی ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەو کەسانە کە بێباوەڕ بوون، جا ئێوەش لەسەرووی گەردنیان بدەن، وە لەهەموو سەرپەنجەکانیان بدەن)

## داوای جیگیر بوون بکە

پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ پێشەوامان (عەلی) ﷺ کرد و پێ ی ووت (برۆ بۆ لای خەڵکی یەمەن، و بانگیان بکە بۆ ئیسلام و فێری ئیسلامەتیان بکە) ئیمامی عەلیش ﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دەمنێریت بۆ لای گەلێك کە لە من بەتەمەنترن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (برۆ ئەی عەلی.. خوای گەورە زمانت چەسپاو دەکات و ڕێنمایی دڵت دەکات).

وە تەانەت لە گۆڕیشدا کاتی مردن... بە کۆمەکی و پشت بە خوابەستن نەبێت جێگیر -بن... پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هاوەڵێکیان ئەسپەردە بکردایە، دەوەستا لەسەر گۆڕەکەی و دەیفەرموو (أستغفروا لاخيكم واسئلوا له الثبات فإنه الآن يُسأل) (أبو داود: ٣٢٢١) ... واتە: ( داوای لێخۆش بوون بۆ براکەتان بکەن و داوای جێگیر بوونی بۆ بکەن، بێگومان ئەو ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت ... لەبەر ئەوە لە دووعاکانی پێغەمبەر ﷺ دوای هەموو نوێژێ ئەمە بوو (اللهم إني أسألك الثبات في الامر، وعزيمة الرشد)الطبراني في (المعجم الكبير)الحديث: ٧/٧١٧٩) ... واتە: ( پەروەردگارا داوای جێگیر بوونت لێ دەکەم لە فرمانەکاندا، و عەزیمەت لە سەر رێگای ڕاست)

پرسیار لە خاتوو (أُم سَلمة) خێزانی پێغەمبەر ﷺ کرا: پێغەمبەر ﷺ چ دووعایەکی زۆر دووبارە دەکردەوە؟ ووتی (يا مُقَلِبَ القُلُوبْ ثَبِتْ قَلْبي عَلى دِينِكَ) واتە ( ئەی گۆڕەری دڵەکان، دڵم جێگیر بکە لەسەر ئاینەکەت)... أم سلمە رضي الله عنها دەڵێ: لە پێغەمبەری خوا ﷺ م پرسی ، بۆچی ئەو دووعایە زۆر دووبارە دەکەیتەوە؟... پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن القُلُوبَ بَيْنَ أَصْبَعَينِ مِن أَصابِعِ الرَحمن، يَقَلِبُها كَيفَ يَشاء) واتە (بێگومان دڵەکان لە نێوان دوو پەنجەی خوای گەورەدان چۆن بیەوێت ئاوا هەڵیان دەگێڕێتەوە)

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ) (آل عمران:٨) (الترمذي: ٣٥٢٢) واتە (پەروەردگارا دڵمان مەچەمێنەرەوە دوای ئەوەی رێنمونیت کردین، وە پێمان ببەخشە لە لایەن خۆتەوە، بەزەییەك (میهرەبانیەك) ، بەڕاستی هەر تۆی بەخشندە)

أم سلمە رضي الله عنها ، دەڵێ لەو ڕۆژە بەدواوە ئەو دوعایە دەڵێمەوە : ( يا مُقَلِبَ القُلُوبِ والانصار ثَبِتْ قَلْبِي عَلى دِينِكَ) ( ئەی گۆڕەری دڵ و سەرکەوتنەکان، دڵم جێگیر بکە لەسەر ئاینەکەت)

ئایا جێگیر بوونت دەوێ؟... پەنا بگرە بەخوا... چونکە بێگومان ئێمە ناتوانین هیچ کارێ بکەین بە بێ پشت بەستن بە خوا... لەبەر ئەوە.. لە هەموو نوێژێکداو لە هەموو ڕکاتێکدا ئەمە دووبارە دەکەینەوە (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) واتە ( خوایەگیان تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها پشت بە تۆ دەبەستین)

لە دووعاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە بوو (یا ولی-الاسلام و أهلە ثبتنی حتی ألقاك (الهندي في كنز العمال (الحديث: ٣٩١٠) ... واتە (ئەی وەلی ئیسلام و خەڵکەکەی جێگیرم بکە هەتا دەگەم بە دیدارت)

بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا: (حَتی أَلقَاكَ) و نەت فەرمووە: هەتا دەمرم؟ چونکە تەنانەت لەکاتی مردنیشدا پێویستمان بە جێگیر بوون هەیە... لەکاتێکدا دوو فریشتەکە پرسیارمان لێ دەکەن.. بۆ جێگیر بوون پشت بە خۆت نەبەستی.. و نەڵێیت: من کەسێکی بەهێزم و هیچ شتێ کارم تێناکات!. پاشگەز نابمەوە.. تۆ بەبێ کۆمەك و یارمەتی خوای گەورە هیچت لەدەست نایەت.. نموونەیەك هەیە هەموو ساڵێك ڕوو دەدات... لەکاتی چونی حاجیەکان بۆ کێوی عەرەفات... هەر یەکەیان بە خودی خۆی دەڵێ: ئەمڕۆ هەردووعایە بێ بەخەیاڵمدا دەیکەم و دەخوازم هەرچی دووعایە بیکەم.. بۆچی نا لە کاتێکدا دووعاکان وەڵام دەدرێنەوە؟!!!... بەڵام ناتوانین... کاتێ لە عەرەفاتین لە سەعات یانزەی بەیانیەوە کەس نابینیت بتوانێت دوعا بکات بە حەقی خۆی.. حاجیەکان یان خەووتون یان بەبێ حەماسەت و بەبێ دڵێکی ئامادە دووعا دەکەن.. هەستکردن بەبێ توانایی بڵاو دەبێتەوە.. بۆچی؟ چونکە وا گومانمان دەکرد کە دەتوانین بە ئاسانی لە خودی خۆمانەوە دوعا بکەین... نا نە بەخوا ناتوانین هەتا خوای گەورە کۆمەکمان نەبێت... هەموو ساڵێ ئەمە ڕوو دەدات.. پاشان.. دوای نوێژی عەسر.. کاتێ خۆمان بەری دەکەین لە هێزمان و دەروبەرمان... دەستەکان بەرز دەبنەوەو خوای گەورە توانای دووعا کردنمان پێ دەبەخشێت و زمانەکان دێنەگۆو دڵەکان ملکەچی و زەلیلی دەنوێنن بۆ خوای گەورە ﷻ.

## دەروون ئارامیە.... لەگەڵ صالحاندا!...

ئایا جێگیر بوونت دەوێ؟ کەواتە پێم بڵێ هاوڕێکانت کێن؟ منیش ئەوکاتە پێت دەڵێم تۆ جێگیر دەبیت یان نا!.. ڕابمێنە لە سورەتی (العصر) (وَالْعَصْرِ(١)إِنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ(٢)إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ) ... واتە: ( سوێند بەکات. بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندایە، مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ و کردەوە

چاکەکانیان کردبێت، وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئاینی ڕاست، وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارامگرتن) ئایا هەستت بە شتێ کرد؟

یەکەم: بێگومان ئەوەی لەگەڵ گرۆی ئیمانداراندا بێت زیان مەند نابێت.. بەڵکو تەنها ئەو کەسە زیانمەندە کە لەگەڵ صالحاندا نیە !..

دووەم: سووربوون لەسەر پشت بەستن بە هەق و بە ئارامگرتن.. ئەمە گرنگترینی ئەو شتەیە کە بەهۆی هاودەمیی صالحانەوە کۆی دەکەیتەوە...جێگیر بوون لەسەر هەق و لەسەر ئارامگرتن لەو پێناوەدا.. ئیمامی شافیعی دەڵێت: (ئەگەر لە قورئاندا هیچ نەبوایە بێجگە لەو ئایەتە، ئەوە بەس بوو بۆ موسڵمانان)!..

ئازیزانم... هاوڕێ و هاودەمی صالحان...

ڕابمێنە لە فەرمایشتی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ (وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلاَ تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلاَ تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ) (الكهف:٢٨) ... واتە: ( خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە (و دەی پەرستن)بەیانیان و ئێواران، کە مەبەستیان ڕەزامەندی خوایە، چاوەکانت لەوان لامەدەو وەرمەگێڕە (بۆ کەسانی بێباوەڕی دەوڵەمەند) کە جوانی و ڕازاوەیی ژیانی ئەم دنیایان دەوێت، وە بە گوێی کەسێك مەکە کە دڵی لە یادی خۆمان بێئاگا کردووەو شوێنی ئارەزوی خۆی کەوتووە، ئەوە هەموو کارەکانی لە سنوور دەرچون)

هەتا تۆش ئەی پێغەمبەری خوا پێوستت بە هاوڕێیەتی صالحان و دڵسۆزان هەیە؟.... بەڵێ.. هاوڕێیەتی صالحان بکەو دوور بکەوەرەوە لە بێئاگایان لە خوا (وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا) ئەگەر یەکێ لە هاوڕێ نزیکەکانت دوور بوو لە خواوە، تۆش دوور بکەوە لێ ی!..

ئایا بەڵگەت دەوێ لەسەر شوێنەواری هاوڕێ ی خراپ ؟ گەورەترین نموونە لەسەر ئەوە (عقبة بن معيط)ە .... یەکێك بوو لەوانەی کە زۆر ئازاری پێغەمبەری خوایان دەدا، لەجەنگی بەدری گەورەدا بەکافری کوژرا... ئایا دەزانی ئەو (عقبە)یە دانیشت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ داو بڕوای بە ئیسلام هێنا، لەو کاتەدا، ڕۆی بۆلای ئەبو جەهل کە هاوڕێ ی

نزيکی بوو، ئەو هەواڵەی پێدا.. ئەبو جەهل - نەفرەتی خوای لێ بێ - ووتی: تۆ پارێزگاری هاورێیەتیمان ناکەیت هەتا نەچیت و تفێك نەکەیتە ڕوخساری محمد! ئەو گەمژە نەزانەش ئەو کارەی کرد.. بەهۆی هاورێ خۆشەویستەکەیەوە دنیاو ئاخیرەتی لەدەست چوو.. لە نێوان دوو هەڵبژاردندا بوو: یان ئیسلام یان هاورێکەی؟ بۆیە هاورێکەی هەڵبژارد و بوو بە کەسێك کە خوا لەبارەیەوە فەرمووی... (وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَالَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً(٢٧)يَاوَيْلَتِي لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاَنًا خَلِيلاً(٢٨)لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنْ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولاً) (الفرقان: ٢٧- ٢٨) واتە ( ئەوە ڕۆژێکە کەستەمکار قەپ دەکات بە هەردوو دەستی خۆیدا، و دەڵێ کاشکای لە گەڵ پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر، ئای تیاچوون بۆ من، خۆزگە فلاّن کەسم نەکردایە بە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆم، بەڕاستی منی لە قورئان وێڵ کرد، دوای ئەوەی قورئانم پێ گەشت( و باوەڕم پێ هێنا)، وە شەیتان هەمیشە پشت تێکەرو پشت بەردەرە بۆ ئادەمیزاد)

نەکەی لەوانە بیت کە لەپەشیمانی و حەسرەتدا لە ڕۆژی قیامەتدا دەستی خۆیان دەگەزن... هاورێی صاڵحان بەو ئارامگربە لەگەڵیان.. جێگیرو بەختەوەر دەبیت!...

## ئیمانیان هەیە... و کار ئەکەن!...

کار بۆ ئیسلام بکە... هەر کارێ بێ.. کارێ سوود بە ئیسلام و دۆزەکەی و موسڵمانان و پێداویستیان بگەیەنێ... گوێ لە فەرمایشتی خوای گەورە بگرە: (إِنْ تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ) (محمد: ٧) واتە (ئەگەر ئێوە خوا (بیروباوەڕەکەی)سەرخەن خواش سەرتان دەخات) زانایان دەڵێن: دوو ناوچە هەیە لە مێشکدا تایبەتن بە فیکرەوە: ناوچەی بەهاوقەناعەتەکان.. ناوچەی ناسنامەو ئینتیما .. پێویستە بەهاوقەناعەتەکان بگۆڕێن بۆ ئینتیما... کارکردن لە پێناوی بەهاکان و قەناعەتەکان ئەوە دەیگوازێتەوە بۆ ئاستی ئینتیما... لەبەر ئەوە قورئان هەمیشە دوای ئیمان-کە بریتیە لە قەناعەت و دان پیانان-باسی کردەوە دەکات.. (امنوا) (وَعَمِلُوا)... بەڵکو ڕابمێنە لە فەرمایشتی خوای گەورە: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ) (ال عمران: ١١٠)

... واته: ( ئێوە پاشترین گەلێك بوون بۆ خەڵكی هێنرابێتە دی، فەرمان دەدەن بەچاكەو قەدەغەی خراپەكاری دەكەن و بڕوا دەهێنن بە خوا)

دەبینیت كردەوە پێش ئیمان كەوتووە!.. چونكە خوای گەورە كاری لە ئێمە دەوێت لە پێناوی ئەو ئیمانەداو كردنی بەواقیعێكی هەستپێكراو... مادام كار بۆ ئیسلام و خەڵكەكە دەكەیت... جێگیر دەبیت لە سەر ئیمان

## دەستگرتن بە كتێبی خواوە

دواهەمین و گرنگترین كارێ كە بیكەین بۆ جێگیر بوون: دەستگرتنە بە كتێبی خواوە بەخوێندنەوەو لەبەر كردن و كارپێكردن... قورئانی پیرۆز بخوێنەرەوە.. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ( إن هذا القرآن يختم في شهر ) ... واتە: ( بێگومان ئەم قورئانە لە مانگێكدا خەتم دەكرێت)... زۆر گرنگە لەهەموو مانگێكدا بە خوێندنەوە قورئان خەتم بكەین بەلانی كەمیشەوە یەك جار بێت.. هەموو ڕۆژێ جوزئێك یان جوزئو نیوێك.. تا بە قورئان و لەگەڵ قورئاندا زیندوو بیت.. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ( الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرِب) ... واتە ( ئەوە هیچ شتێك لەبارەی قوئانەوە لە ناخیدا نەبێت وەك ماڵێكی ڕووخاو وایە)

قورئان زۆر بخوێنەرەوەو فێری بە... فێری باش خوێندنەوەی قورئان (التجويد) و تەفسیری قورئان ببە، بژی بە قورئان و بۆ قورئان و لەگەڵ قورئاندا.. ئەو كاتە هەست بە جێگیری دڵت و دەروونت دەكەیت...دوای هەموو خەتمێك لە پەروەردگار بپاڕێرەوە...و لە ناخی دڵتەوە ...تا قورئان ببێتە ڕێنومایكەرو ڕێبەری تۆ.. و تا خوای گەورە جێگیرت بكات لەسەر ڕێگای ڕاست، تا بەدیداری شاد دەبیت و ئەویش ڕەزامەندە لێت..

خوای گەورە ئێمەو ئێوەش جێگیر بكات...آمین.....

# ئومێد

## ئایا مەترسی بێئومێدی دەزانیت

لەوانەیە بێت بە خەیاڵتدا کە یاسای ﴿حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ هیچ پەیوەندیەکی بە ئومێدەوە نیە... بەڵکو تەنها تایبەتە بە کارکردن و گۆڕانەوە ! ..

بەڵام ... یاسای گۆڕان لە ژیاندا پێمان دەڵێ لە میاتی سووڕی گۆڕاندا ... ڕۆژانی تاریك و دەردی سەری دێتە پێشەوە ... لەوکاتەدا چی دەکەیت ؟

بێ چارەیی زاڵ دەبێ بە سەرتا ؟ ! ... لەوانەیە بڵێی : کارکردن هیچ سودێکی نیە ... لە مەترسی بێئومێدی ئەوەیە کە دەبێتە هۆی خەلەل و ناتەواوی لە باوەڕ بە قەزا و قەدەردا لای کەسی بێئومێد ! بێئومێدیی مرۆڤ بەرەو بێ چارەیی دەبات ... ئەوکاتە مرۆڤ هێز و عەزیمەت و بزوان لە دەست دەدات .

لە مەترسیەکانی بێئومێدی ئەوەیە دات دەماڵێ لە هەموو ئومێد و هەموو بەهایەك کە دەیخوازیت لە ژیاندا ... ئەو کاتە حەز و لێبڕان و باوەڕ بە خۆبوونت نامێنێ ...

لەبەر ئەوە کاتێ تەماشای نەتەوە دەکەیت و دەبینیت کە دۆڕاوە ... لە هەمووشتێکدا شکستی خواردووە ... لەبەر ئەوە نا هیچ نازانێ یان توانای داهێنانکاری نیە ... بە پێچەوانەوە ... بەڵام چونکە ئومێدی تێکشکاوە ... کەس نایەوێ کار بکات ... کەس نایەوێ بەرهەمهێن بێت ... کەس هەوڵی پێشکەوتن نادات ... لە هەموو بوارەکاندا ... لە وەرزش ، لە ئەدەب ، لە پیشەسازی ... مەگەر هەندێ حاڵەتی سەرکەوتن نەبێ کە حاڵی گشت نەتەوەی پێ ناپێورێ ...

ئەنجامی ترسناکی ئەمەش شکست خواردن و بێ چارەیە توشی پەل و پۆی نەتەوە دەبێت ... وە متمانە بە خوای باڵا دەست کەم دەبێتەوە ... نەتەوەش دادەڕوخێ ... داڕوخان بەدوای داڕوخاندا دێت ...

ئایا مەترسی بێئومێدیت بینی ؟ وە ئایا باوەڕت کرد بە گرنگی قسەکردن لەسەر ئومێد و چاندنی لە دەروونەکاندا تا گۆڕانکاریی چاوەڕوانکراو رووبدا؟ !

## خۆر ... سەرلەنوێ هەڵدێتەوە !

ئەگەر تەماشای لایەنی بەرامبەر بکەیت لە وێنەکەدا ... دەبینیت کە ئومێد ژیانتی پڕکردووە لە دروستکاریی ... ئومێد واتە دروستی ... واتە متمانە بە خوا و متمانە بە خۆ ... واتە ووزە و بزوان و بەرهەم و سەرکەوتن.

پێویستە ئومێد بەردەوام بمێنێتەوە ... دەبێ لە ناخماندا بیچێنین ، نابێ سەرت بابدەیت و بڵێیت: بەڵێ ... ئومێد لە ئارادا هەیە ... پاشان بڕۆیت بەسەریدا و بەبێ ئەوەی لە دڵتدا بیچێنیت! ... نەخێر ... هیچ شتێ ناگۆڕدرێت ...

ئەگەر ئومێدمان لە دەروونەکاندا رواند ... ئەوا گومانی باشە بە خوای گەورە زیاد دەکات ... وە هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانمان گەشە دەکات ... دوعاکردنت و ملکەچیت بۆ خوا زیاد دەکات... وە بەرهەمت و هەوڵدانت زیاد دەکات ...

ئومێد ووزەیەکی مەزنە مرۆڤ دەبزوێنێ و بەرهەمداری دەکات ... گۆڕانکاریش پێویستی بەم بزواندنە هەیە بەرەوپێشەوە ... وە ئەگەر نا ... هەموو قسەکانمان دەربارەی گۆرنکاریی لەم کتێبەدا هەموو مانایەکی لە دەست دەدات .

ئومێد ئەوەیە سەربەرزی بگەڕێنێتەوە بۆ نەتەوە ... ئومێد ئەوەیە ژیانێکی رێزدارانە بەرینە سەر ، ئومێد ئەوەیە گوزەرانمان باشتر ببێت ... ئومێد ئەوەیە زەوی موسڵمانان بگەڕێتەوە بۆ خۆیان ... ئومێد ئەوەیە ئەم (١٠٠) ساڵەی دوایی لە تەمەنی ئەم نەتەوەیە بە قەیران و داڕوخانەکانیەوە دووبارە نەبێتەوە ... ئومێد ئەوەیە دوای شەوێکی درێژ خۆر هەڵبێت ... پێویستە ئەمە لە دڵی خۆتدا بچێنیت ..

## ئاینی مژده بەخش ... ئاینەكەی تۆیە ! ...

برای ئازیزم ئایا دەزانیت ئەم ئاینەی ئێمە ئاینی خۆشی و مژده بەخشینه ... ووشەی مژد نابینیت دووباره بێتەوه و جەختی لەسەر بكرێت ، وەك چۆن لە ئیسلامدا دووباره بوەتەو:

مژده لە ماناكەیدا بریتیه لە خۆشی و شادی بەخشین به مرۆڤ تاوەكو ئەو دڵخۆش لەسەر روخسار دەردەكەوێت ... ئەو كاتەش ژێردەستی نامێنێت و مرۆڤ بەختیار و ئاسود دەبێت ..

## ئایا جوانیی مانای (( مژده )) ت بینی ؟

گوێ بگره بزانه چۆن چۆنی مژده بەخشی لە ناو موسڵمانانیدا بلاّودەكاتەوه .. تا ئەو رادەیەی ئەو ووشەیه زۆر جار لە قورئاندا دووباره بووەتەوه : ﴿وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ ( البقرة : ٢٥ ) واته : { مژده بده بەوانەی ئیمانیان هێناوه وه كردەوەی چاكەكان دەكەن ، كه بێگومان بەهەشتێك بۆ ئەوان كه بەژێریدا روبارانێك دەروات } .

﴿لَهُمْ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ ( یونس : ٦٤ ) واته : { مژده بۆ ئەوانه لە ژیانی دنیا و ژیانی ئاخیرەت و رۆژی دواییشدا } .

﴿وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ (آل عمران : ١٦٥ ) واته : { شادمانی بەوانەی ( برا تێكۆشەرەكانیان ) كه هێشتا نەگەیشتون پێیان . لە دوای ( شەهید بونی ) ئەمان نه هیچ ترسێكیان لە سەره ، نه ئەوانه هیچ غەم و خەفەتێك دەخۆن } .

﴿ وَبَشِرِ الصَابِرِين ﴾ ( البقره : ١٥٥ ) واته : { مژده بیه به ئارامگرەكان } ،

﴿ وَبَشِرِ الُمحْسِنِين ﴾ (الحج : ٣٧ ) واته : { مژده به چاكەكاران بده } .

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ(٣٨)ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ(٣٩)﴾ ( عبس : ٣٨،٣٩ ) واته {روخسارانێك لەو رۆژەدا گەش و جوانن، دەم به پێكەنین و شادمانن}. بەو شێوەیه دەبینین نزیكەی ٥٠ تا ٦٠ ئایەت دەربارەی مژده دەدوێن.

ئاینەکەی تۆ ئاینی ئومێد و مژدە بەخشینە... تۆش دەستەپاچە و بێچارەیت؟!! هەستە برای موسڵمان ... سەر لەنوێ ئومێد لە خۆتدا زیندوو بکەرەوە ...

## ئێمە تۆمان ناردووە وەك مژدە بەخشێك ﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بَشِيرًا﴾.

لەگەڵمدا تێبینی شتێکی جوان بکە: مرۆڤایەتی لە قورِ دروستکراوە ... بەڵام ئەسڵ لە مرۆڤایەتیدا مانای مژدە دانە ... واتە ئەسڵ لە تۆدا، واتە تۆ مژدە دەریت ... وە ئەسڵ لە نەتەوەی ئێمەدا ئەوەیە کە مژدە دەرە ! ...

شتێکی تر و رازاوەتر کە پەیوەستدارمان دەکات بە پێغەمبەری نازدارەوە ﷺ .. ئەوەیە کە هەر پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران مژدەی بۆ هاتووە ... بەڵام زۆربەی ئەو مژدانە پەیوەندی بە کورِەوە هەبووە ! .

ئەم ئایەتانە بخوێنەرەوە و رابمێنە !

﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ ( الصافات : ١٥١ ) واتە : { ئێمەش مژدەی کورێکی لەسەرخۆمان پێدا } ئەم مژدەیە بۆ پێشەوامان ئیبراهیم ﷺ بوو .

﴿فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ﴾ ( هود : ٧١ ) واتە : { ئێمە مژدەی ئیسحاقمان پێدا و دوای ئیسحاقیش یەعقوب}ئەم مژدەیەش بۆ سارەی خێزانی ئیبراهیم بوو.

﴿يَازَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى﴾ ( مريم : ٧ ) واتە : { ( خوای گەورە فەرموی ) : ئەی زەکەریا بە راستی مژدەت پێ دەدەین ، بە منداڵێ کە ناوی ( یەحیا ) یە } ئەم مژدەیەش بۆ پێشەوامان ( زەکەریا ) ﷺ بوو .

﴿يَامَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ ( آل عمران : ٤٥ ) واتە { ( فریشتەکە ووتی ) ئەی مەریەم ، بێگومان خوا مژدەت دەداتێ ، بە وتەیەك لەوەوە ، کە ناوی مەسیح ( عیسا ) ی کوری مەریەمە } ئەم مژدەیەش بۆ خاتوو مەریەم بوو .

وە تەنانەت کاتێ کاروانیەکان هاواریان کرد ﴿يَابُشْرَى هَذَا غُلَامٌ﴾ ( یوسف : ١٩ ) واتە { مژدە بێت ئەمە منداڵێکە } .. ئەوەش پەیوەندی بە کورەوە هەبوو ،،،

کەواتە ، هەموو پێغەمبەران و پیاوچاکانی پێش پێغەمبەری خۆمان ﷺ مژدەکانیان پەیوەندی بە کورەوە هەبووە ... تەنها نەتەوەی محمد ﷺ نەبێت ... ئەی مژدەی ئەمان پەیوەندی بە چیەوە هەبووە ؟ پەیوەندی بە پێغەمبەر ﷺ خۆیەوە هەبووە ! ...

بێگومان .. گوێ لە پێشەوامان عیسا ﷺ بگرە ، لە پەیامەکەیدا بۆ گەلەکەی هەواڵیان پێ دەدات : ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ ( الصف : ٦ ) واتە : { ( عیسا فەرمووی ) مژدەتان ئەیەمێ بە پێغەمبەرێك كە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە }

ئەم ئایەتەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ....

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ ( البقره : ۱۱۹ ) واتە : { بە راستی ئێمە تۆمان ناردووە بە هەق كە مژدەدەر و ئاگادارکەرەوە بیت } .

ئەی لاوانی نەتەوەی محمد ... گۆران بەسەر خۆتانا بێنن ، ئومێد و مژدە لە ناختانا بچێنن ... با لە دەمێکی ئێستاشماندا بەرهەمی نەبیننەوە ... بەلاّم ... ئومێد لە ئارادا هەیە ... بێگومان ئومێد لە ئارادا هەیە ....

## ئومێد رووناکی تۆیە .... لە خراپترین بارودۆخیشدا ...

ئەگەر چاو بخشێنیت بە ژیانی پێغەمبەر ﷺ دا .. دەبینیت ووشەی ( مژدە ) لە نارەحەتترینی بارودۆخەکاندا دیارە ... ئەو هاوەڵە گەورانە ... ئەوانەی بە مردنیان ئیسلام بەهاترین پیاوەکانی خۆی لە دەستدا ... ئەوانە کێن ؟ (( ئەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدرا )) مژدەکەیان بەهەشتی نەبراوە بوو ... ئیسلام ئاینێکە خوای گەورە هەموو ئان و ساتێ چاودێری دەکات ...

کاتێ مردنی خاتوو خەدیجە ﷺ نزیك بوویەوە .. لەلایەن خواوە مژدە دابەزی ...

ئەزانیت خاتوو خەدیجە کێیە ؟ خۆشەویستی پێغەمبەرە ﷺ و خێزانی و یارمەتیدەری و ئەو کەسەی سۆز و دانایی و چاودێری بەخشیبوو بە پێغەمبەر .... ئێستا ئەو دەمرێت ! ...

پێشەوامان جوبرەئیل ﷺ دادەبەزێ و هەواڵ دەدات بە پێغەمبەر ﷺ : ﴿بشر خديجة ببيت من قصب في الجنة ، لا صخب فيه و لا نصب ﴾ ( البخاری : ۳۸۲۰ / ومسلم :

٦٢٢٣ ) واته { مژده بده به خەدیجه ﷺ بەخانویەك لـه قامیشی ( مرواری ) لـه بەهەشت ، كه دووره لـه دەنگه دەنگ و ماندوو بوون}

وه پێشەوامان (عەبدوڵڵای كوڕی حەرام)، باوكی پێشەوامان جابری كوری عبداللـه ﷺ. پێشەوامان عبداللـه شەهید دەبێت و كوڕەكەیشی لـه پاڵیدا به ماتەمی دەگری ... پێغەمبەریش ﷺ بانگی دەكات : ﴿ أبشر يا جابر ﴾ {مژدەت لێ بێ ئەی جابر } ئایا تێبینی دەكەیت؟ ... مژدەم لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا بەڵام باوكم دەمرێت و حەوت كچی بەسەردا جێهێشتوم ... تۆش دەڵێی مژدەت لێ بێت؟ ... بەڵێ ... ! .. تەنانەت لـه نارەحەتترین ساتەكاندا .... مژده بەخشین! ...

﴿أبشر ياجابر ... ما كلّم الله أحداً قطّ إلاّ من وراء حجاب، و أحيا أباك فكلّمه كفاحاً – بغير حجاب – فقال : يا عبدي تمن عليّ أعطك﴾ ( الترمذي : ٣٠١٠ ، و إبن ماجه : ١٩٠ )

واته:{مژدەت لێ بێ ئەی جابر ... خوای گەوره قسه لـەگەڵ كەسدا ناكات لـه پشت پەردەوه نەبێت، باوكت زیندوو دەكاتەوه و ڕووبەڕوو قسەی لـەگەڵدا دەكات(بەبێ پەردە)، وه دەفەرموێ: ئەی بەندەكەم خوازیاری چیت با بتدەمێ}.

ئومێد ئەو ڕووناكی و تیشكەی تۆیه كه لـه نارەحەتترین بارودۆخدا پەیوەستداره پێتەوە، دەی تۆش ئەو تیشكه بچوكه بگەشێنەرەوه و بیكه به خۆرێك تا دەوروبەری خۆتی پێ ڕووناك بكەیتەوە! ...

## ئایندەی داهاتوو ... جوانتره !

ووشەی ئومێد ( گەر تەماشای فەرهەنگت كرد ) واته : ئەگەری ڕوودانی شتێكی باش لـه ئایندەدا كه دووره بێته دی ... ئاگاداری ووشەی (( دووره )) بە ... ئومێد دەردەكەوێت ... ئەوه ئومێده .. بۆ ئەوەی گرنگی ئومێد بزانیت ... هەمیشه بزانه كه مەسەلـەیەكی عەقیدەیی یه ...

ئەمه مانای چی یه ؟ ... واته ئومێد فەرزێكه لـه فەرزەكانی ئیسلام ! .. لـەوانەیه گوێت لـه یەكێكیان بێت بلێت (( خێرم بنوسرێت من ئومێدم هەیه ! )) ماشاء الله ! ... ؟

تۆ فەرزێك لە فەرزەكانی ئاینەكەت دەچەسپێنیت ! ... بۆ ئەوەی دڵنیابیت ئەم ئایەتە بخوێنەرەوە : ﴿وَلاَ تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الكَافِرُونَ﴾ ( یوسف : ٨٧ ) واتە : { نا ئومێد مەبن لە بەزەیی و میهرەبانی خوا ، بە راستی كەس نائومێد نابێ لە رەحم و مهرەبانی خوا ، جگە لە بێباوەڕان نەبێت } .

**ناوی ناون كافرەكان ! ئەبێ بۆ چی بێت ؟ ...**

ئاگاداربە : بێئومێدی لە رەحمەتی خوا گومانە لە مەسەلەیەكی دڵنیا .. گومانە و لەبیری چووە كە خوای گەورە كاتێك ئەم گەردوونەی دروستكرد ، سەد رەحمەتیشی دروستكرد ، یەك دانەیانی دابەزاندە سەر زەوی و (٩٩) رەحمەتی لای خۆی هێشتەوە بۆ رۆژی قیامەت ! ... ئای خوایەگیان ... بەراستی بەزەیی تۆ زۆر بەرفراوانە !! ... كەواتە بێئومێدی لای ئەو كێشەیەكی باوەڕیە ... ئەو گومانی هەیە لە ڕەحمەتی خوا ... و بێئومێد بووە ... ئەم ئایەتەی خوای لە بیرچووە : ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ ( الأنعام : ٥٤ ) واتە : {پەروەردگارتان بەزەیی و میهرەبانی لەسەر خۆی پێویست كردووە } و ئەم فەرمودە مژدە بەخشەی پێغەمبەریش ﷺ : ﴿ لما خلق الله الخلق كتب في كتابه ، فهو عنده فوق العرش : إن رحمتي تغلب غضبي ﴾ ( البخاري : ٣١٩٤ / مسلم : ٦٩٠٣ ) واتە : { كاتێ خوای گەورە بوونەوەری دروستكرد لە كتێبەكەیدا نووسی ، كە لەلای خۆیەتی لەسەر عەرش : رەحمەت و بەزەییم زاڵ بووە بە سەر غەزەب و توڕەییمدا }

پەروەردگارمان میهرەبانە ... میهرەبانە ... تا ئەو رادەیەی خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ ( الأعراف : ١٥٦ ) واتە : {بەزەیی و رەحمەتیشم هەموو شتێكی گرتۆتەوە } .

ئەگەر گومانت كرد لە رەحمەتی خوا ... یان بێئومێد بوویت .. یان ووتت : سوودی نی یە ... دوای ئەم ژێردەستیە خوای گەورە ئیتر سەرمان ناخات ! ... كاتێ وا دەڵێیت ... كارەكە لەوە دەردەچێت كە را و بۆچونێكی خۆت بێت ... تا دەگاتە سنووری باوەڕت و موسڵمان بوونەكەت .. چونكە خوای گەورە ئەم ئاینە سەر دەخات .. شتەكە بڕاوەتەوە ... ئێمە دڵنیاین لەوە ، بەڵام ئەوەی لە ئێمە داواكراوە تەنها كەمێك بزوێین .. بە لێبڕان و بەرخودانەوە كۆشش بكەین ...

بەڵام ... ئایا بێئومێد کافرە ؟ ! نەخێر ... ئاگاداربە ... مەسەلەی کافرکردنی موسڵمان مەسەلەیەکی مەترسیدار و ترسناکە ...

نەخێر کافر نی یە ، بەڵام بێئومێد سیفەتێك لە سیفەتەکانی کافری تێدایە .. کەواتە ئاگادار بە ... بێئومێدی سیفەتێك نیە لە سیفەتەکانی ئیماندران .. سیفەتێك نیە لە سیفەتەکانی موسڵمانان .. ئایا رازی دەبیت کە سیفەتێکت تیادا هەبێت خوای گەورە نارازیی بێت لێی ؟

ئەم سیفەتە دوور لە دڵت فڕێ بدە .. بێئومێد مەبە ... سەرت بەرزکەرەوە .. مژدەبەخش بە ، مژدەبەخش بە ، با مژدە لە رووخسارتدا دیار بێت ... لەگەڵ ئازارەکانیشدا ...

نەکەی بەهۆی ترس و بێئومێدیەوە فرمێسك بە چاوتابێت ... هەرگیز .. با فرمێسکی خۆشەویستی بێت بۆ براکانت ... فرمێسکی هاوکاریکردنیان .. فرمێسکی غیرەت لەسەر ئیسلامەکەت ... پاشان .. راستەوخۆ دروستکاریی بێنە بە دوایدا ! ... دروستی و گومان باشی بەخوای بەتوانا بەسەر هەمووشتێکدا بێگومان ئایندەی داهاتوو جوانترە !!

## گەر نەمامێکت بەدەستەوەیە ... بیچێنە ! ..

لەوانەیە پێم بڵێی : ئەوەی کە دەیڵێی ترسناکە ... ئەگەر بڵێیت : بێئومێدی لە گوناهە گەورەکانە ... کەواتە هەموو ئەم نەتەوەیە گیرۆدەی گوناهێکی گەورە بوون ، چونکە بێئومێدن ! ... پاشان ... ناتەوێ ماندوو بین ؟ ناتەوێ ئاوێتە ببین لەگەڵ واقیعی ئازاراویدا؟!..

نەخێر ... باش ئاگاداربە ... من هەرگیز مەبەستم ئەوە نیە ... ئێمە مرۆڤین ... ئازاری دەروونیش هەستێکی سروشتیە ... بەڵام ئەو بێئومێدیەی بە گوناهی گەورە دادەنرێت ، ئەو دۆش دامانەیە مرۆڤ بەرەو وازهێنان لە کار و مردنی ئومێد لە دەرووندا دەبات ... ئەمە قسەی من نیە ... ئەمە قسەی ئیمامی (السیوطي ) و ( القرطبی ) و ( الذهبی ) — رەحمەتی خوایان لێ بێت— .. گوێ بگرە بزانە پێشەوامان یعقوب ﷺ دوای ئەوەی کە دوو کورەکەی یوسف ﷺ و بنیامینی لە دەست داوە چی بە کوڕەکانی تری دەڵێت ... دوای

بیست ساڵ لە وون بوونی یوسف توشی بێئومێدیەك نەبوو کە واز لە کارکردن بێنێت .
بەڵکو فەرمووی ﴿يَابَنِيَّ اذْهَبُوا فَتَحَسَّسُوا مِنْ يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلاَ تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الكَافِرُونَ(٨٧)﴾ (يوسف:٨٧ ) واتە : { ( یەعقوب ﷺ ووتی ) : ئەی کورەکانم برۆن ، جا بگەڕێن و هەواڵی یوسف و براکەی بزانن ، نائومێد مەبن لەبەزەیی و میهرەبانی خوا ، بەراستی کەس نائومێد نابێ لە رەحم و میهرەبانی خوا جگە لەوانەی کە بێباوەڕن } .

چونکە بێئومێدی ئەوەیە واز لە هەوڵ دان بێنن و نەگەڕێن بە دوای براکەیاندا ...

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ ﴿ إن قامت على أحدكم القيامة و في يده فسيلة فليغرسها ﴾ ( الإمام أحمد في ( مسنده ) الحديث : ٣ / ١٨٣ ) واتە : {ئەگەر قیامەت داهات بە سەر کەسێکتاندا و نەمامێکیشی بە دەستەوە بوو ، با بیچێنێت } ئایا دەزانی ئەمە مانای چیە ؟ مانای مەینەتیەکانی رۆژی قیامەتە : ئاسمان نمێنێت ... شاخەکان پەرت دەبن ... زەوی دەلەرزێ ... دەریاکان بە ئاگر نامێنن ... لەگەڵ ئەوەشدا ... گەر تۆوی خێر و چاکەیەکت بە دەستەوەیە ... بیچێنە ! ... با بەروبومەکەشی نەبینیت ...

ئایا دەزانیت (( فسیلە )) چیە ؟ شەتڵی خورمای بچوکە .. واتە ساڵانێکی درێژی دەوێت بەربگرێت... قیامەتیش بەرپا دەبێت ؟ ... بەڵێ .. تۆوی خێر بچێنە با چنینەوەی بەرووبومەکەشی بە نسیبی تۆ نەبێت .. ئومێدی خۆت بسازێنە ! .. بنیاتبنێ باقیامەتیش بەرپا بێت ... بنیاتنان لە تۆ داواکراوە ... ئەوەی تریشی لەسەر خوایە ! ... کەواتە .. ئەو بێئومێدیە دەمانبات بەرەو گرنگی نەدان بە دۆزەکانی ئیسلام .. ئەوە مەترسیدارە ... کە بڵێیت .. : ((برایان ... من ماندوو بووم .. وازم لێ بێنن سەر لە نوێ بژیم ... بخۆم و بخۆمەوە ! ... من داڕوخام ... لە ئێستە بە دواوە گرنگی بە هیچ شتێك نادەم!..)) .

نەخێر ! ... بەڵکو بڵێ : (( من ماندووم ... بەڵام هەر کاردەکەم .. من دۆش داماوە بەڵام هەر کار دەکەم .... من دەگریم ... بەڵام بە دڵنیاییەوە کار دەکەم ! ... )) .

بۆچی ؟ ... چونکە خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا لێت دەپرسێتەوە ئایا وەك تەماشاکەرێك سەیری ئەم نەتەوەیەت کردووە و تەنها بۆ خۆت ژیاویت .... لە هەر بارودۆخێکدا بوویێت ... لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت ... ئەگەر کارت بۆ ئاینەکەت

کردبێت .. یا کەم یان بچووکیش بووبێت .. ئەوە پشت بە خوای گەورە تاوانبار نیت ...
ئەوە لەو کەسانە نیت کە بێئومێدن لە بارودۆخەکە و وازیان لە کارکردن هێناوە .

## موسڵمان بە .... بەو ئومێدەی کە بۆی رەخسا

تەماشای پێغەمبەرەکەت ﷺ بکە ، چۆن ئومێد دەچێنێت لە هەر کەسێکدا کە پێی بگات ... وە لە هەموو هەڵوێستێکدا دەیچێنێت .. بە تایبەتی لە ترۆپکی نارەحەتیەکاندا ... وەك ئەوەی رێنومایمان بکات و فێرمان بکات (( من نامەوێ باس لە ئومێد بکەم و بیچێنم لە دەروونەکاندا تەنها لە کاتی مەینەتیە سەختەکاندا نەبێت ... کاتێ ئەم نەتەوەیە هەست دەکات کە ئومێد نەماوە ... هۆکارەکانیشی لە دەستی مرۆڤدا نین ... چونکە لەو کاتانەدا ئیماندارانی راستەقینە دەردەکەون...)).

لە خۆت بپرسە : ئایا ئومێدت هەیە ؟ چونکە مرۆڤی دوور لە خوا ئومێد براو دەبێت کاتێك شەوی بێئومێدی تاریکایی خۆی بە سەر دەروونەکاندا دەکێشێت ... ئیماندار هەر کاتێ زوڵمی لێ بکرێت زیاتر ئومێدی بە خوای خۆی دەبێت ! ... چونکە بێجگە لە خوا کەس زوڵم لانابات ... ﴿أَزِفَتْ الآزِفَةُ(٥٧)لَيْسَ لَهَا مِنْ دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ(٥٨)﴾ (النجم:٥٧،٥٨) .. واتە:{ رۆژی دوایی زۆر نزیك بووەتەوە ، بێجگە لە خوای گەورە کەس نیە بەرگری بکات ( ئاشکرای بکات ) } .
ئەو کاتەش ئومێدی بە خوای گەورە زیاد دەکات ...

کاتێك هۆکارەکان دەپچڕێن ئیماندار ئومێدی زیاد دەکات ... چونکە هەمیشە دڵی پەیوەستدارە بە خوای گەورەوە کە دروستکەری هۆکارەکانە ... لەگەڵمدا رابمێنە لەگەڵ ئەم چیرۆکە گەشاوەدا ...

(عەدی کوڕی حاتەمی طائی) ... کە پیاوێکی دەوڵەمەند و بە ناو و شۆرەتە و لە نەژادە شەریفەکانی عەرەبە .. باوکی بەناوبانگە بە (( حاتەمی تەی )) ... ئەو پیاوە یەت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ دەیباتە خانووە خاکیەکەی خۆیەوە ، خۆی لەسەر زەوی دادەنیشێ و پارچە چەرمێکیش دەدا بە عەدی تا لەسەری دانیشێت ... گوێ بگرە لە پەیڤینی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (عەدی)دا .. وای لێ دەکات بە سێ ووشە موسڵمان

ببێت ... بەیەك خولەك ئەو پیاوە موسڵمان دەبێت کە رایکردووە لە پێغەمبەر و لە ئاینەکەی ... سێ ووشە ئومێد بەخش دەبن ! ... پێغەمبەر ﷺ پێی دەڵێ (( ئەی عەدی موسڵمان بە پارێزراو دەبیت .. دەتبینم ئەو شتەی رێگرتە لە موسڵمان بوونت ... تەنها لاوازەکان دەیبینن بە چواردەورمەوە ، وە تۆ خەڵکی دەبینیت گەلەکۆمەیان کردووە لەسەرمان )) وە ئێمە هەژارین ... دەترسین ! ...

وەکو حاڵی ئێمە لەم رۆژگارەدا ... گوێ لە مژدەی پێغەمبەر ﷺ بگرە..

عەدی بێدەنگ بوو ... بەڵام ئەوە بوو بە رێگری لە ئیسلام بوونی ! ..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( ئایا چوویتەتە ( حیرە ) ؟ ))

(حیرە) ؟ (حیرە) شانشینێکە لە گەورەترین شانشینەکانی فارس ... کەس لەو سەردەمەدا بە بیریدا نەدەهات کە دەرِوخێت و ناوی لە بووندا نامێنێت !!

عەدی ووتی: نەم بینیوە ، بەڵام دەزانم لە کوێ یە ! ...

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (( ئەی ( عدی ) .. بەخوا ... )) تەماشاکە لە کوێدا پێغەمبەر ﷺ سوێند دەخوات تا ئومێد لە دڵەکاندا بچێنێت و لە ( عدی) یشدا بیچێنێت (( بەخوا ، رۆژێك دێت کە ئافرەت لە ( حیرە ) وە بکەوێتە رێ بەبێ هاودەم ( بەبێ ئەوەی کەسی لەگەڵدا بێت ) تا تەوافی ماڵی خوا دەکات ... لە خوا نەبێت لە کەس ناترسێ ( بە دڵنیایی و ئاسایشەوە ) و گەوهەرەکانی کیسرای کوری هورمزیش فەتح دەکەین ! )) .

( عدی ) بە سەرسورمانەوە دەڵێت : کیسرای کوری هورمز ؟ فەرمووی : (( کیسرای کوری هورمز .. کیسرای کوری هورمز .. کیسرای کوری هورمز .. ماڵ و سامان ئەوەندە زۆر دەبێت پیاو خەمی ئەوە دەخوات کێ بەخشین و خێری لێ وەربگرێت ! ))

واتە بەشێوەیەك خۆشگوزەرانی بڵاودەبێتەوە پیاو خەمی ئەوە دەخوات : کێ خێرو بەخششەکەی لێ وەربگرێت .. واتە هەژار بە دەوروبەریدا نامێنێت !! ..

عەدی دەڵێ : بە راستگۆیی هەژاندمی ..

عەدی موسڵمان بوو .. موسڵمان بوو بەو ئومێدەی کە پێغەمبەری راستگۆ و دەستپاکمان و گەیەنەری پەیامی خوا ( محمد ) ﷺ لە دڵیدا چاندی ..

عەدی ووتی : دەی بەخوا ... دوانیانم بینی .. ئافرەت کەوتبووە رێ بەبێ هاودەم تا تەوافی کەعبە بکات ، وە خۆشم یەکەمین ئەسپ بووم کە دەگەرام بەسەر گەورەکانی کیسرای کوری هورمزدا ... وە سوێند دەخۆم بەخوا وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی سێ یەمیشیان دێتە دی ! ( ئەوەش لە سەردەمی عومەری کوری عبدالعزیزدا هاتە دی ) ( أخرجه الإمام أحمد : ٤ / ٣٧٩) .

ئایا بینیت ئومێد چی دەکات بە دڵ و عەقڵ ؟ ! ئەی نەتەوەی محمد ﷺ .. ئەی نەتەوەی مژدەبەخش .. ئایا ئومێدتان لە دڵتانا چاند ؟ ! ... ئومێد لە ئارادایە .. بەخوا ئومێد لە ئارادایە ..

## شارەکەی جێ دێلێت و بە دوایەوەن ... و ئومێدبەخشیشە !

لە کاتی دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ کە کۆچ دەکات لە مەککەوە بۆ مەدینە لەگەڵ پێشەوامان ئەبوبەکر ﷺ .. قورەیشیەکان رایدەگەیەنن کە هەر کەسێك پێغەمبەر ﷺ و هاودەمەکەی دەستگیر بکات خەڵاتێکی مەزنی پێ ببەخشن .. سوراقەی کوری مالیکیش کە سوارچاکێکی ئازایە .. بە ئومێدی دەستکەوتنی خەڵاتەکە دەکەوێتە رێ ..

لە رێگا دەگات پێیان .. نزیك دەبێتەوە لێیان .. سوراقە دەیەوێ تیرێك بە ئاراستەیاندا بتەقێنێ ... ئەبوبەکر ﷺ دەترسێ و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا پێیان زانین .. ئەوە سوراقەیە ! ئەو سوارچاکەی کە هەمیشە نیشانە دەپێکێت ..

دەبێ لەوکاتەدا حاڵی پێغەمبەر ( ص ) چۆن بوبێت ؟

بەوپەڕی متمانەوە دەفەرمووێ (( خوایە گیان بمانپا رێزیت لێیان بە هەر شێوەیەك بێت ، بەراستی تۆ تواناداری بەسەر هەر شتێکدا کە بتەوێ )) سوراقە دەکەوێ بە زەویدا !! .

بۆ جاری دووەم سواری وولاخەکەی دەبێتەوە .. نزیك دەبێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکەی .. جارێکی تر ئەسپەکە دەیخاتە خوارەوە ! پاشان سوار دەبێتەوە .. بۆ جاری سێیەمیش دەکەوێتە خوارەوە ! سوراقە دەڵێت : ئیتر زانیم کە ئەو پیاوە پارێزراوە( ناتوانم بە هیچ شێوەیەك ئازاری بدەم ) ووتم : ئەی محمد ... شتێکم بەرێ .. ( ئەگەر دەستگیری بکردایە خەڵاتێکی مەزنی وەردەگرت ) . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ دەدەیت ؟ ...

ئەگەر تۆ لەجێگەیدا بیت چی دەدەیت بە سوراقە ؟ ئەگەر لە جێگەیدا بوومایە دەم ووت : ئەگەر چووم بۆ شاری مەدینە ئەوەندە و ئەوەندە پارەت بۆ دەنێرم ! ..

گوێ لە پێغەمبەری خوا بگرە چۆن ئومێدبەخشی دەکات...و راگیری دەکات لەسەر کار: فەرموی: ((پەیمانی کلیلەکانی کیسرات پێ دەدەم ! )) سوراقە ووتی : کیسرا کێ یە؟ کیسرای پاشای فارس ؟

پێغەمبەریش بەوپەڕی متمانە بە پەروەردگارەکەی، فەرموی:((بەڵێ ! کیسرای پاشای فارس!))

سوراقە ووتی : بروام پێکرد ! ..

بابزانیت لەو کاتەدا هێشتا موسڵمانیش نەبووبوو ... بەلاّم بە هۆی بڕوا و متمانەی تەواوی بە پێغەمبەر ﷺ وای ووت ... سوراقە بڕوای پێکرد.. سوراقە پێی ووت ؟ ئایا نوسراوێکم بۆ دەنوسیت؟... پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( ئەبو بەکر ... ئەوەی بۆ بنووسە))

رۆژگار تێپەڕی ... پێغەمبەر ﷺ وەفاتیکرد ... پاش ئەو پێشەوامان ئەبوبەکر ﷺ بوو بە جێنشین... ئەویش وەفاتی کرد ... پاشان عومەر ﷺ چوە جێگای ... ئیسلام سەرکەوت .. و مەدائینی کیسرا فەتح کرا ... گەوهەرەکانی کیسرا کەوتە دەست موسڵمانان .. هێنایان بۆ شاری مەدینە بۆ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ... کلیلەکانی کیسرایان هێنا ... عومەر خەڵکەکەی لە مزگەوتەکەدا کوکردەوە .. لەسەر منبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ وەستا .. و گریا ..

وە ووتی : کوا سوراقەی کوڕی مالیك ؟ .. کوا سوراقەی کوڕی مالیك ؟ .. وەرە ئەی سوراقە .. نوسراوەکەم بەرێ و کلیلەکانی کیسرا وەربگرە .. سوێندێکی بەڵێن پێدراو ( پێش نزیکەی بیست ساڵ ) .. هەمووان کە لە مزگەوتەکەدا بوون دەستیان کرد بە گریان .

ئومێد ... ئومێد ... لە دڵی خۆت و دەوروبەرەکەتدا بچێنە .

ئەی لاو .. ئەی پاڵەوانی وەرزش .. ئومێد هەیە : سەرکەوتوو دەبم ... نایاب دەبم .. مەدالیای زێڕ بەدەست دێنم ... بۆ نا ؟ من لە نەتەوەی محمد ﷺم .. لە چیم کەمە ؟ بە کەمێك مەشقکردن .. سەرکەوتوو دەبم ! .. ئومێدم هەیە ... ئێمە نەتەوەیەکین پشت بەخوا

حوای گەورە سەرکەوتن و نایابیمان پێدەبەخشێت .. ئەگەر دەست بە هۆکارەکانەوە بگرین

## لەگەڵ ئابڵوقەشدا :

تەماشای پێغەمبەر ﷺ بکە لە جەنگی خەندەقدا .. موسڵمانەکان ئابڵوقەدراون لەلایەن ۱۰,۰۰۰ دە هەزار شەڕکەری موشریك کە هاتوون بۆ کوشتنی موسڵمانان .. لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقەکەدا .. موسڵمانان ماندوو بون و دەترسان و ئابڵوقە درابوون .. بەردێکی سەخت دەرکەوت .. پەنا بۆ کێ بەرن ؟ بۆ پێغەمبەر ﷺ ( کە لە پێغەمبەرانی ئولولعەزمە ) .. ئەویش هات .. و کێشای بەبەردەکەدا ... پریشکێك بەرز بوویەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ﴿ الله أکبر .. فتحت الروم .. ﴾ .
لەوپەڕی شکستدا پێغەمبەر ﷺ ئومێد دەبەخشێت .

هاوەڵانیش تەماشای یەکتری دەکەن : ڕۆمیش فەتح کرا ؟ ! ئێمە ناتوانین لە تاو ترس بچین بۆ سەر ئاو ؟ ! چۆن شتی وا دەبێ ؟

پاشان بۆ جاری دووەم کێشایەوە بە بەردەکەدا .. پریشکێکی تر بەرز بوویەوە و فەرموی ﴿ الله أکبر.. فتحت الفارس .. خوا گەورەیە ... وڵاتی فارس فەتح کرا ! ﴾ .

بۆ جاری سێیەم کێشای بە بەردەکەدا و بەردەکە شکا ...

دەی سەرت بەرزکەرەوە .. با ئومێدت بەرز بێت .. ئومێدت بژێنەرەوە ... کەسێکی دروستانە بە .. دەستی خەڵکی بگرە .. و مژدەبەخش بە !! ...

هەر یەکەمان کە تەماشای ڕوخساری موسڵمانان دەکات دەبینێ دۆش داماوە .. بێتاقەتە .. ژێردەستی پێوە دیارە . سەرت بەرزکەوە .. گەرمی ئومێد لە خۆتدا بگەشێنەرەوە ... بەو ئومێدەوە بجوڵێ ... بیزوێ ! ...

## بەڵکو ... ئومێد بدرەوشێتەوە !! ...

ڕاستەوخۆ دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە طائیف .. دوای ئەوەی لێیاندا و برینداریان کرد و ئیهانەیان کرد و دەریان کرد ... فریشتەی شاخەکان هات بۆ لای ...

پێغەمبەر ﷺ ئازار درابوو وە لێی درابوو .. کەس نەیدەویستِ گوێی لێ بگرێ .. ماوەیەکی زۆر بوو کەس موسڵمان نەدەبوو ..

دنیا تاریکە .. پێغەمبەریش ﷺ هیچ هاودەم و سەرخەرێك شك نابات .. لەو بارودۆخە نارەحەتەدا فریشتەی شاخەکان دێت و دەڵێت : ئەی محمد ، ئەگەر داوا بکەیت..لەناویان دەبەم

( تۆ دەبینیت دوای ئەوەی دەریان کردیت و لێیان دایت هیچ سودێکیان نیە ... بحەوێرەوە لە دەستیان ! ) ..

پێغەمبەریش ﷺ لە کاتێکدا خوێنی لێ دەتکا فەرموی : ﴿ لا ... عسى الله أن يخرج مِن أصلابهم من يعبد الله تعالى ! ﴾ (البخاري:٣٢٣١،ومسلم: ٤٦٢٩) واتە { نەخێر .. بەڵکو خوای گەورە لە نەوەی ئەمان کەسێك بخاتەوە کە خوای پەروەردگار بپەرستێ} .

پێغەمبەر ﷺ ووتی بە کۆیلەکەی (زەیدی کوری حاریسە) بەوپەڕی متمانە و ئومێد بە توانا و رەحمەتی پەروەردگار : ﴿ يا زيد ... إن الله جاعل لما ترى فرجاً و مخرجاً ﴾ واتە { ئەی زەید ... بێگومان خوای گەورە بۆ هەر شتێ دەیبینی دەروازە و رزگار بوونی داناوە } .

## سەرەتای ئومێد ... خەونە ! ...

دەی با خەون ببینین ... ئاگاداری کارەکە بە .. سەرەتای ئومێد خەونە .. خەون بە شتێکەوە ببینە کە لە دڵتەوە ئاواتەخوازی بیت ... و بۆی بژی ... پێویستە بێتە دی ... ئایا بڕوات بەم بنەمایە هەیە ؟ ئایا دێیت تا کۆك بین لەسەر ئەم کارە ؟ ! .

خەون بە شتێکەوە ببینە .. و بۆی بژی ( ئەو جێگیریەی پێشتر باسمان کرد ) جێگیربە لەسەری ... بە دڵنیاییەوە دێتە دی ..

ئومێدی چی دەکەیت ؟ ... دەخوازم ببمە مەزنترین ئەندازیار لەم وڵاتەدا ... خەون ببینە و بۆی بژی... بێگومان دەبیتە باشترین ئەندازیار لە وڵاتدا ..

بڕوام پێبکە ئەمە قسە نیە ... ئەمە شتێکی براوەیە و جێگای مشتومڕ نیە ...

صەلاحەدین خەونی بینی ... خەونەکەی هێنایەدی ..

دەی با پێکەوە خەونێك ببینین کە زۆر حەزمان لێی بێت ... خەون ببینین کە هەموومان پێکەوەین .. ئایا دەزانی خەون بە چیەوە دەبینین ؟

خەون دەبینین بەسەرکەوتوویی چوینەتە مزگەوتی ( الأقصی ) ... یاه ! .. ئایا خەون دەبینی ؟ ... ئایا هەست دەکەیت ؟ ... ئێستە وا بێنە بە خەیاڵی خۆتا ... بە خەیاڵت لەگەڵمدابە ... من ئومێد دەچێنم تیاتا ... ئاگاداری ئەمەبە .. من خەونی ئەرخەوانی دروست ناکەم ... بەڵکو فێری ئەوەت دەکەم کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فێر بووین ( الله أکبر ...... فەتح کرا ) .

خەون ببینە ... ئێستە تۆ چوویتەتە ناوی ... ئایا ئەندازەی خەونە مەزنەکەت دەزانیت ؟ سوپاس بۆ ئەو خوایەی هەڵی بژاردم تاوەکو لەگەڵ فەتحکەراندابم .. ئای چەندە شەرەفێکی گەورەیە ؟ .. ئێستە تۆ لە ناوەوەیت ... لە ناوەوەیت لە کوێ وە ؟ .. کۆمەڵێ دەرگای زۆر هەن .. بەڵام ڕێکەوتوم لەگەڵ هاوەڵانم کە لە دەرگای ( حِطة ) وە بچینە ژوور .. کە دەرگایەکە لە دەرگاکانی مزگەوتی (الأَقْصَی ) .. بۆچی تەنها ئەو دەرگایە ؟ چونکە ئەو دەرگایەیە کە پێشەوامان موسا ﷺ بە بەنی ئیسرائیلی ووت : ﴿وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ﴾ ( البقرة : ٥٨ ) واتە : { وە لە دەرگاوە بچنە ژوورەوە بە ملکەچی (بە کڕنوشەوە ) ، وە بڵێن ( خوایە ) لە گوناهەکانمان خۆش ببە} .. واتە : گوناهمان لەسەر لابەرە ... ئا بەو شێوەیە چوونە ژوورەوە .. لەو دەرگاوە دەچمە ژوورەوە بە ملکەچی بۆ خوا و گوێ ڕایەڵی تۆم ئەی پەروەردگار ... من وەکو جولەکە لە ڕێ لادەرەکان ناکەم ! .. بە گوێڕایەڵیەوە دەچمە ژوورەوە پەروەردگارم ... لەم دەرگایەوە ..

کە دەچیتە ژوورەوە کێت لەگەڵدایە ؟ باشە حەز دەکەیت کێت لەگەڵدا بێت ؟ ئایا کە دەچیتە ژوورەوە گوێت لە دەنگە دەنگەوەیە ؟ ئایا گوێت لە دەنگی ( الله أکبر ) ەوەیە ؟ دەنگی ( الله أکبر ) لە هەموو لایەکەوە دێت : الله أکبر ... الله أکبر ... و لله الحمد ..

ئایا گوێت لەو کەسەیە کە بە دەنگی بەرز هاوار دەکات ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا(٨١)﴾ ( الإسراء : ٨١ ) واتە :{وە بڵێ ئاینی ڕاست هات ، ئاینی ناهەق ڕۆشت و بەتاڵ بویەوە ، بە ڕاستی بەتاڵ هەمیشە لەناوچووە } .

ئایا دەرگاکانی مزگەوت دەبینیت ؟ ئایا ( قُبَّةُ الصَخْرَة ) دەبینیت ؟ ئایا درەختی زەیتوون دەبینیت ؟ ئایا براکانت لە فەلەستین دەبینیت کە پێشوازیت لێ دەکەن و لە ئامێزت دەگرن؟

ئایا ئەو برایەت دەبینیت لە تەنیشتەوەیە و دەستیت گرتووە بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکەیت ؟ ئەوە لاوێکی عێراقیە .. ئەوەی دەستە چەپیشت : لاوێکی کوێتیە .. دەستیان گرتووە بەیەکەوە و پێکەوە دەچنە قودس باوەش بە یەکتریدا دەکەن ..

ئایا گوێت لە دەنگی خۆشی و شادیە ؟ ئایا شوێنی پێشەوامان عومەری کوری خەتاب ﷺ دەبینیت کە تیایدا وەستا و ووتی : ئەی بیلال ، بانگێکمان بۆ بدە !

ئێستا دەنگی بانگ لە مزگەوتی ( الأقصى ) وە دێت ..

یاه ... ئایا فرمێسکەکانت دەبینیت ؟ ئایا دڵخۆشیی خۆت دەبینیت کە خوای گەورە هەڵی بژاردوویت کە لەوانە بیت پشگیری صەلاحەدین و عومەری کوری خەتاب و ئەبو عوبەیدەی جەراح ﷺ دەکات ؟

ئایا شوێنی شەورەو .. ی پێغەمبەر ﷺ دەبینیت ؟ ئێستە تۆ لەوێدایت ! ..

ئایا گوێت لە خەڵکەوەیە سورەتی ( الفتح ) دەخوێنن ؟ ئایا فرمێسکەکانت دەبینیت ؟ ئایا سوجدە بردن بۆ خوا و جوانیی سوجدە دەبینیت لە مزگەوتی (الأقصى)دا ؟ هەموو خەڵکی دەیانەوێت سوجدە بەرن لەو شوێنەدا کە پێغەمبەر ﷺ سوجدەی تێدا برد لە شەورەویدا ! ..

هەموویان تەماشای مینبەرەکەی صەلاحەدین دەکەن .. هەموان یادی فەتحکەرانی پێشین دەکەنەوە . ئێستا تۆ لەوێیت ... ئایا هەست بەوە دەکەیت ؟

ئایا خۆت دەبینیت لەکاتێکدا دەستی دایکە فەلەستینیەکەتت گرتووە و پێی دەڵێی : من لە جێگای کورە شەهیدەکەت کوری تۆم ! ...

یان پێی دەڵێیت : ئایا رێگام پێ دەدەیت ئەو خانووەت بۆ بنیات بنێمەوە کە رووخاوە ؟ دەی ئەی گەنجان و لاوان با ئەو ماڵە بنیات بنێینەوە ! ...

ئایا دەبینیت سەروەت و سامان و خێر زۆر بووە تیاماندا ؟ چونکە بە دەستی خۆمان و بە کۆمپانیا و سەروەت و سامانی خۆمان وڵاتی خۆمان بنیات دەنێینەوە..

ئایا شەمەندەفەر دەبینیت ؟ شەمەندەفەری چی ؟ ! .

شەمەندەفەرێك دەروا بۆ هەموو وولآتێ لە وولآتە ئیسلامیەكان ... لە هەر وێزگەیەك خەڵكانی نوێ سوار دەبن .. هاتوون بۆ دیدەنیت لە مزگەوتی (الأقصی ) تا لەوێ نوێژ بكەن و دوو رۆژ یان سێ رۆژ لەو مزگەوتەدا بمێننەوە..

هەر كە شەمەندەفەرەكە لە شارێك دەوەستێت ... خەڵكانێك سوار دەبن ... ئەوەتا كەوتە رێ ... چوو بە ( بەغداد ) دا ... خەڵكی سوار بوون ... چوو بە (كوێت)دا ... رۆیشت ... و رۆیشت ...

خەڵكی لە گۆڕەپانی ( الأقصی ) كۆبوونەتەوە و نوێژ دەكەن و سوجدەی سوپاسگوزاری دەبەن بۆ خوا .. خەونێكی زۆر ... زۆر جوانە ... ئایا ئاواتی ئەو رۆژە دەخوازیت ؟ بۆی بژی ... بۆی بژی ... وە دەڵێیت : با هەستین لە خەو ... كاتی ئەوە هاتووە لەخەو هەستین ! ...

بەڵام ئایا بڕوا دەكەیت ئەو خەونە واقیعی یە ؟ ! ..

ئەو خەونە دێتە دی ﴿ وَلِيَدْخُلُوا الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا مَا عَلَوْا تَتْبِيرًا(٧)﴾(الإسراء:٧)..واتە:{وە بۆ ئەوەی بچنە ناو مزگەوت (ی قودس ) ، وەك چۆن لە جاری یەكەمدا چوونە ناویەوە ، وە بۆ ئەوەی وێرانی بكەن بە وێرانكردنێكی گەورە } .

ئەو بەڵگانەت بۆ باس دەكەم كە مژدەت پێ دەدەن ئەم خەونە خەون نیە ... بەڵكو راستەقینەیە ! .. ئەو شتانەی ئومێد دەچێنن لە دڵتدا ... روودەدەن ... بەخوا دێتە دی ... بەڵام ئەی موسڵمانان : دەربچن لە كۆلیژەكانتانا ... ئەی لاوان .. ئایا دەتانەوێ خەونەكە بێتە دێ و هێشتا لە خوێندندا سەركەوتوو نابین و هێشتا غەش و قۆپیە دەكەین لە قوتابخانەدا ... غەش دەكەین لە كۆلیژدا؟

كەسێكی دروستانە بە ... با هەمیشە سەرت بەرز بێت ... توخوا كەسێكی باش بە ... وولآتەكەت خۆش بوێ و لایەنگریتان بۆی هەبێت .. خەونەكە دێتە دی ... بەخوا دێتە دی .بەڵام فێر بن ... و كاربكەن.. سەعاتەكانی كاركردن زیاد بكەن ... زۆر مەخەون ... وولآتەكانتان گەشەپێبدەن ... ئەو ئومێد و هیوایە دێتە دی و بەواقیعی دەیبینین ...

## ئومێدی گۆڕانکاریی ... چۆن دێته دی ؟

ئەو شتانەت بۆ باس دەکەم کە دەیسەلمێنێ ئومێد دێته دی ... دە شت .. دە مژدەی دڵنیایی کە پێت دەڵێ : دێته دی واته دێته دی :

١.سونەتێکە لە سونەتەکانی خوای گەورە لە گەردووندا : ﴿وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾ ( آل عمران : ١٤٠ ) واته : { ئەو چەرخ و رۆژانە ، دەگێڕین لەناو خەڵکیدا } . رۆژگار وەکو خۆی نامێنێتەوە ... پێویستە بگۆڕێت.. چۆن ؟

بۆ ماوەیەکی درێژ خۆرهەڵات حوکمی سەر زەوی دەکرد ... لە خۆرهەڵاتەوە ... مێژووی پێغەمبەران: پێشەوامان ئیبراهیم ﷺ لە عێراق ... پێشەوامان یونس ﷺ لە عێراق ... پێشەوامان لوط ﷺ.. پێشەوامان عیسا ﷺ ... پێشەوامان موسا ﷺ .. خۆرهەڵاتیەکی رووت بوون ... پاش ئەوە گوازرایەوە بۆ خۆرئاوا ...کێ بوون ؟ گریك و یۆنانیەکان ..

دوای ئەوە سەر لەنوێ گەڕایەوە بۆ خۆرهەڵات بەسەر هەڵدانی پێغەمبەر ﷺ ... ( ١٣٠٠ ) ساڵ بە خۆرهەڵاتی مایەوە .. لەم سەدەیەشدا گەڕایەوە بۆ خۆرئاوا ... ئێمەش سەرەمان دێتەوە تاوەکو ببێتەوە بە خۆرهەڵاتی ... ئەمە یەکێکە لە سونەتەکانی ژیان .. و مژدەیە بۆ تۆ ... ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ ( الرعد : ١١١ ) واته : { بێگومان خوای گەورە هیچ نەتەوەیە ناگۆڕێت تا ئەو هۆز و نەتەوەیە خۆیان خۆیان نەگۆڕن } ئەمەش هەر مژدە و ئومێدە !

٢.ئێمە نەتەوەیەکین نامرین چونکە شایەتحاڵین بە سەر نەتەوەکانی ترەوە ... مردنمان واته هەستانی قیامەت ... ئەشێ ئەم نەتەوەیە لاواز ببێت ، بەڵام پێویستە سەر لە نوێ هەستێتەوە ... ئەم نەتەوەیە وەکو فارسەکان .. وەکو فیرعەونیەکان .. وەکو ... نیە .. نەتەوەیەکە پێویستە بمێنێتەوە ... چونکە ووشەی کۆتایی هەڵگرتووە لە خوای گەورەوە بۆسەر زەوی ... ئەویش قورئانی پیرۆزە ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ(٩)﴾ ( الحجر : ٩ ) واته : {بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆته خوارەوە ، بەراستی هەر ئێمەش دەیپارێزین} .

ئەم ووتەیە لەگەڵ ئەم نەتەوەیەدایە ... ئەگەر مرد لەلای ئەوە قیامەت بەرپا دەبێت ..

ئەگەر ئەم نەتەوەیە مرد ... کێ مانای یەکتاپەرستی هەڵگرێ لەم سەرزەویەدا؟ ! هیچ کەس .. ئەگەر کۆتایی هات ... کێ شەریعەتی خوا لەسەر زەوی هەڵبگرێت ؟ .. هیچ کەس .. ئەم نەتەوەیە وەکو چی وایە ؟ وەکو خۆر و مانگ ..کاتێ ئاوا بین قیامەت بەرپا دەبێت ..

ئەوەی کە ئێستا تیایداین ئاوابوونی خۆرمان نیە ... ئەوەی کە ئێستا تیایداین خۆرگیرانە .. کاتێکیش خۆر دەگیرێت ، باڵندەکان دەڕۆن بەرەو هێلانەکانیان .. شتێکی سەیر دەکەن .. نا خەون:... بە ئاگاییەوە دەمێننەوە تا سەر لەنوێ خۆر هەڵدێتەوە .. بە فیترەت و ئەژادی خۆی دەزانێت کە ئەمە خۆر ئاوابوون نیە ....

ئەم سەد ساڵەی دوایی خۆر گیرانە .. چونکە ئەم نەتەوە سودی نیە کە بمرێت ... باڵندەکانیش بەو رووناکیە کەمەوە ئومێدیان هەیە کە سەر لەنوێ خۆر هەڵبێتەوە ... ئەم رووناکیە کەمە چیە ؟

ئەو لاوانەن کە ئامێز بۆ ئاینداری دەکەنەوە ... ئەوە ئەو رووناکیە کەمەیە کە ماوەتەوە.

٣.کۆمەڵێ ئایەتی قورئانی ... خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الأَشْهَادُ(٥١)﴾ ( غافر : ٥١ ) واتە:{بەراستی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی باوەریان هێناوە سەرکەوتویان دەکەین لە ژیانی دنیادا و ، لەو رۆژەی ( قیامەت ) کە باوەریان هێناوە سەر کەوتوو دەکەین } .﴿ كَتَبَ اللَّهُ لأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي﴾ ( المجادلە : ٢١ ) واتە:{خوا نوسیویەتی ، کە بێگومان من و پێغەمبەرانم سەردەکەوین } . ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ﴾ (النور:٥٥) واتە : { خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە باوەریان هێناوە و کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە ، بێگومان دەیان کاتە جێنیشتین ( ی خەڵکی تر ) لە زەویدا } . کەواتە ... رۆژێك دێت سەربکەوین ... چونکە خوای گەورە بە هەموو توانایەکیەوە لەگەڵماندایە ... مادام خوای گەورەمان لەگەڵدایە ... بەهۆی کەمیەوە هەرەس ناهێنین ! ...

٤.پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ﴿ إن الله زوى لي الأرض فرأيت مشارقها و مغاربها وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زويَ لي منها ﴾ ( مسلم : ٧١٨٧ / والترمذي:٢١٧٦) واتە : {

خوای گەورە زەوی لێ شاردمەوە منیش خۆرهەلات و خۆرئاوایم بینی وە بێگومان نەتەوەی من دەگاتە ئەو خاکەی کە لە من شارابوویەوە } .

٥.پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا : یەکەم جار چ شاخێکیان فەتح دەکرێت : قوستەنتینیە یان رۆمیە ؟ فەرمووی (( قوستەنتینیە )) .. محمد الفاتح دوای (٦٠٠) ساڵ فەتحی کرد .

٦.{ قیامەت بەرپا نابێت تا موسڵمانان لەگەڵ جولەکەدا نەجەنگن و نەیانکوژن تا ئەو رادەیەی جولەکە لە پشت بەرد و درەختەوە خۆی دەشارێتەوە و بەردەکە یان درەختەکە دێتە گۆ و دەڵێ : ئەی موسڵمان ! ئەی بەندەی خوا! ئەمە جولەکەیەکە لە پشت منەوەیە وەرە و بیکوژە }( مسلم : ٧٢٦٨ )... ئەم ئاینە چەنێك بگەرێتە دواوە پاشتر زۆر لەوە بەهێزتر دێتەوە مەیدان ... تەماشای ساڵی ماتەمینی بکەن .. وەفاتکردنی (ئەبو طالب) و وەفاتکردنی خاتو خەدیجە ﷺ .. دوورکەوتنەوەی نیگا و و وەحی ... پاشان کۆچکردن و دەوڵەتی ئیسلامی و بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامی هات بە دوایدا ...

پاشان لە سەردەمی پێشەوامان ئەبوبەکرﷺدا زۆرێك لە موسڵمانە عەرەبەکان پاشگەز بوونەوە..پاش ئەوە فەتحی وولاتی فارس و رۆم ی هات بەدوادا .. دوای هەر نارەحەتیەك دەروویەك هەیە .. دڵنیابە لەوە..

٧.رابوونی لاوان گەورەترین مژدەیە بۆ بەدیهاتنی ئەو خەونە ..

٨.پێشوازیی کردنی ئافرەتان لە پابەند بوون و ئاینداریی گرنگترین مژدەیە...چونکە لە کۆتاییدا ئەو بەرپرسە لە پەروەردەکردنی لاوان و پیاوان ..

٩.تاپول بوونی هەموو پرنسیپە زەمینیەکانی تر ... هەر هەموویان روو بەندە درۆزنەکانیان کەوتە خوارەوە و سەلمێنرا کە شکستیان هێناوە لە بەدیهاتنی ئاسایش و ئاسودەیی مروڤایەتیدا ... لەبەردەم جیهاندا هیچ شتێك نەماوە گەشە بکات و ئاسوودە بەخش بێت بێجگە لە ئیسلام .

١٠.کۆتاهەمینیشیان ... کاتێ تاریکایی زۆر دێنێت سەر لەنوێ گزنگ دەردەکەوێت ... تاریکایی زۆری هێناوە ... گومانی تیانیە و بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن دێت ... پشت بە خوا دێت ...

# ﴿ بەهای زانست ﴾

**بۆشاییەکی فراوان لە نێوان ئێمە و نێوان زانستی پێشکەوتوودا هەیە!!.**

بە رای تۆ مەزنترین کێشە کە دووچاری نەتەوەی ئیسلامی ئەمڕۆ بووە چییە؟ وەڵامەکەی لەوە روونترە کە پێویست بە شیکردنەوەی زۆر بکات ... زانستە ... بەڵێ زانست .. ئەو زانستەی بەهۆیەوە پلە و پایەی وولات و نەتەوەکان بەرز دەکاتەوە ، ئێمە بە پێی پێویست نەتەوەیەکی خوێندەوار نین ! بەداخەوە .. نەتەوەیەکین گرنگی نادەین بە توێژینەوەی زانستی و بە ئاستی زانستی بە رادەی ئەوەی کە گرنگی دەدەین بە خواردن و خواردنەوە و بەڵکو شتی تر .کە لە راستیدا زانست بنچینەیە..ئەم ئایەتە جەختی لەسەر دەکات ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ ( الأنفال : ٦٠ ) واتە : { هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕ و ئامادەی بکەن } .

بێن تەماشای هەندێ راستی بزر بوو بکەین لە بیر و هۆشماندا ..

رێژەی نەخوێندەواری لە نیشتیمانی عەرەبدا گەیشتووەتە رادەی بەرزتر لە نیوە و نزیکەی (٦٠٪) ە لە نێوان ٣٠٠ ملیۆن کەسدا ١٨٠ ملیۆن کەس نەخوێندەوارن .

ئەمە کارەساتێکی گەورەیە .. کارەساتێکە بۆ نەتەوەیەك کە یەکەمین ووشە کە بۆی دابەزێنرا لە قورئانی پیرۆزدا (( إِقْرَأْ )) بوو .

بە باشی رابمێنە لەگەڵ مندا و تەماشای ئەم جیاوازیە بکە ... خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دای بەزاندووە کە دەفەرموێ ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ(٩)﴾( الزمر:٩) واتە:{ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن و شارەزان ، وەك ئەوانەن کە هیچ نازانن و شارەزاییان نیە ؟ بەراستی تەنها خاوەن بیر و هۆشەکان لەم جۆرە یادەوەریانە سوود وەردەگرن و تێدەگەن } .

کەنەدا ماوەیەکی زۆر نابێت کە رایگەیاند پێویستە نەخوێندەواری نەهێڵێت .. وە بێگومان نەخوێندەواری خوێندنەوە و نووسین نا ، بەڵکو نەخوێندەواری مامەڵە کردن لەگەڵ کۆمپیوتەردا .

ئایا هەستان بەو بۆشاییە فراوانە کرد لە نێوان ئێمە و جیهانی پێشکەوتوودا؟ ئەگەر تەماشای خەلاتێکی وەکو خەلاتی نۆبڵ بکەین ، لە ساڵی ۱۹۰۱ ی زایینیەوە پێشکەش دەکرێت بە باشترین توێژینەوە کە پێشکەش بکرێت لە یەکێ لە بوارەکاندا دەبینین لاوی عەرەب زۆر بێ بەشە لێی .. با سێ بواری زانستی وەربگرین بۆ نموونە : پزیشکی ، کیمیا ، فیزیا ، ئەو کاتە جیاوازی نێوان خۆمان و نەتەوەکانی تر دەبینین .

زیاد لە سەد ساڵە موسڵمانان هیچ خەلاتێکیان بە دەست نەهێناوە بێجگە لە دوو زانا نەبێ : زانایەکی پاکستانی و دکتۆر ئەحمەد زویل .. لە کاتێکدا ۸۱ ئەمریکی لە بواری پزیشکدا خەلاتیان بەدەست هێناوە و ٤٥ یش لە بواری کیمیادا .

وە (۲٦) بەریتانی لە بواری پزیشکیدا و (۲۰) لە کیمیادا و (۲٥) لە فیزیادا.

بیهێنە بیرت ئەگەر هەموو ئەوانە لە موسڵمانەکان بوونایە ئایا ژیانمان بەم شێوەیە دەبوو ؟ ! ئایا لە یادتانە چەندە دڵشاد بوین و شانازیمان دەکرد بە دکتۆر (ئەحمەد زویل) ەوە ؟ !!

## داوا کردنی زانست فەرزە و پێویستە

ئێمە هیچ بوونێکمان نیە لە گۆرەپانی توێژینەوەی زانستیدا .

هەموو داهێنانکاریەکان لە دوو سەد ساڵی رابردوودا ئێمە هاوردەیینی هەر لە کارەبا و فرۆکەوە بۆ پاندانی جاف و مۆبایل و کۆمپیوتەر ، وە ئێمە ئەو نەتەوەیەین کە ئەم ئایەتەمان بۆ دابەزیووە ﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ(٣)الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ(٤)عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ(٥) ﴾ ( العلق ٣:–٥ ) واتە:{ بخوێنە لەکاتێکدا هەر پەروەرگاری تۆ بەخشندەیە ،ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانست و زانیاری فێرکردووە ، ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیون}.

بە هیچ شێوەیە ئێمە لەسەر نەخشەی توێژینەوەی زانستی یان بەرهەم هێنان بوونمان نیە . تا ئەو رادەیەی فەرشی نوێژ و تەسبیحاتیش لە دەرەوە دەهێنین .. با واز لە ئەمریکا و

ـگلتەرە بێنین و تەماشای وولاتێکی وەکو : هیند بکەین ، کە وولاتێکە لەو وولاتانەی جیهانی سیَ .. هیند گەورەترین وولاتی جیهانە لە بواری هەناردنی بەرنامەی کۆمپیوتەردا ، ـەم بوارەدا بەشێوەیەکی بەرچاو پێشکەوتووە ، هەناردەی هیند لە ساڵی ٢٠٠٠ دا بە ٦ ملیۆن دۆلار مەزەندە کرا ، وە لە ساڵی ٢٠٠٢ بە ٨ ملیۆن دۆلار .

وە بەرنامەی کۆمپیوتەر پێویستی بە سەنتەر و کارگە نیە ، بەڵکو تەنها پێویستی بە مێزێك و ئامێرێکی کۆمپیوتەر هەیە ... ئەم ئامێرەش زۆر بلاّوە لەناو لاواندا !! .. ژیرانە بیر کەرەوە . ئەوەیە بە دوایدا دەگەڕێین ... راوێژکاری ئەڵمانی لە یەکێ لە پێشەنگا مەزنەکانی تایبەت بە تەکنەلۆجیای زانیاریەکان ناچار بوو کە ٣٠ فەیزی کارکردن ببەخشێ بە هیندەکان .. چونکە حەزەکانی ئەڵمانیا لە بواری بەرنامەی تەکنەلۆجیادا کەمتر بوو لە ئاستی تواناکانی .

جێگای خەفەتە لە دوای ١٤ سەدە لە بانگەواز بۆ لای خوا لە دواوە بین لە بواری دەسکەوتە زانستی و تەکنەلۆژیەکاندا ... زانست و زانایان خۆیان فەرز دەکەن .. ئەی بۆچی ئێمە بەم چارەنووسەی ئێستا گەیشتووین ؟

## زانست ... لە پێناوی زانستدا ..

ئێمە لە کوێی ئەو فەرزەداین کە فەرز کراوە بەسەرماندا !! وە هۆکارەکانی پاشەکشەی نەتەوەی ئیسلامی لە بواری زانستدا چیە ؟ !! با بە ووردی تەماشای ئەم هۆکارانە بکەین !

یەکەم : ئێمە رێزی زانست ناگرین .. وە زانست لە ژیانماندا بەهایەکی نەماوە ، تەنها خەریکی هاوردەین و بەسمانە ، لە کاتێکدا زانایان لە نەتەوەی ئیسلامیدا ئەوەندە بەهایان هەبوو.. هارونە رەشید خۆی ئاوی دەکرد بە دەستی زانادا بۆ ئەوەی دەستی بشوات لە دیوەخانەکەیدا دوای نان خواردن بۆ رێز لێنانی .

لەگەڵمدا رابمێنە لەم رووداوە : یەکێ لە قوتابیە یابانیەکان خەریکی خوێندنی دکتۆرا بوو لە ئەمریکا، لە کاتی توێژینەوەکەیدا گەیشت بە داهێنانێکی نوێ ، وازی لە خوێندنەکەی هێنا و ، فایلەکانی کۆکردەوە و گەڕایەوە بۆ وولاتەکەی ، کاتێ لێیان پرسی : ئەی دکتوراکەت ؟ ووتی : من چووم دکتۆرا بخوێنم تاکو ئەو ئامێرە دابهێنم .. دەی

داهێنانکاریەکەم ئەنجامدا ، بڕوانامە لە خۆیدا مەبەستی من نیە ، دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی خزمەت بە وولاتەکەم بکەم .

سێ یەم : کەس ئێستا لە بوارێکدا ناخوێنێ کە حەزی لێ بکات .. یان بزانن حەز لە چی ئەکا!! وە واماں لێ هاتووە نازانین چ توانا و بەهرەیەکمان هەیە کە پێویستە پسپۆڕ بین تیایدا . زۆر جار دەبینین و دوای چەندین ساڵ لە بەدەست هێنانی بڕوانامە ، زۆرێك لە لاوەکان ئاراستەی کارکردنیان دەگۆڕن وە ساڵانی خوێندنیان بە بێ بەها دەڕوات .. کو بەرنامەی دۆزینەوەی بەهرە و تواناکان ؟

چوارەم : ئەمە کێشەی کێشەکانە ، تێگەیشتنی هەڵەی لاوان لە ئیسلام ، هەندێك دەبینین پێی وایە کە ئیسلامەتی واتە مانەوە لە مزگەوتا .. کە ئایندار دەبێت ئاستە زانستیەکەی دادەبەزێ لە کاتێکدا پێشتر پێشکەوتوو بوو .. ئێستە دەیبینی شکست خواردووە و دەبێتە خراپترین ووێنە بۆ موسڵمانان و ئیسلام بەگشتی .

سوێندتان ئەدەم .. کێ پاڵ بەو موسڵمانەوە دەنێ کە زانست یان پزیشك دەخوێنێ وازی لێ بێنێ و گرنگی بدات بە خوێندنی زانستە شەرعیەکان ؟ !ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە بۆ ، ئاینەکەمان .. ئەوەندەت هەبێت کە سوودی هەبێت بۆ کردنی پەرستشەکان بە دروستی . کاتێ دەستت بەتاڵ دەبێ لە بوارەکەی خۆتدا زانستەکانی تریش بخوێنە .

پێنجەم: ئەم هۆکارەش لەو پەڕی گرنگیدایە .. ئێمە نەتەوەیەکین ناخوێنینەوە! لە کاتێکدا خوێندنەوە ئاسان بووە لەسەر ئەنتەرنێت وە لە هەموو کتێبەکاندا ... و بۆ هەموو ئاستەکان .. چاوەڕوانی چی بین ؟ !!

ئەگەر گەشتێك بکەیت بۆ هەر وولاتێکی بیانی ژمارەیەکی زۆر کەم دەبینیت لە خەڵکی کە لە ناو ئامێرە گەشتیەکانی گواستنەوەدا بەبێ کتێب خوێندنەوە دانیشتبن .. هەموو تەمەنەکان کتێبێکیان بە دەستەوەیە و دەیخوێننەوە .

بەڵام لە وولاتی ئێمە ، دەبینین ئەوەی کە کاغەزێکی بە دەستەوەیە خەریکی شیکاری تۆڕە وشەیە یان خەریکی قسەی بەتاڵ و ناوناتۆرە یان یاریکردنە .

خوێنەری ئازیز ، دوای هەموو ئەمانە دەبینین خوای پەروەردگار دەماندوێنێ لە قورئانی پیرۆزدا و دەفەرموێ ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً(٨٥)﴾ واتە:﴿تەنها کەمێکم پێ بەخشیون لە زانست﴾

.. بەڵێ بەخوا جێگای خەفەتە . وە لە میانی هۆکارەکانی گەڕانەوەمان بۆ دواوە بڵاوبونەوەی گەندەڵییە لەنێوان لاواندا ، ئاگادار بن ئەوەی گەندەڵ بێت تاوانی هەموو نەتەوەی لەسەر شانە !

ئێمە کاتێ دەخوێنین هیچ مانایەکی ئەو خوێندنە نازانین ، وە رادەی سوودی ئەو خوێندنە نازانین بۆ سەر نەتەوەکەمان . تەماشاکە پلەی لێزانینمان بۆ زمانەکان و کۆمپیوتەر چەندە؟؟

کاتێ موسڵمانان لە لوتکەدا بوون لە جیهاندا ، ئەوروپیەکان ناچار بوون خۆیان فێری زمانی عەرەبی بکەن ... بەڵام ئێستا لە خوارەوەی لیستی زاناياندایین ، وە ئێستە دەبێت ئێمە خۆمان فێری زمانی ئەوان بکەین !! لەگەڵمدا رابمێنە لەم ووتانە و بەباشی لە یادتدا بیچێنە.

هەڵبژاردنی پسپۆریی لەسەر ئاسانیەتی و رادەی دەست کەوتنی سامان نەریتێکی ئیسلامی نیە .. وە قەتیس کردنی زانست لە کەسانی تردا تا موناقەسە نەکەن لەسەری نەریتێکی ئیسلامی نیە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ من سئل عن علم فكتمه الناس ألجم يوم القيامة بلجام من النار ﴾ ( إبن ماجه : ٢٦٢) واتە : { هەر کەسێ پرسیاری زانستی لێ بکرێت و لە خەڵکی بشارێتەوە لە رۆژی دواییدا تەوق ئەدرێ بە ئاگر } .

کەسێك نیە سامان بەخەرج بدات بۆ توێژینەوەی زانستی ، چونکە بەهای توێژینەوەی زانستی لە ئارادا نەماوە .. کەچی کەسی بەتوانای وا هەیە بۆ خۆی و کەسانی تر هەزاران دۆلار بەخەرج دەدات ، بەڵام فلسێك بۆ یەك توێژینەوە بە خەرج نادات .

بە راستی ئەمە شکستێکی گەورەیە بۆ ئێمە و بۆ هەموو نەتەوەی ئیسلامی .

## کۆمەڵێ کەس ئیسلام تاوانبار دەکەن

هی وا هەیە دەڵێ : لەوانەیە عەیبەکە لە ئیسلامەوە بێت ، ئەوە وا لە نەتەوەکەی دەکات کە وابن بە بەڵگەی ئەوەی کە هەموو سەرکەوتن و پێشکەوتنێکی زانستی لە دەرەوەی بازنەی نەتەوەی ئیسلامیە !!

با ئێمەش تەماشای ئاینەکەمان بکەین ...

یەکەم : یەکەمین ووشە لە کتێبە پیرۆزەکەماندا بریتیە لە (( إقرأ )) ... بۆچی ؟؟ بۆچی لە کاتێکدا پێشەوامان محمد ﷺ نەخوێندەوارە و سەوادی نیە ؟ دەزانن بۆچی ؟ چونکە لەگەڵ بانگەوازی محەمەدیدا ﷺ سەردەمی موعجیزە لە توانا بەدەرەکان کۆتایی هات و سەردەمی سەرکەوتن بەسەر واقیعدا دەستی پێکرد .

پێغەمبەرانی پێشوو بە موعجیزە هەستیەکان و دەرك پێکردووەکان سەرکەوتنیان بە دەست هێنا : گاچۆنەکەی موسا ، تۆفانەکەی نوح .. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ و نەتەوە موسڵمانەکەی سەرکەوتنیان لە تاکەکانیانەوە سەرچاوەی گرتووە .. دووەمین سورەت کە لە قورئانی پیرۆزدا دابەزی بریتی بوو لە ﴿ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ(١)﴾ ( القلم : ١ ) واتە : {نون ، سوێند بە پێنوس و ئەوەی کە دەینووسن } .

وە لە سورەتی ( البقره ) دا کاتێ پەروەردگار دەربارەی دروستکردنی ئادەم دەدوێ دەفەرموێ:﴿ وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾ ( البقرة : ٣١ ) واتە : {پەروەردگار هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد } .

ووشەی ( علیم ) : ٢٢٤ جار لە قورئاندا هاتووە .

ووشەی ( علم ) : ٣٧٥ جار لە قورئاندا هاتووە .

ئیسلام بێ بەریە لەو تاوانانەی کە دەوترێ هۆکاری دواکەوتنی موسڵمانانە ... بۆ ئەوەی ئەمە بزانیت.. گوێ لەو فەرموودانە بگرە کە هاندەری زانستە و پلەی موسڵمان بەرز دەکاتەوە لە دونیا و قیامەتدا .

تەماشاکە ئەم فەرموودەیە چۆن هانمان دەدات بۆ سووربوون لەسەر زانست و فێربوون .. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ ﴿ من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهل الله له به طريقاً الى الجنة﴾ ( مسلم : ٦٧٩٤ ، الترمذي : ٢٦٤٦ ، ٢٦٤٥ ) واتە:{ئەوەی ڕێگایەك بگرێت

بۆ ئەوەی فێری زانست ببێت خوای گەورە بەهۆیەوە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات } ..ئایا بەهەشتت ناوێت؟ ڕێگای بەهەشت بگرە تا بەهۆیەوە خزمەت بە نەتەوەکەت و ئاینەکەت بکەیت! وە هەروەها دەفەرمووێ ﴿ إن الملائكة لتضع أجنحتها لطالب العلم رضاً بما يطلب﴾( الترمذي : ٣٥٣٥ ) واتە : { فریشتەکان باڵیان ڕادەخەن بۆ کەسێ کە بەدوای زانستدا دەگەڕێ بەهوی دڵخۆش بوونیان بەوەی کە داوای دەکات و شوێنی کەوتووە }..

ئەڵڵاە ئەم ووتانە چەند جوانن ... فریشتەکان خاکی بوون (تواضع) دەنوێنن لە بەرامبەرماندا ئەگەر فێرخواز بین... بەڵێ ئەمە ڕاستە ، زۆرێك لە لاوان دەبینیت کە سوورن لەسەر نەزانینیان و پێت دەڵێن : من ئێستە ئاسوودە و مورتاحم ، ئیتر کەواتە چی بکەم بە زانست ؟ !

رابمێنە لەم فەرموودەیە : ﴿ إن العالِم يستغفر له مَن في السماوات و الأرض حتى الحيتان ، و فضل العالِم على العابد كفضل القمر على سائر الكواكب﴾(أبوداود : ٣٦٤١ ، الترمذي : ٢٦٨٢ ، إبن ماجه : ٢٢٣ ) واتە:{مرۆڤی زانا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەن تەنانەت نەهەنگەکانیش ، وە فەزڵ و ڕێزی زانا بەسەر خواپەرستەوە وەکو فەزڵ و ڕێزی هەیڤ وایە بەسەر هەموو هەسارەکانی تردا } .

وە زانا ئەو کەسەیە کە هەموو زانستەکانی دین و دنیا کۆدەکاتەوە کە سوودی هەبێ بۆ نەتەوە بە گشتی .. پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرمووێ ﴿ من خرج في طلب العلم كان في سبيل الله حتى يرجع﴾(الترمذي:٢٦٤٧ ) واتە : { هەر کەسێك بەدوای زانستدا بڕوات ئەوە لە پێناوی خوادا ڕۆیشتووە هەتا دەگەڕێتەوە } .

ئایا مانای ئەمە دەزانیت ؟ واتە بێگومان پاداشتی موجاهیدی هەیە لە پێناوی خوادا تا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی ... ئایا بینیت ؟ ئیسلام گرنگی بە زانست داواکردن داوە لە هەر کوێ بێت ... وە خوای گەورەش ئەو پاداشتەی وون ناکات !

## جوانترین سیفاتی پێغەمبەران ... زانستە

بێگومان جوانترین سیفاتی پێغەمبەران : زانستە ، ئەوەتا پەروەردگار دەربارەی پێشەوامان موسا عليه السلام دەفەرمووێ ﴿آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ ( القصص : ١٤ ) واتە : { ئێمە دانایی و

زانایمان پێ بەخشی } . وە دەربارەی پێشەوامان داود ﷺ و سولەیمان ﷺ دەفەرموێ :﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ عِلْمًا وَقَالاَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي فَضَّلَنَا عَلَى كَثِيرٍ مِنْ عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ(١٥)﴾(النمل:١٥)واتە:{ئێمە زانست و زانیاریمان بەخشی بە داود و سولەیمان . و ئەوانیش ووتیان: سوپاس بۆ ئەو خوایەی فەزڵ و ڕێزی ئێمەی دا بەسەر زۆرێك لە بەندە ئیماندارەکانی } .

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ﴿ ما بَعَثَ الله نَبياً إلاّ وَلَهُ حِرْفَةٌ ﴾ واتە : {خوای پەروەردگار هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت ، پیشەیەکی هەبووە} . بۆ نموونە زەکەریا ﷺ دارتاش بوو ..

تەماشای پلانی پێغەمبەر ﷺ بکەن لەگەڵ نەتەوەکەیدا تا بیانگەیەنێتە حاڵ و گوزەرانێك کە لەو کاتەدا پێی گەیشتبوون ... سەپاندبووی بەسەر دیلەکانی جەنگی بەدردا کە حەفتا کەس بوون پێویستە هەر یەکێکیان دە کەس لە موسڵمانان فێری خوێندەواری بکەن تا زانستخواز بن . یەکێ لەوانەی کە فێری خوێندەواری بوو : (زەیدی کوری ثابت بوو کۆکەرەوەی قورئانی پیرۆزە .

پێشەوامان محمد ﷺ داوای لە زەیدی کوری ثابت کرد کە فێری زمانی هیندی ببێت . ئەویش لە ماوەی هەژدە رۆژدا فێری بوو ، لێی پرسی : ئەتوانی بۆیان بنوسیت ؟ ووتی بەڵێ .. واتە تەنها فێربوون نەبوو ، بەڵکو زانینێکی تەواو ... ئەمەیە ئاستی بەرزی زانستی.

پێغەمبەر ﷺ زاڵ بوو بەسەر بیر وباوەڕی خەیاڵاوی و نەزانینەکاندا .. وە هەروەها ژێری مەست کردن بە ئەندێشە و ئەفسانە ... پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:﴿ مَن أتى عَرَّافاً فَصَدَّقَهُ بما يقول ، لم يقبل له الصلاة أربعين يوماً﴾ ( الإمام أحمد في مسنده ( ٤ /٦٨ ) ) واتە : { ئەوەی بڕوا بە کارەکانی سیحر و جادوباز بکات کە دەیڵێ ، ئەوە نوێژی چل رۆژی لێ وەرناگیرێ } .

## بوژانەوەی زانستی پرۆگرامێکە و پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە

پێغەمبەری خوا مامۆستای ئەم نەتەوەیە شتێکی دارشت کە ئێمە ئەمڕۆ ناوی دەنێین بەرنامەیەك بۆ بوژانەوەی زانستی بۆ نەتەوەی ئیسلامی ، سەرەتا بە فێربوون و سوربوون

ـسەری دەستی پێ کرد وە هەروەها زاڵ بوون بەسەر نەزانین و بیروباوەڕی کۆندا ، پاشان ـەرژمێری ... بەڵێ زانستی سەرژمێری ، کە لەو زانستە نوێیانەیە کە کۆمپیوتەر پشتی پێ دەبەستێ ...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ﴿ أحصوا لي من يملك سلاحاً ، أحصوا لي من دخل في الإسلام﴾ واتە : { سەرژمێری ئەوانەم بۆ بکەن کە چەکیان هەیە ، سەرژمێری ئەوانەم بۆ بکەن کە دێنە ناو ئیسلامەوە} .

وە هەروەها کارێکی تریشی خستە ناو پرۆگرامی بوژانەوەوە ، ئەویش کاری بەکۆمەڵە ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ واتە : { هاوکار و کۆمەکی یەك بن لەسەر چاکە و خواپەرستی} .

حەسانی کوڕی ثابت جارێکیان هات ووتی: شیعرێك ئەنووسم هەجوی کافرەکانی پێ دەکەم ، پێغەمبەر ﷺ داوای کێ کرد کە ئەبوبەکری صدیق یش بەشدار بکات لەگەڵ خۆی چونکە ئەو زاناترە بە نەژادەکانی عەرەبەکان تاوەکو حەسان نەکەوێتە هەڵەوە ... بۆیە ئەویش شیعرەکەی نووسی یان رێکی خست ، کاتێ کافرە قورەیشیەکان خوێندیانەوە ووتیان : سوێند بە لات و عوزا (کە دوو بتی ئەوان بوون دەیانپەرست) ئەبو بەکر لە پشتی نووسینەوەی ئەم شیعرەوە بووە ...

وە دواهەمین شتێ کە دانرا بۆ پرۆگرامی هەستانەوەی زانستی ئەم نەتەوەیە : بەرپەرچدانەوەی ئەو زانستانە بوون کە سوودمەند نین ، چونکە هەرچی سوودی بۆ ئەم نەتەوەیە نەبێت پێویست بەوە ناکات شوێنی بکەویت و ئەرزشی ئەوەی نیە کاتی بۆ بەخەرج بدەیت . پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ﴿ اللهم إني أَعُوذ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لا يَنْفَعْ ﴾ ( النسائي : ٥٥٥١ ، إبن ماجه : ٢٥٠ ) واتە:{پەروەردگارا پەنا بە تۆ ئەگرم لە زانستێك کە سوودی نەبێت } . وە دەفەرموێ ﴿ اللهم أنفعني بما علّمتني و علمني ما ينفعني ، و زدني علماً ... ﴾ ( الترمذي : ٣٥٩٩ ) واتە:{پەروەردگارا سوودمەندم بکە بەوەی کە فێرم دەکەی ، وە فێری ئەوەم بکە کە سوودی هەیە بۆم ، وە زانستم زیاد بکە } .

ئەمە دۆزی ئێمەیە وەك موسڵمان ، زانست هی ئێمەیە بەڵام بەدەستی کەسانی ترەوەیە ... بە دەستی خەڵکی رۆژئاواوەیە کە سەرکەوتوون بە سەرماندا بەهۆی تواناکانیانەوە.. وە

بەشتێکی تریش کە بریتیە لە: کات ... بەڵێ کات .. کە بەباشترین شێوە قۆزراوەتەو: سودی لێ وەرگیراوە لە رۆژئاوادا ، وە لای ئێمەش بە خراپترین شێوە سودی لێ دەبینین ..

برا و خوشکانم ... ئێستا پێویستە چاو بخشێنینەوە بە ژمێریاری خۆماندا و بە ژیانمان کاری رۆژانەماندا ؟ بەڵێ بەخوا ... کاتی ئەوە هاتووە .

بەخوا رۆژئاوە هیچ نیە بێجگە لە سوود وەرگرتن لە کات نەبێت بۆ ئەوەی زانستەکەیدا پێش بکەوێت ..دەی با ئێمەش توانامان و پسپۆڕیمان بقۆزینەوە لە هەمو بوارەکاندا مادام ئێمە نەتەوەی زانستین .. دەی با پێشکەوتوو بین لە ئابووری و پزیشکی فیزیا و کیمیادا ، با زانینمان تەنها لە چوارچێوەی ئاشنابوون بە شەریعەتی ئیسلامیدا نەبێت

وە گرنگترین شتێ کە داوای دەکەم و دەمخوازم ئەوەیە کە سندوقێکی یەدەك تەرخ بکەین بۆ خەرج کردن لە پێناوی توێژینەوەی زانستی ...

بەڵکو کۆی ئەم هەموو خاڵانە پلە و پایەی ئێمە وەك موسڵمان بەرز بکاتەوە.

پێویستە فێر ببین ... پێویستە سەرکەوتوو بین ... تا ئەم بارودۆخەمان بگۆڕین ... بەڵا چۆن ؟؟ بێگومان بە زانست ..

﴿حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾(الرعد:١١) بەڵێ تاوەکو فێر ببین لە پێناوی خۆماندا وە هەروەه لە پێناوی نەتەوەکەماندا .

ئەم وتەیەی کۆتایتان لە یاد بێت کە بریتیە لە : ئیسلام و نەزانین هەرگیز پێکەو کۆنابنەوە

# ﴿ تا خۆراگربین لە نارەحەتیەکاندا ﴾

## نارەحەتی .... راستگۆیان دەدۆزێتەوە

لە نارەحەتیە سەختەکان و فیتنەکاندا ئادەمیزاد نازانێ چی بکات ... و بۆکوێ بڕوات ... ئەوەی پاڕایەوە و دوعای کرد و هۆکارەکانی گرتە بەر ئەو بەرهەمەی لە واقیعدا نەچنیەوە کە دەیوست .. لا حول ولا قوە إلاّ باالله ..

دوای نارەحەتیی فیتنەی گەورە دێتە ئاراوە ئەگەر مرۆڤ نەزانێت چۆن هەڵس و کەوت بکات و ئەنجامەکانی نارەحەتیەکە وەربگرێت .... دڵەکان ناجێگیر دەبن ...و کەسی دامەزراو دەکەوێت .. ئەوەی شانازی بە ئاینەکەیەوە دەکات خۆی دەداتە دەست کەسانی تر تا ئاراستەی بکەن (( چونکە ئەوانە هەموو شتێ تێدەگەن و لە هەموو شتێکدا سەردەکەوێت و ئێمەش هەمیشە شکست دێنین و هەمیشە روخاوین ! )) بەراستی کارەکە مەترسیدارە .

ئەوەی ئومێدی بە خێر هەیە .. و ئەوەی دەستی گرتووە بەو رووناکیە سادەوە خەریکە ئیتر رووناکی نابینێت تا هۆگری بێت ... تووشی بێزاری دێت...

دانای هۆشمەندیش تووشی سەرسوڕمان و شۆك دەبێت ... ئیتر نازانێ چۆن بیربکاتەوە یان چۆن هەڵسوکەوت بکات ...

بەڵام ... ئەوە بزانە هەموو ئەمانە بەسەرئەچن ... بۆچی ؟

چونکە فیتنە و نارەحەتی (( بێژنگ )) ە و لە میانیەوە راستگۆ لە درۆزن جیا دەبێتەوە ...

ئەوە تاقیکردنەوەیە ... بێژنگە بۆ متمانەی خەڵکی بە خوا .

بێژنگە بۆ متمانەی خەڵکی بە ئاینەکەی ...

بێژنگە بۆ متمانەی ئادەمیزاد کە خوای گەورە گوێی لە دووعا و پارانەوەیە و وەڵام دەداتەوە ...

بێژنگە بۆ متمانە بوونی ئادەمیزاد کە خوای گەورە سەرخەری ئەم ئاین و ئەم نەتەوەیە.
بێژنگە بۆ متمانە بوونی موسڵمان بە خۆی ... کە توانای بەرهەم و بنیاتنانی هەیە .
هەموو ئەمانە تاقیکردنەوەن ... بۆچی ؟ ... چونکە ئاساییە تاقیکردنەوە ئەنجامی گوفت و کردارەکان دەردەخات .

بسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ... الم(١)أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ(٢)وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ(٣)﴾ ( العنكبوت : ١-٣
واتە : { ئەلیف ، لام ، میم (١) ئایا خەڵك وا دەزانن کە وازیان لێ دەهێنرێ ، ئەگەر بڵێن باوەڕمان هێناوە ، ئیتر ئەوان تاقی ناکرێنەوە (٢) بێگومان کەسانی پێش ئەوانمان تاقیکردەوە ( ئەمانیش تاقی دەکەینەوە ) ، ئینجا بێگومان خوا ئەو کەسانەی ڕاستیان کرد دیاری دەکات ، درۆزنەکانیش دیاری دەکات ( دەناسرێن ) (٣)}.

ئەم قورئانە مەزنە ... بۆ هەموو کات و شوێنێکە ... قسە لەگەڵ تۆدا دەکات ئەی موسڵمانی شڵەژاو کە لەوپەڕی نارەحەتیدایت ... و ئاگادارت دەکاتەوە ... و ڕێنومایت دەکات ... لە نارەحەتیەکاندا بیخوێنەرەوە و ئەوەی پێشتر لێ ی تێ نەگەیشتویت تێدەگەیت.

## کۆتایی ... هێشتا نەهاتووە !

ئەی موسڵمان نارەحەتی دەت دۆزێتەوە .. ئایا دوای ئەوەی ملکەچ بوویت و پابەند بوویت و ئاراستەی خۆت و ڕەوشتت گۆڕی بەوەی کە خوا پێی ڕازیە ... ئایا دوای نەمانی نارەحەتیەکە دەگەڕێیتەوە بۆ سەر کردەوەکانی پێشووت ؟ ! .... کەواتە .... دەرنەچوویت لە تاقیکردنەوەکەدا !...

بچۆرەوە بە خۆتدا تا فێربیت هەڵەکەت لەکوێدا بوو کە بووە هۆی دەرنەچوونت ...بەڵام بزانە گرنگترین شتێك و گرنگترین کار لەم دونیادا ئەوەیە کاتێ کە دەگەین بە دیداری خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا: وەستانمان لە بەردەم خوای گەورەدا چۆن دەبێت

ئایا دڵخۆش و ئاسودەیت ... سەرت بەرز دەکەیتەوە و دەڵێی : پەروەردگارا ، لەگەڵ ئەو هەموو فیتنەشدا خۆڕاگر و ملکەچ بووم و متمانەم بە سەرخستنی تۆ هەبوو ، کەسێك بووم کارم بۆ ئاینەکەت دەکرد ؟ یان بە پێچەوانەوە .

کەواتە .... چۆن دامەزراو بین لە نارەحەتیەکاندا ... و نەکەوین لەو فیتنانەدا کە دڵەکان و عەقڵەکان دێنێتە لەرزین .

لە کاتی نارەحەتیەکاندا چوار شتی جێگیر لە دڵتدا بچەسپێنە ... ئەو کاتە ئەو دڵە لەنگە ناکات و لە کاتی فیتنەدا نالەرزێت .

جێگیر(ثوابت)ەکان لە دنیادا پتەو دەبێت وەك پتەوبوونی عەقیدە لە دڵتدا.

بەڵێ .... لە کاروبارەکاندا لەوانەیە جیاوازیمان هەبێ ... کێ راستە و کێ لەسەر هەڵەیە ... وە ئەوان سنووریان بەزاند ... و ئەوان زوڵمیانکرد و ... و ... و ...

بەڵام ئەم خاڵە جێگیرانە بە پتەوەی دەمێننەوە ... وە ئەگەر نا ... ئەگەر ئەم خاڵە جێگیرانە لە دەست چوون ئەوە کێشەی ئیمانی و عەقیدەیی روودەدات ... وە کێشە کاتێ روبەروی پەروەردگار دەبیتەوە.... وە کێشە بۆ هەموو نەتەوە ... ئەگەر نەتەوە ئەم خاڵە جێگیرانە وون بکەن ئەوە کۆتاییانە.. تۆش دەڵێیت ئایا هێشتا کۆتایی نەهاتووە ؟ ! دوای ئەو هەموو شتەی کە روویداوە ؟ ! . بێگومان هێشتا کۆتایی نەهاتووە ... بێگومان نەهاتووە ...

کۆتایی نەتەوە هێشتا نەهاتووە ... تۆ لە ئەندێشەدایت و واقیعانە شت نابینیت بە باشی .. مێژوو هەمیشە خۆی دووبارە دەکاتەوە .

لە ساتەکانی شکست و نارەحەتیدا ئەم خاڵە جێگیرانە لە دڵتدا بروێنە ، و منداڵەکانتی لەسەر فێربکە ، وە لەگەڵ هاورێ و دۆستەکانت ووتووێژی لەسەر بکە تا دەیچێنیت تیایاندا، ... تاوەکو لە ساتەکانی نارەحەتیەکاندا نەلەرزن و توشی شکست نەبن.

## خوا خاوەنی هەموو شتێکە

جێگیری یەکەم : هەموو شتێ بەدەست خوایە ... زەوی هەمووی موڵکی خوایە ...

گوێ لە قورئان بگرە و لەگەڵ ئایەتەکانیدا بژی ... خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(٢٦)﴾ ( آل عمران : ٢٦ ) واتە : { بڵێ ئەی خوای خاوەن دەسەڵات ، دەسەڵات دەدەیت بە هەر کەسێك کە بتەوێت ، وە بەرێزی دەکەیت ئەوەی کە بتەوێت ، وە بێ رێزی دەکەیت ئەوەی کە بتەوێت ، تەنها بەدەستی تۆیە هەمو چاکەیەك ، بەراستی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایت } .

رابمێنە لەم ئایەتە : ﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ ( البقرة : ٢٥٥ ) واتە : { خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك (ی راست ) نیە بێجگە لەو، هەمیشە زیندووی تەدبیرکەر و راگر ( ی ... بوونەوەر ) ە ، نە وەنەوز ئەیگرێ و نە خەو ، هەر هی ئەوە هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە } . ﴿اللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ(٢١)﴾ ( یوسف ٢١ ) واتە : {خوا بەسەر کاری خۆیدا زاڵە ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن }

ئایا ئاگات لە ووشەی (( غالب )) بوو ؟

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ﴾ ( المجادلة : ٧ ) واتە : {ئایا نەتزانیوە کە خوا دەزانێ چی لە ئاسمانەکان و چی لە زەویدا هەیە } .

﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ ( إبراهیم : ١٩ ) واتە:{ئایا نەتبینیوەکە بێگومان خوا ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە} .

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ﴾ ( الحج : ٧٠ ) واتە :{ئایا نازانی ، بە راستی خوا دەزانێ بە هەموو ئەو شتانەی لە ئاسمان و زەویدا یە } .

ئەی موسڵمان ... ئەم زەویە هی کێ یە ؟ ... هی خوایە ... متمانە بوونت بە خوا نەلەرزێت ... تەنها ئەو زاتە خاوەنی زەوی و هەموو شتەکانیەتی ... وە ئەو زاتە بەتەنها خاوەنی هەموو کات و شوێنێکە.

پێش ئێمە چی هەبوو ؟ پێش موسڵمانان و دوژمنەکانیان کێ هەبوو ؟ ... پێش ئاسمانەکان و زەوی چی هەبوو ؟ ... پێش جنۆکە چی هەبوو ؟ ... پێش فریشتە چی هەبوو ؟ ... تەنها خوای تاك و تەنها هەبوو ... ئەم زەویەش خاوەنی هەیە ... دەبیستێ و دەبینێ ...

﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى(٤٦)﴾ ( طه : ٤٦ ) واته : { بەراستی من لەگەڵتانام ( واته لەگەڵ موسا و هاروندا ) دەبیستم و دەبینم} .

واته خاوەنی زەویه و بێناگا نیه لێ ی ... پاك و بێگەردی بۆ خوا ... بەڵكو ئاگاداری هەموو شتەكانه ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ ( الأنعام : ٧٣ ) واته : { زانا و ئاگایه به هەموو نهێنی و ئاشكرایەك } . پەروەردگارو مەلیكی هەموو شتێكه .

﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ(٨٢)﴾ ( يس : ٨٢ ) واته : { بەراستی كاری ئەو ( خوا ) ئەمەیه هەر كاتێ بیەوێ شتێ بەدی بێنێ ، پێ ی دەڵێت : به دەست بەجێ ( ئەو شته ) دەبێت } . فەرمانی ئەو لەنێوان پیتی ( كاف و نون )دایه (( كُن )) .. دەسەڵاتداره بەسەر هەموو شتێكدا ... بەرامبەر به هیچ شتێكی زەوی و ئاسمانەكان دەستەوسان نابێ ... مەزنی و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان .

كوا متمانەت بەخوا ؟ دوعاكەت بێ هوودە ناڕوات ... خوا گوێی لێت بووه و زانایه به راستگۆییت تیایدا ... بەڵام لە زەویدا حیكمەتێك هەیه خوای گەوره زانایه پێی ... لەوانەیه ئێستا نەیبینین .. لەوانەیه دوای چەند ساڵێكی تر پێبكەنین بەرامبەر بەو ماتەمیەی لەكاتی ڕۆژگاری نارەحەتیدا لە ناخماندا هەبووه ... پێدەكەنین كاتێ لە نارەحەتیدا خێر دەبینین ... پێشتر نەمانزانیوه .. پەروەردگارا پاك وبێگەردی بۆ تۆ .... تۆ دەزانیت و ئێمه نازانین .. كارەكان ڕێك دەخەیت و سۆزدار و بەڕەحمیت ..... پەروەردگارا پاك و بێگەردی بۆ تۆ ! ....

## مادام خوا لەگەڵتایه ... هیچ شتێ گرنگ نیه

وەفدی یەمەن هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا هاتووین پرسیاری ئەمەت لێ بكەین ؟ فەرمووی ﴿ كان الله وَحْدَهُ ... كَانَ في عَماء ﴾ واته : {خوا تاك وتەنها بوو ... لە دۆخی نەبینیندا بوو } . ( عماء ) واته : لەلایەن خەڵكەوه نابینرێت ... كەس نایناسێ ... ئێمه تازه خوڵقێنراوین لەسەر ئەم زەویه ... ئەم زەویه تەنها هی خۆی بووه پاشان ئێمەی لەسەر دروستكرد ... سەرەتا فومانكرد به ئادەمدا ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ

فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ(٢٩)﴾ ( حجر : ٢٩ ) واته : { هەر كاتیّ ریّك و پیّكم ـ ، وه فووم پیاكرد لـه گیانی ( تایـەتی ) خۆم ، دەبیّ یەكسـەر سوژدەی بۆ بەرن } .

وه ئەم گەردوونە بە فوویەك كۆتایی دیّت ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّـ وَمَنْ فِي الأَرْضِ﴾( الزمر : ٦٨ ) واته : { كاتیّ فووكرا بە كەرەنادا ( بەشەیورد یەكسـەر هەموو ئەوانەی لـە ئاسمانەكان و لـە زەویدان دەمرن} .

كاتیّ .. خوای گەورە بانگ دەكات ﴿لِمَنْ الْمُلْكُ الْيَوْمَ...لِمَنْ الْمُلْكُ الْيَوْمَ﴾ واته ئەمرۆ مولّك و دەسەلاّت هی كیّ یە ... ئەمرۆ مولّك و دەسەلاّت هی كیّ یە } . كـ وەلاّم ناداتەوە ... چونكە كەس لـە ئارادا نیە ... خوای گەورەش دەفەرمویّ ﴿ الملك ـ لله الواحد القهّار ﴾ واته : { مولّك و دەسەلاّتی ئەمرۆ بۆ خوای تاك و بەدەسـەلاّتە } .

پیّشەوامان ئیبن عومەر ﷺ دەلّیّ : پیّغەمبەر ﷺ م بینی كە چووە سەر مینبە بەوپەڕی دەنگی بەرز بانگی كرد ﴿يُمَجِّدُ الله نَفْسَهُ ... يُمَجِّدُ الله نَفْسَهُ﴾ واته پەروەردگار ستایشی خۆی دەكات .. پەروەردگار ستایشی خۆی دەكات } . ئایا گوێـ لێیە ؟ ...

وه پیّغەمبەر ﷺ دەستی كرد بە خویّندنی ئەم ئایەتە : ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ(٦٧)﴾ الزمر : ٦٧ ) واته : { ( كافران ) خوایان نەناسیوە ( بەگەورەیان نەزانی ) بەو جۆرە شیاویّتی ، لـە رۆژی دواییدا هەموو زەوی لـە چنگی ئەو دایە ( بەدەست خوایە ) . و ئاسمانەكانیش بە دەستی ئەو پیّچراون ، خوا پاك و بلّندترە لـەوەی كە دەیكەنە هاوبەشی }

پیّشەوامان ( إبن عمر ) ووتی : پیّغەمبەر ﷺ دەیفەرموو ﴿ يقول الله تعالى : أناالملك ... الجبار ... أنا المهيمن ... أنا العظيم ﴾ دەستی كرد بە ژماردنی ناوەكانی خوای گەورە الإمام أحمد في ( مسنده ) ( الحديث : ٧٢/٢ ) ) ناوەكانی خوا لـە نارەحەتیدا بخویّنە .. بیریان لیّ بكەرەوە ... وە لـە دلّتدا بیانچەسپیّنە ...

پیّشەوامان (إبن عمر) ﷺ ووتی : بەردەوام پیّغەمبەر ﷺ ناوەكانی خوای دەژمارد ... ئەو رادەیەی مینبەرەكەم بینی لـەژیّر پیّغەمبەری خوا ﷺ دەلـەرزی!...

مینبەر ... تەختە ... بێگیان ... لەترسی خوای گەورە جولاًیەوە و لەرزی .. بەهۆی ناوەکانی خوای گەورەوە ... پێغەمبەر ﷺ جێگیر بوو ... بەلاًم بەهۆی توندی و متمانەیی پێغەمبەر ﷺ بە ناوەکانی خوا و دەسەلاًتی و مەزنی و مەلەکوت و موڵکی خوا ... تەختەکە هاتە لەرزین ... تێك مەچۆ خوات لەگەڵدایە .... خوامان لەگەڵدایە کە خاوەنی هەموو شتێکە ... ئەو کەسەی خوای گەورە بە جەلال و کەمالیەوە لەگەڵیدا بێت چۆن شکست دێنێت ؟ !

## أنى هذا؟! مِن عند أنفسكم...!..(ئەمە چی یە ؟! لەلایەن خۆتانەوەیە )

دەپرسیت : بۆچی ئێمە لەم نارەحەتیانەداین ؟ دەزانین کە خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا و هەموو فەرمانەکان بەدەستی ئەوە ... بۆچی موسڵمانان بەردەوام توشی مەینەتی و نارەحەتی دەبن ؟

پرسیارێك بوو هاوەلاًن ( رەحمەتی خوایان لێ بێت ) دوای جەنگی ئوحود لە پێغەمبەر ﷺ یان کرد... دوای شکست هێنانیان ، لەکاتێکدا ئەوان ئەهلی هەقن و موشریکەکان ئەهلی ناهەقن ... چی لە کافریی گوناهترە ... بۆچی دوای سەرکەوتن شکست روویدا؟!..

ئەوە رووخان و شکست نەبوو .... بەڵکو گەڕانەوە و شکان بوو بۆ سوپا..

حەفتا هاوەڵ مردن ... هاوەلاًن دەیانوت (( أنّى هذا )) بۆچی ئاوا ... لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺمان لەگەڵدایە .

پاشان ئایەتەکان دابەزین و وەلاًمیان دایەوە ﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ﴾(آل عمران:١٦٥) واتە : { ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ ئەو شکستە لە خۆتانەوەیە } .

ئەم ئایەتە ئێستە لەگەڵ ئێمەدا دەدوێ ﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ﴾ قورئان بخوێنەوە ... وەلاًمی هەموو ئەو پرسیارانە دەبینیتەوە کە لە نارەحەتیدا نائارامی کردوویت ... ئەو قورئانە دەستوری نەتەوەیە ...بەلاًم بۆ هەموو کات و شوێنێك .

﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ﴾ ئێوە تەنها لە ماوەی نارەحەتیدا بەخەبەر هاتوون ... بەلاًم ئێوە ئەی موسڵمانان سەد ساڵە خەوتون ... ئایا چەند رۆژێکی کەم و چەند ساڵێکی کەم بەسە لەبەرامبەر سەد ساڵدا ؟

بەڵێ ... شەهیدەکان دەکەون ... هەوڵێکی زۆر لەو پێناوەدا خەرج دەکرێت .. بە

وەك زلـلەیەك وایە بە رووخساری هەموو خەوتوویەكی بێئاگادا ...

تا هەستێتەوە و بزانێ چی بەسەر خۆی و نەتەوەی و وولاتیدا هاتووە ...

## ﴿ واللّه متمّ نوره ﴾

## ( خوای گەورە رووناکی خۆی تەواو دەکات )

جێگیری دووەم : ئاینی خوا هەمیشە سەرکەوتووە ... دەبێ دڵنیا بیت لە

...دەتگەڕێنمەوە بۆ ئەو قورئانەی کە ماوەیەکی درێژە بێئاگای لێی .. ئەم ئایەتە بخوێنەرەوە

﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ(٨)﴾ (الصف ٨)

واتە: {دەیانەوێ بە فووی دەمیان نووری خوا بکوژێننەوە ، بەڵام خوای گەورە نووری خۆی

تەواو دەکات با کافرانیش پێیان ناخۆش بێت} .. ئایا دەزانی ئەمە مانای چی یە یان لەچی

دەکات ؟

وەك ئەوەی کەسێك بیەوێ بەدەستی رووناکی خۆر بگرێت ... و بیەوێت رووناکی خۆر

نەگات بە خەڵکی! ... ئایا بڕوا بەوە دەکەیت ؟ ...

کەواتە .... بۆچی بڕوا ناکەیت خوای گەورە ئاینەکەی سەر دەخات ؟ ئەمە ئاینی ئەوە

... ئەویش سەری دەخات ... و ئەویش دەیپارێزێ .

ئایا دەزانی ئێمە لە چی دەکەین ؟ دەڵێ ی بەکرێ گیراوین لە کارگەیەکدا ... بەکرێ

کار دەکەین ... کارگەکەش هی خاوەنەکەیەتی ... خوای گەورە نوونەیەکی مەزنتر

لەوە...

وێنای بکە ، ئەگەر هەموو مرۆڤەکان بینە گسکدەرو شەقامەکان پاك بکەنەوە ... بۆچی

؟ دەیانەوێ پاك و بێگەردی ئاسمان بە تەپوتۆزی زەوی لیخن و لێڵ بکەن ... ئایا شتی وا

دەبێ؟

وە هەروەها کەسێك لەو بڕوادابێت کە خوای گەورە ئاینەکەی سەر ناخات ... و

هێزێکی گەورە هەیە دەستەوسانین لە بەردەمیدا و ئاینەکەمان تێك دەشکێنێ !! ...

نەخێر ... ئاسمان پێدەکەنێ و پرشنگ دەداتەوە ... تەپ و تۆزەکەش دەگەڕێتەوە بۆ خۆمان ... و ئاسمانیش هیچ زیانێکی پێ ناگات .

دڵنیابە ... خوای گەورە تەواوکەری ڕووناکی و نووری خۆیەتی و سەرخەری سەربازەکانیەتی با کافرانیش پێیان ناخۆش بێت .

## پەیمانی خوایە ... بۆ صالحان !

رابمێنە لەم فەرمایشتەی پەروەردگار ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ(١٠٥)﴾ ( الأنبياء : ١٠٥ ) واتە:{سوێند بە خوا بێگومان ئێمە نووسیومانە لە زەبوردا لەدوای (لوح المحفوظ)دا ، بەراستی سەرزەوی ( بەهەشت ) بەندە چاك و پاکەکانم بە میراتی دەیبەن } . بەڵام پەروەردگارا بەندەکانت ! ... ئاگادار بە ... (( صالحات )) ! ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمْ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا (٥٥)﴾(النور:٥٥)واتە:{خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە ، وە کردەوەی چاکەکانیان کردووە ، کە بێگومان دەیانکا بە جێنیشین (ی خەڵکی تر ) لە زەویدا ، هەر وەك ئەوانەی ( ئیمانداران ) پێش ئەمانی کردە جێنیشین ، وە ئاینەکەیان بۆ دەچەسپێنێ ، ئەو ( ئاینە )ی کە خوا پێ ی ڕازی بووە بۆیان ، وە ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێ بۆ ئاسایش و ئارامی ( لەوکاتەدا ئیتر)هەر من دەپەرستن و هیچ هاوبشیەکم بۆ بڕیار نادەن } .

پەروەردگار کوا پەیمانەکەت ؟ ... بەڵام ... کوا ئیمانداران ؟ !

بەم شێوەیە قورئان دەدوێ و بڕیار دەدات ... ئەمەیە جەختی لەسەر دەکات ...

## تۆ لەو گروپە بە

دڵنیابە ...ئاین سەردەکەوێ و هیچ ڕێگرێکی نیە ... قورئان هەواڵی ئەوەمان پێ دەدات ﴿كَتَبَ اللَّهُ لأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي (٢١)﴾ ( المجادلە : ٢١ ) واتە:{خوا نوسیوێتی ، کە بێگومان من و پێغەمبەرانم سەردەکەوین } . ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا (٥١)﴾ ( غافر :

٥١ ) واته : { ئێمه پەیامنێرانی خۆمان سەر دەخەین و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە } ئاینی خوا بێگومان سەردەکەوێ ... ئەگەر سەرکەوتنەکە لە تۆوە بێت ئەوە ووریا و بلیمەتیت ! ... ئای کە بەختیار و دڵخۆشیت ئەگەر سەرکەوتنەکە لەسەر دەستی تۆ و لە زەمەنی تۆدابێت ! ...

ئای کە دڵشاد دەبیت ئەگەر تۆ لەو گرووپە بیت کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان دەفەرموێ ﴿ لا تزال طائفة من أُمتي ظاهرين على الحق ، لا يضرهم من خذلهم حتى تقوم الساعة ﴾ ( الإمام أحمد في مسنده ( الحديث : ٥/٩٢-٩٤ ) الحاكم من (( المستدرك )) (الحديث : ٤٤٩/٤ ) ) واته : { هێشتا کۆمەڵ و تاقمێك لە نەتەوەکەی من بەئاشکرایی لەسەر هەقن ، هەر کەس بیەوێ زیانیان پێ بگەیەنێ ناتوانێ هەتا قیامەت بەرپا دەبێت } ئەوانە بەو شێوەن .

تۆ لەو گروپە موبارەك و پیرۆزە بە ، چەسپاوبە لە زەمەنی نارەحەتیەکاندا ... تا چاوت شاد دەبێت بە دیداری سەرکەوتن ! ...

## رابوونی نەتەوە ..... گەورەترین نارەحەتی

برای ئازیزم ... نەکەی بێزار بیت لە سەرکەوتنی خوا و زاڵ بوونی ئاینەکەی .. ئەگەر بێزار بیت لەوە ئەوە چوویتەتە ناو بازنەیەکی مەترسیدارەوە ... لە گوناهە گەورەکان نزیك دەبیتەوە ... ئایا لەمە تێ دەگەیت . بێئومێدی لە رەحمی خوا گوناهێکی گەورەیە ... بێئومێد نەبی لەوەی کە دینی خوا سەردەکەوێت ... با دوای ١٠٠ ساڵیش بێت .

تۆ چیت داوە لەوە ؟ ! .... ئایا ئاینی تۆیە ؟ ! .... ئەوە ئاینی خوایە ! ...

بێگومان ئاینی تۆیە .... بەڵام ئەوە بەدەستی تۆ نیە ... بەڵکو ئەرکی سەر شانی تۆ ئەوەیە کە هەوڵ بدەیت و تێکۆشیت... ئەوەی تریشی لەسەر خوایە .... چی بوێ دەیکات.

وە بزانە ... هەموو کەسێ سوود لە نارەحەتی وەردەگرێ .... دەسەڵاتداران و بێدەسەڵاتەکان ... ئەو پەند و وانە و ئامۆژگاریانەی سوودیان لێ دەبینین لە نارەحەتیەکاندا .... ئەگەر بیان نووسینەوە ئەوە چەندین کتێب پڕ دەکاتەوە .

لە مەینەتیەکاندا .... چەنێك لە لاوان ڕادەبن ؟ چەنێك لە کچان دێنەوە بە هۆش خۆیاندا و دوای بێئاگاییەکی درێژخایەن رادەچڵەکن ؟ ... چەنێك لە مرۆڤەکان هەست دەکەن کە مەسەلەکە و مەینەتیەکە پەیوەستدارە بە ئاینەکەیانەوە و ئیسلامەکەیانەوە ... پێویستە هەوڵ بدەن و تێبکۆشن ، چونکە ئەوان بەرهەمەکە دەچننەوە ؟ ..

چەنێك لە خەڵك دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامدانی سوننەتەکان ... ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبێت ، و قورئان بەزۆری دەخوێنێت و زیاتر پارێزگاری لە فەرز و سوننەتەکان دەکات ؟ ... چەنێك لە ئادەمیزاد بە ئاگادێتەوە کە کاری بۆ ئاینەکەی نەکردووە و لە ڕۆژی قیامەتدا دەچێتە بەردەم پەروەردگاری و لەو کەمتەرخەمیەی خۆی دەترسێت .. کاتێ پەروەردگار لێ ی دەپرسێ : بەچی خزمەتی ئاینەکەت کرد ... ! چەنێك لە ئادەمیزاد دەگری بۆ براکانی ، و بۆ نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە بۆ خۆی و شتە بێ بەهاکان دەگری ؟ ...

هەموو خەڵکی سوود وەردەگرن لە مەینەتیەکان با پێچەوانەی ئەوەش ببینن ... با بیشمرێت ... چونکە دەبێتە شەهید و سەرفراز و سەربەرز و بە دڵنیاییەوە دەچێتە بەردەم پەروەردگاری .

## گریانی ڕەحمەت ... نەك دەستەپاچەیی

بەڵێ .... لەوانەیە لە مەینەتیەکاندا بگرین و فرمێسکی زۆر بڕێژین ... بەڵام ئەوە هەرگیز گریانی دەستەپاچەیی نیە ... بەڵکو گریانی خۆشەویستی یە بۆ موسڵمانان ... گریانی بەشداریە لەگەڵ براکانمان لە هەموو شوێنەکان ... پێغەمبەر ﷺ گریا لەسەر پێشەوامان حەمزە ﷺ تا ئەو رادەیەی ووتیان:گوێمان لە شینی پێغەمبەر ﷺ بوو ...

بەڵام گریانی دەستەپاچەیی و بێئومێدی نەبوو ... بەڵکوگریانی ئازار و ماتەم .... ئەو مرۆڤە ... کاتێ پرسیان : ئایا دەگریت ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی:﴿ تلك رحمة يجعلها الله في قلوب عباده﴾ واتە : { ئەو گریانە ڕەحمەتە خوای گەورە خستویەتیە دڵی بەندەکانیەوە } .

پاشان چی کرد دوای ئەو گریانە ؟ هەستایەوە و فەرمووی : ﴿ من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فليتبعني ﴾ واتە : { ئەوەی ئیمانی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با شوێنم کەوێت } . دەی ... هەستن بۆ کارکردن ... کاروانەکەمان تەواو دەبێت ...

نەکەی لە دەستەپاچەیی بگریت ... ئەگەر لە دەستەپاچەییدا گریایت فرمێسکەکانت بشارەوە ... بیشارەوە ... شەرمی لێ بکە ... وە ئەگەر لە ئازار و ئێش و بەشداریدا گریایت ئەوە بە ئاشکرا و لە ڕۆژی ڕووناکدا بگری ... بەڵام نەك بۆ دەستەپاچەیی و بێئومێدی لە مەینەتیەکاندا ... ئەگەر نا ئەوە سەد ساڵی تریش لە تاریکی و تیاچووندا دەژین ...

سەرت بەرزکەرەوە ... و هیوا بڕاو مەبە ... دڵنیابە کە ئاینی خوا سەرکەوتووە ... خوای گەورە سەرخەرمانە .... ﴿إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ واتە : {ئەگەر ئێوە باوەرداربن } .. پەروەردگارا ئێمە ئیماندار دەبین سەرمانخە و سەرفرازمانکە ...

## ئایا بڕوا بە ووتەی پێغەمبەرەکەت دەکەیت یان نا ؟ !

ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە : ﴿ إن الله زوى لي الأرض ، فرأيت مشارقها و مغاربها ، و إن أُمتي سيبلغ ملكها ما زوى لي منه ﴾ ( مسلم : ٧١٨٧) واتە : { بێگومان خوای گەورە زەوی لەبەر چاو لابردم ، منیش ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواکانیم بینی ، بێگومان نەتەوەی من دەگاتە ئەو شوێنەی کە لەبەر چاوی مندا لابرا } .ئەمە ووتەی پێغەمبەری ئازیز و ڕاستگۆ و دەست پاکمانە .

ئایا نەیفەرمووە : ﴿ ليبلغنّ هذا الأمر ما بلغ الليل والنهار حتى لا يترك بيت مدر ولا وبر .. إلا دخله هذا الدين بعز عزيز أو بذل ذليل ، يعز الله به في الإسلام ، و يذل به في الكفر ﴾ ( الإمام أحمد في مسنده ( الحديث : ١٠٣/٤ ) والحاكم في المستدرك ( الحديث : ٤٣٠/٤ ) ) واتە : { بەڕاستی ئەم ئاینە دەگاتە هەموو شوێنێك وەك چۆن شەو و ڕۆژ دەگاتە هەموو شوێنێك تا ئەو ڕادەیەی هیچ ماڵ و جێیەك بوێر ناکات...کە ئەم ئاینەی نەگاتێ جا لە ڕێگای سەرخەرێکی دەسەڵاتدارەوە بێت یان لە ڕێگای زەلیلێکی ژێردەستەوە بێت} .

ئایا تێگەیشتیت لەم مانایە ؟ ! ... ئایا بڕوا بە خوای تاك و تەنهات و پێغەمبەرە ئەمینەکەت دەکەیت یان نا ؟ ... کەواتە متمانەت هەبێت کە ئاینی خوا سەرکەوتووە .

## ئاخر زەمان ؟ .... هێشتا ماویەتی

هەیە دەڵێ : ئاخر زەمان هاتووە ... نەخێر ... بەداخەوە تێبگە

ئاخر زەمان نایەت هەتا ئیسلام سەرنەکەوێ ... دەجاڵ دەرناکەوێ تا ئیسلام سەرنەکەوێ و بالاّ دەست نەبێت . پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿ لا تقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون اليهود ، فيقتلهم المسلمون حتى يختبىء اليهودي من وراء الحجر والشجر فيقول الحجر والشجر : يا مسلم !يا عبدالله ! هذا يهودي خلفي فتعال فاقتله ، إلا الغرقد فإنه من الشجر اليهود ﴾ ( مسلم:٧٢٦٨)واتە:{قیامەت بەرپا نابێ هەتا موسڵمانان لەگەڵ جولەکەدا نەجەنگن ، موسڵمانان ئەوان دەکوژن تا ئەو رادەیەی جولەکە لەپشت بەرد و درەختا خۆیان دەشارنەوە ، بەرد و درەختەکە دەڵێن : ئەی موسڵمان ، ئەی بەندەی خوا ، ئەمە جولەکەیە لە پشتمەوە وەرە و بیکوژە ، تەنها درەختی (غەرقەد[1]) نەبێت کە درەختی جولەکەکانە } .

تۆش دەڵێیت : ئەوە کەی ؟ کەی سەر دەکەوین ؟

دوژمنەکانت وەلاّمیان داوەتەوە : کاتێ پرسیاریان لە خاتوو ((غولدا مائیر)) سەرۆك وەزیرانی پێشووی جولەکە کرد : ئایا ئەو فەرمودەیەی موسڵمانەکان باسی دەکەن لەگەڵماندا دەجەنگن و سەردەکەون ، ئایا ئەوە راستە ؟ ئەویش وەلاّمێکی سەیری دایەوە کە دیار بوو لە مەسەلەکە تێگەیشتبوو ، ووتی : لەوانەیە راست بێت ... بەلاّم ئەم موسڵمانانەی ئەم سەردەمە نا ! بەڵکو موسڵمانانێك چۆن لە نوێژی جومعەدا ئامادە دەبن لە نوێژی بەیانیانیشدا ئاوا ئامادە دەبن ... ئەو کاتە ئەوە دێتە دی ! .

بەراستی ئەوە سیفەتێکی ناخۆشە بۆ هەموو موسڵمانێکی بێچارە .

---

[1] درەختێکە ( ١ ) تا ( ٣ ) مەتر بەرز دەبێتەوە .

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ واته: { خوای گەورە هیچ هۆز و نەتەوەیە ناگۆڕێ تا خۆیان خۆیان نەگۆڕن } .

## ئایا خوا دەپەرستیت لەسەر پیتێك.. ؟ ! .... نەكەیت ! ..

جێگیری سێ یەم كە لە نارەحەتیدا پێویستیت پێیەتی :

جێگیر دەبم لەسەر پەرستشی خوا ، پەرستشی خوا پەیوەندی بە ئەنجامەكانەوە نیە ... واتە تەماشاكە : ئایا لە كاتی نارەحەتیەكاندا خوا دەپەرستیت ، چونكە ئومێدت هەیە بارودۆخەكە بە ووستی تۆ بڕوا ، بەڵام كاتێ هەستت كرد بارودۆخەكە بە وویستی تۆ ناڕو واز لە پەرستن دێنیت؟!... چۆن وا دەبێت؟...

بەندە پاكەكان لە پەرستشەكانیاندا لە كاتی فیتنەدا دەردەكەون ... بەڵێ ... دڵ زۆرتر ناسك دەبێت لەو ساتانەدا كە مرۆڤ ناچاری پەروەردگارە ... بەڵام ئایا دەبێت دوای بەسەرچوونی مەینەتی و نارەحەتیەكاندا خوا و پەرستشی لە بیر بكەین ؟ ! ... هەرگیز ... ئیماندار لە هەموو بارودۆخێكدا خوا پەرستە ... لە بەرامبەریشدا ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ﴾ واتە: { خەڵكی واهەیە لەسەر پیتێك خوا دەپەرستێ ، ئەگەر چاكەی تووش بوو دڵنیا دەبێ ، وە ئەگەر فیتنەشی تووش بوو ... } . دەی ! ... تۆ چی دەكەیت ﴿انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ﴾ واتە: { هەڵدەگەڕێتەوە بە روویدا } .

واز لە پەرستشی خوا دێنێت ﴿خَسِرَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةَ﴾ واتە:{دنیا و ئاخیرەتی لە كیس دەچێت ..} لە خوا بپاڕێرەوە نەتخاتە ڕیزی ئەو جۆرە كەسانە ...

پێشەوامان ئەبوبەكر ﷺلە سەختترین مەینەتیدا كە تووشی موسڵمانان هاتبێت ئەویش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بوو ووتی : ئەوەی محمد دەپەرستێ ئەوە محمد مرد ، ئەوەشی خوای گەورە دەپەرستێ ئەوە خوای گەورە زیندووە و نامرێت .

ڕووداوە نارەحەتەكان تووشی نەتەوە دێت ... بەڵام پەروەردگارمان دەپەرستین ... چۆن گوێمان لێ بێت فلان كەس سەرپۆشی لابرد .... فلان كەس وازی لە نوێژ هێنا ؟ ... ئێمە خوا دەپەرستین .. خواش زیندووە ونامرێت.

## ئایا شوێن ئیبلیس دەکەویت ؟ ئای لەو شکست خواردنە !!

خوای گەورە سەبارەت بەو کەسەی کە واز لە پەرستشی خوا دێنێت و هەڵدەگەڕێتەوە دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ ﴾(سبأ:٢٠) واتە:{بەراستی گومانەکەی ئیبلیس بۆ ئەوان راست دەرچوو} .

گومانی ئیبلیسی نەفرەت لێکراو چیە ؟ ووتی : چیتان دەوێ بیکەن لە وێنەی پەرستن و دەمارگیری و پاڵناندا ... من داوی خۆمتان بۆ دەنێمەوە و پێوە دەبن و دەکەون ... حاڵەتی دۆش دامان و بێئومێدی و گومانی خراپ و دووبەرەکی بڵاو دەکەمەوە تیاتاندا و ئەو کاتەش ئێوە دەکەون .... فیتنەی گەورە لە ناوتانا هەڵدەگیرسێنم ، کە سووتەمەنیەکەی دووبەرەکی و دوژمنایەتی و ئاژاوە بێت لە نێوان براکاندا و ئەم نەتەوەیەدا .... ﴿فَاتَّبَعُوهُ إ﴾ واتە: { ئەوانیش دوای دەکەون} . ئای کە شکست خواردنێکە !

﴿إلاَّ فَرِيقًا مِنْ الْمُؤْمِنِينَ(٢٠)﴾ ( سبأ : ٢٠ ) واتە : { تەنها گروپێك نەبێت لە ئیمانداران .. } . ئای چەندە بەختەوەرن ... ئەی ئیمانداران چەسپاو بن .

لە مەینەتیەکاندا دەردەکەوێت کێ شوێنی ئیبلیسی نەفرەت لێکراو دەکەوێت و گومانی راست بێ لەسەری . ئەی لاو ... ئایا لە کارەکەت دەگەڕێیتەوە بۆ ئاین؟ !

ئەی دایك ... ئایا واز دێنیت لەوەی دەستی منداڵەکانت بگریت و هانیان بدەیت لەسەر نوێژی بە کۆمەڵ و لەبەرکردنی قورئان ؟ !

نا ... نا ... ئەی پەروەردگار تێگەیشتین ... هۆشیار بووین ... دەرکمان پێکرد کە ساڵانی بێئاگایی پێشوو باجێکی زۆر زۆری پێداین ... جارێکی تر ئەوە دووبارە ناکەینەوە!..

## پەروەردگارت بپەرستە ... تا بە دیداری دەگەیت ...

وەرە با لێت بپرسم : چی ئەبێ ئەگەر ئەم نەتەوەیە تێکچێ و سەد ساڵ بکەوێت ؟ ١٠٠ ساڵ لە تەمەنی ئەم نەتەوەیە چی یە ؟ هیچ .

ئەم نەتەوەیە (١٣٠٠) ساڵ رێبەرایەتی نەتەوەکانی دەکرد ... ، چی تیایە ئەگەر (١٠٠) ساڵ لاواز بێت ؟ دوای ئەوە بە ویستی پەروەردگار زۆر بەهێزەوە هەڵدەستێتەوە ...

ئایا دوای هێرشەکانی خاچ پەرستەکان (٩٠) ساڵ نەکەوت ؟ پاشان نەتەوەی ئیسلامی سەر لە نوێ لەسەر پێ ی خۆی ڕاوەستا ... بەهێز و سەربەرز و ئازا و بەیداخ شەکاوەوە .

ئەمە یانی چی ؟ ... مەینەتیەکان چۆکم پێ دانادات و لە کاروان دوام ناخات ... وە ڕووناکی ئومێدم ناکوژێنێتەوە ...

ئەمە یانی چی ؟ ... نەکەی بوەستی لە پەرستش و گوێڕایەڵی و نزیك بوونەوە لە خوا بە پەرستش و کردەوەی چاك ... هەتا دەمریت ....

ئەم ئایەتە لەبەرکە : خوای گەورە بە پێغەمبەرە نازدارەکەی دەفەرموێ:﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ(٩٩)﴾ (الحجر:٩٩) واتە:{پەروەردگارت بپەرستە هەتا دڵنیایت بۆ دێت} واتە هەتا مردنت بۆ دێت...

ئەگەر هەموو خەڵکی بەتاوانا بچن و سەرگەردان بن ... سەرگەردان نابم ... بەردەوام پشتگیری هەق دەبم... با لە ژیانی خۆشمدا بەرهەمەکەی نەدوورمەوە ...

پێش ئیسلام ... باسی بەسەرهاتی شاعیرێ دەکەن کەناوی : ((أمرؤ القيس)) بوو ... ژیانی ئەم لاوە بریتی بوو لە : ئافرەت و پێك و شیعر ... باوکی مرد ... هەموو ئەوانەی لەبیر چوویەوە ... بوو بە کەسێ تۆڵە بکاتەوە ... بە شاراندا دەگەڕا تا هۆزێ ببینێ ڕێنومایی بکات بۆ ئەوە ... جارێکیان هاوڕێکەی تەماشای دەکات و دەگری ، دەڵێ : بۆچی دەگریت ؟ ئەویش دەڵێ : بۆ حاڵی تۆ دەگریم!... ئەویش ووتەیەکی جوان دەڵێت کە پوختەی ژیانی خاوەن ئامانجە

(( نحاول ملكا أو نموت فنعذراً ))

وە ئەگەر وویستت بۆ خۆت بەکاری بهێنیت بڵێ :

(( نحاول نصراً أو نموت فنعذراً )) ! ...

کاتێ بە دیداری پەروەردگارت دەگەیت لە قیامەتدا .... پۆزش دێنیتەوە ... چونکە کەمتەرخەم نەبوویت ... و دوانەکەوتویت .

## ئەوەی گرنگی نەدات .... لەوان نیە؟ !

جێگیری چوارەم و کۆتایی : برایەتی بنچینەیەکە لە بنچینەکانی ئیسلام ... موسڵمانان لە هەموو شوێنەکان برای تۆن ...

نەکەی کاتێ خۆنیشاندان دەکەیت شت بشکێنیت یان جنێو بدەیت یان لێدان بەکار بێنیت ! نەکەی... ئەو سەربازە برای تۆیە ! ... ئەو ئەفسەرەش مامی تۆیە ! ..: چۆن سووکایەتیان پێ دەکەیت و ئازاریان دەدەیت ؟ بەڵکو تۆ لێپرسراوی لەوان و لە حەوانەوەیان .. چونکە برای تۆن ...

وە هەر مەینەتیەك تووشی هەر موسڵمانێك دێت لەسەر ئەم زەویەدا تۆ بەشداری لە هەڵەکەدا ئەگەر سەرکەوتنیان بۆ نەخوازیت و یارمەتیدان و کارکردن بۆ دۆزەکەیان نەخوازیت ...

با فیتنە و مەینەتیەکان وات لێ نەکات لۆمەی برا موسڵمانەکانت بکەیت تا دڵت بحەوێنیتەوە ، و پشت کەیت لەوانەی بە بۆچونی تۆ هەڵەیان کردووە ...

ئایا نازانیت کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ﴿ من لم يهتم بأمر المسلمين فليس منهم ﴾ ( الحاكم في المستدرك ( الحديث : ٣١٧/٤ ) )واتە : { ئەوەی گرنگی بە کاروباری موسڵمانان نەدات لەوان نیە } . کارەکە زۆر مەترسیدارە ﴿فليس منهم ﴾ واتە : { لەوان نیە } .

ئایا نازانیت پێغەمبەر ( ص ) دەفەرموێ (( ئەوەی لەلایدا سووکاتی بە موسڵمانێ بکرێت و ئەمیش بتوانێت سەری بخات و بەلاّم سەری نەخات ، ئەوە بە دڵنیایەوە خوا لە قیامەتدا بە بەرچاوی هەموو دروستکراوەکانەوە سەرشۆڕی دەکات )) . ئایا بەرگەی ئەم هەڕەشانەی پێغەمبەر و خوای گەورە دەگریت ؟ ... ئایا بەرگە دەگریت لە موسڵمانان نەبیت ؟ ! ... کەواتە واز لە برا موسڵمانەکانت مەهێنە... چونکە بنچینەیەکە لە بنچینەکانی ئایین .

## دوای پەرستش ....داوای لێخۆش بوونە

ئەمە مەسەلەیەکی باوەڕی و پەرستشە ...... سەرکەوتنی موسڵمانان پەرستشە و بەهۆیەوە لە خوا نزیك دەبینەوە ... بەدەر لە تەماشاکردنی ئەنجامەکان ....

ئاساییە پەرستش بەچی کۆتایی پێدەهێنرێت ؟ بە داوای لێخۆش بوون ...

ئەنجامی ئەو مەینەتیە چۆن بێت ... تۆ لە میانیەوە تۆ مادەم سەرکەوتنی موسڵمانانت دەوێ پەرستشە بۆ تۆ .. داوای لێخوش بوون بکە و کۆتایی پەرستشەکەت بە داوای لێخۆش بوون تەواو بکە ... تنۆکە ئەتۆمێك لای خوای گەورە زایە نابێت ... ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه(٧)﴾(الزلزلە:٧)

ئەگەر نا ... ئەگەر دوای مەینەتی وازت لە سەرخستنی موسڵمانان هێنا ... و سنگت پڕکرد لە رق و کینە و لۆمە و سەرزەنشت ... ئەوە مەینەتیەکی مەترسیداری تری نوێ دەست پێ دەکات ... شەیتان فوی پیادا دەکات تا زیاتر بلێسە بسێنێ ... ئەو کاتە شکست خواردوی یەکەم تۆیت ... ! لە بیرت نەچێت ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا﴾ ( آل عمران : ١٠٣ ) واتە : { هەمووتان دەست بگرن بەهۆکاری پەیوەستیتان بە خواوە (کە قورئانە) و پەرتەوازە مەبن و جودا مەبن }.

﴿وَلاَ تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾(الحشر:١٠) واتە :{وە هیچ رِق و کینەیەك مەخەرە دڵتانەوە دەربارەی باوەڕداران}.

﴿وَلاَ تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾(الأنفال:٤٦)واتە:{جیاواز مەبن و دووبەرەکی مەکەن ، بەهۆیەوە بشکێن و لاواز بن ، و هێزتان بڕوا و نەمێنێ}.

داوای لێخۆش بوون بکە ... و سوپاسی خوابکە تا کۆمەکت بێت ... سەرخستنی موسڵمانانت بوێت ... وە پەنابگرە بە خوا لە پەرتەوازەبوونی ریزەکان و جیاوازی دڵەکان.

## ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا(٥)﴾ { بێگومان دوای ناخۆشی خۆشی دێت }

لەوپەڕی مەینەتیدا لە یادت بێت ... کە بەدڵنیاییەوە دوای هەموو ناخۆشیەك خۆشی دێت ... ئەمە یاسایەکی خواییە گۆڕانی بەسەردا نایەت مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت ..

ئەگەر تۆ ئەمڕۆ لاواز و زوڵم لێکراویت .. ئەوە ئەم مژدەت لە یاد بێت : ﴿وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الأَرْضِ﴾ ( القصص : ٥ ) واتە : {ئێمە دەمانەوێ ( بە چاکەی

خۆمان ) منەت بنێین ، بەسەر ئەوانەی کە لاواز و ژێر دەست کرابوون لە وولاتی(میصر)دا}.

سەرەتا : زولـملێکراویت ... پاشان خوا سەرت دەخات ..

سەرەتا : شکست خواردوویت ... پاشان خوا سەربەرزت دەکات ... بەلاّم ئارام بە .

## (( بێگومان سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە ))

لە ئێستاوە هەڵوێستی خۆت دیاری بکە ... دەتەوێ موتابەعەی کاری ئیسلامی بکەیت لە هەر بارو دۆخێکدا بێت ؟ چەسپاو بیت لەسەر هەق، بارودۆخ بە هەر شێوازێك بێ ؟ یان لەگەڵ ئەوانەدایت کە دانیشتوون ؟

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنْ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ(٣٨)إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(٣٩)﴾ (التوبه:٣٨،٣٩)واتە:{ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ، ئێوە چیتانە کاتێ پێتان بوترێ دەرچن ( بۆ جیهاد ) لە رێ ی خوادا ، لە شوێنی خۆتان ناجوڵێن(خۆتان دوا دەخەن ) ، ئایا ئێوە رازین بەم ژیانەی دونیا لە باتی پاشەرۆژ،دەی کامەیە خۆشی و شادی ئەم ژیانە نزیکە ، لە بەرامبەر خۆشی پاشەرۆژدا زۆر کەمە ، ئەگەر نەڕۆن و دەرنەچن ( بۆ جیهاد ) ، ( خوا ) سزاتان دەدات بە سزایەکی سەخت و ئازاردەر ، وە لەجیاتی ئێوە گەل و کۆمەڵێکی تر دەهێنێ جیاواز لە ئێوە ، و ئێوە هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنن ، وە خوا بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا } .

نەکەی لەوانە بیت کە خوای گەورە دەربارەیان فەرمویەتی ﴿رَضُوا بِأَنْ يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ ﴾(التوبه:٩٣)واتە:{رازی بوون بەوەی لەگەڵ بەجێماوەکاندا بن ( لە جیهاد وەك ئافرەت و منداڵ و نەخۆش)} . بەلاداکەوتن بەبێ سوود و بەبێ کار .... وەك ئەو شەل و کوێر و نەخۆشانەی دوا کەووتون لە کار ... ﴿وَطَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ ( التوبه : ٩٣ ) واتە : { خوای گەورە مۆری ناوە بەسەر دڵیانەوە) } ڕووناکی ئیمانی تێ ناچێت .

دەی ... ببزوێ ! ... مژدە بەخشبە ... چەسپاو بە ... متمانەت بە خوا هەبێ ... کار بکە ... و دروستکار بە ... ئەم چوار شتە چەسپاوە لە ساتەکانی مەینەتیدا لە دڵتدا چەسپاو بکە

١.هەموو شتەکان بە دەستی خوایە ... ئەم زەویەش هی پەروەردگارمانە چی بوێ پێ ی دەکات .

٢.ئاینی خوا بێگومان سەرکەوتووە ... زاڵە ... ئەمە مشتومڕ و بیرکردنەوەی ناوێت .

٣.بەردەوامیی لەسەر پەرستنی خوا و گوێڕایەڵی تا مردن .

٤.برایەتی بنچینەیەکە لەبنچینەکانی ئاین .. بەبێ ئەم ئاین هەرەس دێنێ ... سەرخستنی موسڵمانان پەرستشە و بەهۆیەوە لە خوا نزیك دەبینەوە . لە دڵتدا بیچەسپێنە و دروستانە ناوێتە ببە لەگەڵیدا...

وە بیرمان نەچێت خوای گەورە خۆی چاودێری ئەم نەتەوەیە دەکات ... وە بێگومان دوای هەموو مەینەتیەك خۆشیەك هەیە ... نارەحەتیەك زاڵ نابێ بەسەر دوو خۆشیدا ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا(٥)إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا(٦)﴾(الشرح: ٥ ،٦) واتە:{بەراستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی دێت ، بێگومان لە راستیدا لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت}لەوانەیە مەینەتی سەرەتای سەرکەوتن و سەرفرازی نەتەوە بێت .

ئەوسەرکەوتنەی خوای گەورە پەیمانی پێداوین ... کاتێ کە ناخی خۆمان دەگۆڕین .. ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت .

# ﴿ ئایین ئامۆژگارییە ﴾

## مەبەستمان لە ئامۆژگاری چیە ؟

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (( الدين نَصِيحَة )) ( الترمذي /١٩٢٧ و النسائي :٤٢١١)
واتە ﴿ئایین ئامۆژگارییە﴾ ....

ئەمە چەند مانایەكی هەیە بۆ ئێمە ؟ واتە : پێویستە كردەیی بین و لە بەر ڕەزامەندی خوای گەورە ئامۆژگاری بكەین ، وە تەماشای هەموو ئەو كاروبارانە بكەین كە پێویستیان بە ئیصلاحە و بیان گۆڕین .... بە پێی یاسای ((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ )) ( الرعد – ١١).... واتە ﴿بێگوان خوا بارودۆخی هیچ گەلێك ناگۆڕێت ، هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەكرێت خۆیان نەگۆڕن و نەیكەن﴾ .

خوێنەری بەڕێز هەر كێشەیەكت تووش ببێت پێویستی بە ئیصلاح یان ئامۆژگاری هەیە .... بەڵێ ئاین ئامۆژگارییە ... فەرمودەی (الدين نَصِيحَة) كۆی ووتەكانە لەو بارەیەوە ، چونكە پێغەمبەر ﷺ ڕای هێناوین لە سەر ئەوەی ووتەكان كورت بن و ماناداربن ...

خۆشەویستانم ... لە بەر خاتری پەروەردگار ئامۆژگاری بكەن ... هەست دەكەم كە هەندێك دەیانەوێ بپرسن چۆن لە بەر ڕەزامەندی خوا ئامۆژگاری بكەم ؟ وە ئەو ئامۆژگاریە چی یە پێشكەش بە كەسانی تری بكەم ؟

وەلاّم ..... ئامۆژگاری ئیرادەی خێرو چاكەیە بۆ ئامۆژگاری كراوەكە تاك بێت یان نەتەوە .... دەتبینم دەپرسیت : ئەكرێ ئامۆژگاری تاك بكەم ، بەلاّم چۆن ئامۆژگاری نەتەوە بكەم ؟ پێت دەڵێم : كاتێ ئامۆژگاری براكەت دەكەیت و منیش ئامۆژگاری براكەم دەكەم و فلاّن ئامۆژگاری دراوسێكەی یان هاوڕێكەی دەكات ئەوە بە هەموومانەوە ئامۆژگاری نەتەوەیەكمان كردووە ... بڕوام پێبكە ئەم قسەیە زیادە ڕەوی ( مبالغە ) ی تێدانیە ...

پێویستە خۆمان ڕابێنینەوە لە سەر ئامۆژگاری لە نێوانماندا ، چونکە ئەمە کاردانەوەیکی کۆمەڵێ ئاکاری جوانی دەبێت لە ناو کۆمەڵگادا ...

## بەڵگە بێنەرەوە بۆ خۆشەویستیت بۆ ئاینی خوا

ئامۆژگاری گرنگیەکی گەورەی هەیە لە ژیانماندا ، ئەو ئامرازەیە کە خوای گەورە دایناوە بۆ پێگەیاندنی کۆمەڵگا .... ((كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ)) ( ال عمران / ١١٠ )واتە ﴿بەڕاستی ئێوە چاکترین نەتەوەیەکن کە بۆ ( سودی ) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە ، چونکە فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن ﴾.

بەڵێ فەرمان بە چاکە ئەکەین و ڕێگا لە خراپە ئەگرین ... لە پێناوی ئەوەدا ئێمە نەتەوەیەکی خێردارین ... چونکە لە پێناوی خوادا ئامۆژگاری دەکەین ...

خوێنەری ئازیز ... بۆ ئەوەی بە ڕاستی ئایندار بیت ، پێویستە ئامۆژگاری کار بیت . کاتێ ئامۆژگاری کەسێ یان کۆمەڵێ دەکەیت ئەوە بارودۆخی خەڵکی بەرەو باشە دەبەیت و ئاستیان بەرزدەکەیتەوە ....

لێرەدا مەسەلەیەکی زۆر ترسناك هەیە .... هەندێ کەس پێت دەڵێن : من جارێکیان ئامۆژگاریم پێشکەش کرد گاڵتەیان پێکردم .... نە ..... وا نەڵێیت ئەوە لوتکەی نائومێدیە ... جارێکیان ئامۆژگاری کار بووم بەڵام ئامۆژگاریەکەم هیچ سودێکی نەبوو .... جارێکیان ئامۆژگاریم پێشکەش کرد خاوەن کار دەری کردم ... جارێکیان ئامۆژگاری کار بووم .... هەموو ئەم قسانە دروست نین

ئەگەر حاڵ بەم شێوەیە بێت ، کەواتە چۆن هانی دەروغمان بدەین لە سەر ئامۆژگاری ؟؟ وە چۆن ڕاستگۆیی خۆمان بسەلمێنین لە سەر داواکردنی ڕەزامەندی خوا ؟ وە چۆن بەڵگە بۆ ڕادەی خۆشەویستیت دێنیتەوە بۆ ئایین و تێکەڵ بوونی ئەو خۆشەویستیە لەناو خوێنتدا ؟!

## خێری ئامۆژگاری

برای بەڕێزم ...... لەوانەیە هەندێ پرسیار بێت بە بیرتدا .... ئایا ئامۆژگاری خێری هەیە ؟ وە ئایا پێغەمبەر ﷺ داوای ئەوەمان لێ دەکات ؟ هەموو ئەم پرسیارانە بێگومان دێت بە بیرتدا ... بەڵێ ئامۆژگاری خێرێکی مەزنی هەیە با بە باشی گوێ لەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ بگرین ( ان اول ثلاثة يدخلون الجنة : شهيد و عفيف متعفف و رجل عبدالله فاحسن العبادة و نصح الناس ) واتە ( سێ کۆمەڵ یەکەم جار پێش هەموو کەس دەچنە بەهەشتەوە : شەهید ، پاکیزەو داوێن پاك ، وە پیاوێك بە باشترین شێوە خواپەرستی کردبێت و ئامۆژگاری خەڵکی کردبێت )

یا الله : ... ئەو کەسەی ئامۆژگاری خەڵکی دەکات ، یەکەم کەسە دەچێتە بەهەشتەوە ؟ لەوانەیە یەکێ بلێ من یەکەم کەس دەچمە مزگەوتەوە بۆ نوێژکردن ... بەڵێ ... بەلاَم یەکەم کەس نیت کە بچیتە بەهەشتەوە چونکە لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا ئامۆژگاری کار نەبویت .

وێنای بکە ئامۆژگاری کار لە پێناوی خوادا پلەی شەهیدی هەیە ! بەڵێ ئەم قسەیە ڕاستە ... ئازیزانم داواتان لێ دەکەم ئامۆژگاری کار بن و کەستان نەڵێن : ئامۆژگاریەکەم گۆڕان دروست ناکات ، بەڵێ سوێند بە خوا گۆڕان دروست دەکات .... لەوانەیە دوای چوار یان پێنج ساڵ ، بڕوام پێبکەن ... کۆمەڵگا گۆڕانی بە سەردا دێت کاتێ کە بگەڕێینەوە و ڕابێین لە سەر ئامۆژگاری و وەری بگرین ....

لەم بەسەرهاتەدا لە گەڵمدابە .. هاوەڵێك هات و ووتی : پێغەمبەر ﷺ لە سەر سێ شت بەیعەتی پێدام ، نوێژکردن و زەکاتدان و ئامۆژگاری موسڵمانان ( جاء صحابي فقال لقد بايعني رسول الله ﷺ على ثلاث اتمام الصلاة و إتاء الزكاة و النصح لكل مسلم ) ( البخاری ٥٧ و مسلم ١٩٧ )

وە هاوەڵێك ووتی چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتی بەمێ لە سەر ئیسلام ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتت دەدەمێ لە سەر ئیسلام ، مەرجێکی دانا لەسەرم و فەرمووی : ( ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێ بکەیت )

قال صحابي : ذهبت الى رسول الله (ص) ابايعه على الاسلام ، فقلت : يارسول الله ابايعك على الاسلام ، فشرط علي فقال ( والنصح لكل مسلم ) البخاري /٥٨ .

## بێگومان ئامۆژگاریکار دەبم هەتا مردن

وەرە لە گەڵم و بیهێنە خەیاڵی خۆت ئێستا ئێمە دەچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی دەڵێین : ئێمە بەیعەتت دەدەینێ ... ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێ ( بە مەرجێ ئامۆژگاری خەڵکی بکەی لە بەر خوای گەورە )

## سوێندت دەدەم بە خوا ئایا ڕازی دەبیت ؟؟

ئایا ڕازی دەبیت پابەند بیت بە گوێڕایەڵی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ؟ ئەو پێغەمبەرەی ﷺ فەرمانمان پێ دەدات ئامۆژگاریکار بین لە بەر ڕەزامەندی خوا تا لە ژیانی دینی و دنیاییدا سەرفراز بین ...ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر ﷺ مەرجی لە گەڵدا کرد ووتی : سوێند بێ بە خوا ئامۆژگاری کار دەبم هەتا دەمرم ... ڕات چیە بەرامبەر بەم واتانە ؟؟

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (( للعبد الذي ينصح لسيده اجران ) البخاري: ٢٥٤ واتە : ( ئەو بەندەی ئامۆژگاری سەرۆکەکەی دەکات دوو پاداشتی هەیە )

ئەمە مانای چیە ؟؟ مانای ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ فێرمان دەکات کە بچوك ئامۆژگاری گەورە بکات و گەورەش هی بچوك ، وە لاواز ئامۆژگاری بەهێز بکات با بەندەیەکی خاوەندارو ژێردەستە بێت ، لێمانی دەوێ بێدەنگ نەبین لە ئاستی هەقدا ، بەڵکو ئامۆژگاری برا موسڵمانەکانمان بکەین ..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( ان مثلي و مثل ما بعثني الله به اليكم كمثل رجل رَأى جَيْشًا فَصَرَخَ فِيهم : لَقَدْ رَأَيْت و الجَيشُ بِعَينِي و أنا النذير العُريان يطلب النجاة )

واتە (نمونەی من و ئەوەی کە خودا بە مندا ناردویەتی وەك نمونەی ئەو پیاوە وایە سوپایەکی بینی هاواری کرد بە سەرگەلەکەیدا ، من بە چاوی خۆم سوپاکەم بینی ، وە من ئاگادارتان دەکەمەوە لەوەی کە خۆتان ڕزگار بکەن )

قسە لە گەڵ خەڵکیدا بکە ... ئامۆژگاری خەڵکی بکە ... کاتێ هەڵەیەك دەبینیت قسە بکە و بێ دەنگ مەبە ...

وە کاتێ لە نەخۆشخانەیەکدا هەڵەیە دەبینی قسە بکە و بێ دەنگ مەبە ... ئامۆژگاریکەر بەو ئەو هەوڵە خراپانە دامەپۆشە کە بەرپەرچدانەوەی لە تواناادا هەیە .... کاتێ لە فلان کۆمپانیا یان فەرمانگەی حکومیدا هەڵەیە دەبینیت .... ئامۆژگاریکار بە .

ئامۆژگاری دراوسێکەت بکە .... ئامۆژگاری نزیکت بکە ... ئامۆژگاری خێزانەکەت بکە .... بە سۆز و دانایی و زانستەوە ... بۆ ئەوەی گۆڕانمان بە سەردابێت پێویستە پێش ئەوە خۆمان بگۆڕین ((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ )) ( الرعد – ١١)

واتە:﴿ بۆ خوا هەیە فریشتەی بێشومار کە بە نۆرە بەدوای یەکدا دێن، تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەر و پشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خوا، بێگومان خوا بارودۆخی هیچ گەل و نەتەوەیەك ناگۆڕێت( لە خۆشیەوە بۆ ناخۆشی یان لە زەلیلیەوە بۆ سەربەرزی یان لە گرانیەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان ئەکرێ نەیگۆڕن و نەیکەن، کاتێکیش خوا بیەوێت بەلایەك بەسەر هەر میللەتێکدا بێنێت(لە دەرەنجامی سەرکەشی و یاخی بوونیان) ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لە خوا فریایان بکەوێت و رزگاریان بکات﴾.

## خێر لە نەتەوەیەکدا نیە کە ئامۆژگاری کەریان تێدا نەبێت :

سەردارمان عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ : خێر لە نەتەوەیەکدا نیە کە ئامۆژگاری کەریان تێدا نەبێت وە خێر لە نەتەوەیەکدا نیە کە ئامۆژگاری قبوڵ نەکەن .....

وە دەبینی لە سەر مینبەر دەڵێ : ( خوا ڕەحم بەو کەسە بکات کە عەیب و نەنگیەکانم نیشان دەدات )

دەی تکام وایە لێتان ... ئامۆژگاری قبوڵ بکەن بە هەر شێوەیەك بێت و لە هەرکەسەوە ئاراستەتان بکرێت ...ئایا ئەمە دەتوانن ؟ ئایا دەتوانی ئەوە قبوڵ کەیت کەسێك نەنگیەکانت

نیشان بدات و ئامۆژگاریت بکات بە دوورکەوتنەوەت لێ ی ؟ دڵنیابە .... ئەگەر ڕازی بوویت ، ئەوە خەڵکانی تریش ئامۆژگاریەکانت قبوڵ دەکەن و دووچاری بەرپەرچ دانەوە نابیت .

## لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن ... ئامۆژگاری کێ بکەین ؟؟

وەڵامەکە لە فەرمودەکەی پێغەمبەردا ﷺ یە (( ئاین ئامۆژگاریە ) ) ووتمان : ئەی پێغەمبەر بۆ کێ ئامۆژگاری بکەین ؟ فەرمووی : ( بۆ خوا و پێغەمبەرکەی و بۆ کتێبەکەی و بۆ پێشەوایانی موسڵمانان و عامەی خەڵکی )

قال ﷺ: (( الدين نصيحة ) قلنا يارسول الله ، ولمن ننصح ؟ قال : لله و لرسوله و لكتابه و لائمة المسلمين و عامتهم)) ( الترمذي :١٩٢٦) چۆن ئامۆژگاری بۆ خوا بکەین ؟ ئامۆژگاری بۆ خوا ئەوەیە ئامۆژگاری بکەیت بۆ فەرمانەکانی خوا ، خوا بە مەزن بگریت و فەرمانبەرداری خوای گەورە بیت ، و واز لە سەرپێچی خوا بێنیت و ، سنورەکانی خوای گەورە نەبەزێنیت ، وە گوێرایەڵی خوا بیت ، و ئاینی خوا سەرخەیت ، ئەمە مانای ئامۆژگاریە بۆ خوا.. ئایا بینیتان چۆن دەستەواژەی ( ئایین ئامۆژگاریە ) ئاشکرا و ڕوون بوویەوە ؟ بۆمان ئاشکرا بوو کە بریتی یە لە ئایین هەمووی .... دەمێنێتەوە ئامۆژگاری بۆ پێغەمبەری خوا : ئامۆژگاری بۆ پێغەمبەری خوا ئەوەیە کە خۆشت بوێ و ڕێزی بگریت و بە زیندوویی یان بە مردوویی سەری بخەیت ... وە بۆ کێی تر ؟ بۆ کتێبەکەی پەروەردگار ... چۆن ئامۆژگاریکەر بم بۆ کتێبەکەی ؟ ئەوەیە ئامۆژگاریەکەت بە ووتەو ئایەتەکانی پەروەردگار بێت ... وە بیخوێنیتەوە بۆ خەڵکی و کاری پێبکەیت بۆ خۆت و سنورەکانی تێ نەپەڕێنیت و فەرمانەکانی جێ بە جێ بکەیت و واز لە قەدەغەکراوەکانی بێنیت .

دەی هەستە و ئامۆژگاری دەوروبەرت کە : کەس و کارت ، دراوسێکەت ، هاوڕێکانت . ئێمە نەتەوەیەکین ئامۆژگاری یەکتر ناکەین ... وە خێر لە نەتەوەیەکدا نیە کە ئامۆژگاری کەری تێدا نەبێت وەك چۆن خێر لە نەتەوەیەکدا نیە کە ئامۆژگاری پێ قبوڵ نەبێت .

وه بۆ ئەو ئازیزانەم کە ئامۆژگاری قبوڵ دەکەن ... گوێ لەم فەرمایشتەی پەروەردگار بگرن ((وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ۚ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ )) البقره /٢٠٦ ) واتە : ﴿ئەگەر پێی بڵێی لە خوا بترسە غەرایی دەیگرێت و شانازی بە گوناه و تاوانەوە دەکات و سوردەبێت لە سەری ، جا ئەو خوا نەناسە دۆزەخی بەسە ، سوێند بە خوا ئەو دۆزەخە شوێن و جێگە و لانکەیەکی نالەبارە ﴾

وا دامەنێ کە ئامۆژگاری ئاراستە دەکرێت بە دژی تۆ و بۆ کەمکردنەوەی رێز و بەهای تۆیە ... نەخێر ... نەخێر ئامۆژگاریکار پێش هەموو شتێ خەڵکی خۆش دەوێت

## مەرجەکانی ئامۆژگاری چی یە ؟

یەکەم : دڵنیا بیت لە ڕاستی ئەو شتەی کە ئامۆژگاری دەکەیت لە بارەیەوە بەرامبەر بە کەسەکە ، وە ووتەکانت ڕاستگۆیانە و دروست بن ( فاقِدُ الشَيْءِ لا يُعْطِيهِ ) واتە:(کەسێ شتێکی نەبێ ناتوانێ بیبەخشێ )

دووەم: نیازی ئامۆژگاری لە دڵتدا دابنێیت ... نەك تەنها لە بەردەم خەڵکیدا بە ئامۆژگاریکەر خۆت دەربخەیت و خۆت بە پلەیەکی بەرزتر سەیر بکەیت لە خەڵکی تر .

سێ یەم : لە نهێنیدا ئامۆژگاری ئاراستە بکەیت و ئامۆژگاریەکانت ئاشکرا مەکە .

دەڵێن : ئیماندار ئامۆژگاریکار و داپۆشەرە و ... دووڕوو هەتك کەرو نهێنی دەرخەرە .

چوارەم : پێویستە بە هێمنی و دانایانەوە ئامۆژگاریکار بیت .

خوێنەری بەڕێز : تەماشای دانایەتی ئەم بە سەرهاتە بکە : رۆژێکیان پیاوێك دەچێتە خزمەت ئەمیری ئیمانداران ( هارونە ڕەشید ) تا ئامۆژگاری بکات ، زۆر بە توندی قسەی لە گەڵدا دەکات ... تۆ وا دەکەیت و وا دەکەیت .... ئایا وەڵامی دانایانەی هارونە ڕەشید چی بوو بێت ؟ ووتی : براکەم ئایا تۆ باشتریت لە موسا ﷺ؟ ووتی : نەخێر ، ووتی: ئایا من لە فیرعەون خراپترم ؟ ووتی نەخێر: ووتی کەواتە مادام تۆ لە موسا ﷺ باشتر نیت و منیش لە فیرعەون خراپتر نیم ، ئایا نازانیت کە پەروەردگارت چی فەرموو بە موسا

((فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴿٤٤﴾ )) طه/ ٤٤) واته :

هەردوکتان ( مەبەست لە موساو هارونە ) بە نەرمی و جوانی گفتوگۆی لە گەڵدا بکەن ، بەڵکو یادەوەری وەربگرێت ، یان ترسی ( سزای ) ئێمە لە دەرونیدا جێگیر بێت )

ئازیزانم ئەمەیە ئەو ئاینەمان کە ڕازی نابێت لێمان تەنها بە دانایی ( الحکمە ) نەبێت لە گوفتارو کردارماندا .

ڕابمێنە لەم چیرۆکە : هارونە ڕەشید ڕەت بوو بە لای شوانێکی مەڕومالاّتدا .... شوانەکە ویستی ئامۆژگاری هارونە ڕەشید بکات .... بۆیە هاروەنە ڕەشیدی وەستاند و پێی ووت : (( ئەی پێشەوا ، ئەگەر ئامۆژگاریت بکەم لێت ئەترسم ، وە ئەگەر ئامۆژگاریت نەکەم لە دوارۆژت ئەترسم ، وە ترسانم لە دوارۆژی تۆ مەزنترە لە ترسانم لە تۆ ... چونکە تۆم خۆش ئەوێ))

## ئادابەکانی ئامۆژگاری :

ئازیزانم ئامۆژگاری بۆ خوا بکەن .... وە لە یادتان بێت کە لە ئادابەکانی ئامۆژگاری ئەوەیە کە بە نهێنی ئامۆژگاری بکەیت وە نەچیت بۆ لای خەڵکی و ڕوو شکێنیان بکەیت لە بری ئەوەی ئامۆژگاریەکەت وەربگرن ڕابکەن لێت .... مرۆڤەکان فریشتە نین ... مرۆڤەکان هەموویان هەڵە دەکەن... سۆزدار و لێبوردە و هێمن بە لە گەڵ خەڵکیدا ... وە لە یادت بێت تۆش هەڵە دەکەیت ....

ئەمە پێنج ئادابی ئامۆژگاری کردنە :

١- نەرمی و میهرەبانی

٢- پەنهانی لە کاتی ئامۆژگاری کردندا

٣- نیاز و دڵسۆزی پێش ئامۆژگاری کردن

٤- بارودۆخی خەڵکی لێك بدەیتەوە و حسابی بۆ بکەیت

٥- وە دڵنیا بیت کە ئەو نەنگیە بە دڵنیاییەوە لە مرۆڤدا هەیە

ڕەچاوی ئەم ئادابانە پێکەوە بکەن ... وە فرسەتی ئامۆژگاری کردن بۆ خوا لە دەست نەدەن ... با جارێکی تر ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ بخوێنینەوە: (إنَّ أوَّلُ ثلاثةٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ : شَهِيدٌ و عَفِيفٌ مُتَعَففٌ وَ رَجُلٌ عَبَدَالله فَأَحْسَنَ العِبادَةَ وَ نَصَحَ الناس )

نەتەوەی ئێمە کاتی خۆی نەتەوەیەکی ئامۆژگاری کاربوون ، لە بەر ئەوە هەقی خۆیەتی ئەم بەدواداچوون و خوێندنەوەیە ... ئایا دەبینی ؟

دەگەڕێینەوە بۆ ئامۆژگاری بە نەرمی و میهرەبانی .

وە هەندێکمان ڕێنومایی هەندێکمان دەکەین بۆ سەر خێر تا خوای گەورە دەمانگێڕێت بە نەتەوەیك کە لە ئاستی خۆشەویستی و ڕەزامەندی ئەودابین .

## ❁ گرنگی کارو تەکنیك ❁

هێشتا زۆرێکمان پرسیار دەکات چارە چیە .... وە هێشتا جەخت لە سەر ئەوە دەکەینەوە کە چارەسەر ئەوەیە کە خۆمان خۆما بگۆڕین ... تا پەروەردگار ئەوەی بە

سەرماندا هاتووە بیگۆڕێت ، نەوەك وەك ئەو كەسە بین كە لە بەردەم درەختێكی گوژاڵكدا وەستابوو ، وە دەپاڕایەوە لە خوا كە بیكات بە سێو .... توخوا چۆن شتی وا دەبێت ؟ ئەوەی سێوی دەوێت با بینێژێت ...

پێشتر دواوین لە مەڕ زانست ، زانست تەواو نابێت تەنها بە كاركردن نەبێت ....چۆن؟

## نەتەوەیەك كە كار نەكات ناتوانێ واقیعی خۆی بگۆڕێت

سەركەوتنی نەتەوە نایەتەدی تەنها بە گۆڕانكاری دەروونەكان نەبێت لە خودی خۆیاندا ... وە نەتەوەش پێویستە چاكە بچێنێت هەتا چاكە بدورێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە یاسای خواییە ، كە ئێمە كردوومانە بە ناونیشانی كتێبەكەمان (((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ )) ( الرعد – ١١)) واتە

﴿بێگومان خوای گەورە هیچ هۆز و نەتەوەیەك ناگۆڕێت تا ئەو هۆز و نەتەوەیە خۆیان خۆیان نەگۆڕن﴾

پێشتر دواوین لە مەڕ زانست و لە مەڕ ئەو لاوەی دەچێتە كۆلێژەوە و نازانێ چی دەخوێنێ یان لە چیدا پسپۆڕ دەبێت ، چونكە دەیەوێت بخوێنێ و جۆری پسپۆڕیەكە گرنگ نیە بە لایەوە ، وە كاتێكیش دادەمەزرێ دەبینێت لە پیشەكەیدا كاردەكات و كە هیچ پەیوەندیەكی بە پسپۆڕیەكەوە نیە ! بێ شك دێتەوە یادتان ... چۆن نا !؟ ئەمە حاڵی زۆربەی لاوانی ئەمڕۆمانە !!

وە هەروەها دواین لە مەڕ ئەو وڵاتانەی كە تواناكانیان زیاترە لە بەهرەكانیان ... بۆیە پێش زۆربەی وولاّتانی تر كەوتن ....وە باسی ئەو لاوەمان كرد كە دەتوانێ سەركەوتوو بێت تەنها بە بونی كۆمپیوتەرێك ، ئەو ئامێرەی كە ئەمڕۆ حوكمی سەراپا جیهان دەكات و پۆلێنی دەكات لە نێوان پێشكەوتوو و دواكەوتوودا .... وە هێشتا گوێ بیستی زۆرێ لە خەڵكی دەبین كە دەڵێن : هەموو ئەمانە بە دەستی ئێمە نیە ، دەیانبینیت دەیخەنە سەر

ئەستۆی کەسانی تر تا بەرپرسیاریەتی زانست و کارو سەرکەوتن نەخەنە سەر ئەستۆی خۆیان .

## دەوڵەمەندترین بەروبوم لە جیهاندا ؟!

لە سۆز و بەزەیی پەروەردگار ئەوەیە کە دەوڵەمەندترین بەروبومی جیهانی لە جیهاندا بە وولاّتانی موسڵمانی گێڕاوە ، خوای گەورە وولاّتانی موسڵمانانی کردووە بە گەورەترین ئەمباری خێرو خێرات کە لە هیچ جێگایەکی تردا کۆنەبوەتەوە ، وە هیچ ئامانج و بەهایەکیشیان کەم نیە ، چونکە ئیسلام هەموو بەهایەکی بوونی هەڵگرتووە ، وە هیچ دوایان ناخات لە کاروان تەنها کارنەکردن و تەمەڵی نەبێت ، کەواتە لە چی کەمە ؟! تەنها لەوەی کەمە کە توخمی مرۆیی کاربکات ، تا سود وەربگرێت لەو بەروبومانە و گەشەی پێبدات و پێشی بخات .... لە گەڵمدا سەرەنجی ئەم زانیاریە بدە کە چەند گرنگە لە هەمان کاتیشدا خەفەتبارە ..

یابان لە یەك ساڵدا چوار ئەوەندەی هەموو ئوممەتی ئیسلامی بەرهەمی هەیە ، بە نەوتیانەوە و بە سەروەت و سامانیشیانەوە ... تەماشا بکەن ....بۆشایی ..... بۆشاییەکی مەزن .... وێنای بکە ... بەرهەمی هەموو ئوممەتی ئیسلامی یەکسانە بە چارەکی بەرهەمی یەك وولاّت کە یابانە !! لە گەڵ ئەوەدا کە یابان ٨٠٪ ی ڕووبەرەکەی شاخ و دوورگەی پەرش و بلاّوە ... وە دانیشتوانەکەی (٢٠٩) ملیۆن کەسە ، وە هەمیشە مەترسی زەمین لەرزە و بورکانی لیّ دەکرێت ....وە هەروەها کەمتر لە نیو سەدەیە ڕزگاری بووە لە جەنگێکی مەزنی جیهانی کە ژێرخانی ئابوری ئەو وولاّتەی دارِماند ... چۆن بەو شێوەیە سەیرە پێشکەوت کە ئێمە ئەمرۆ دەرکی پیّ دەکەین ؟!

ئەگەر تەماشای لیستی وولاّتە بەرهەم هێنەکان بکەین لە جیهاندا ، دەبینین ئەمریکا یەکەمین وولاّتە پاش ئەویش یابان .. پاش ئەو و ... پاش ئەو ... دەبینی یەکەمین وولاّتی ئیسلامی کە ئەندەنوسیایە لە ڕیزی (٢٨) دایە بە پێی ئەو پۆلێنە جیهانیە ... کەواتە ئێمە لە کوێداین ؟!

توخوا دواکەوتن لەمە زیاتر ئەبێ چی بێت ؟ نا بەخوا ئەمە ترۆپکی دواکەوتنە ... لوتکەی تەمبەڵی یە ، ئەمە لوتکەی پشت بەستنە بە بەرهەمی کەسانی تر

## چارەسەر بە دەستی کێ یە ؟!

سەیرە ئەگەر هەمیشە بەرپرسیاریەتی پێشکەوتن و گەشەسەندن بخەینە سەر ئەستۆی حکومەتەکان .... نەخێر، بە خوا ئێمە زیاتر لەوان بەرپرسیارترین ... کێشەکە بە دەستی ئێمەیە و چارەسەریش بە دەستی ئێمەیە ... کێشەکە ئەوەیە کە تەمبەڵین ... وە چارەسەریش ئەوەیە کە ڕزگارمان بێت لەو تەمبەڵیە بە لێبڕان و سووربوون و عەزیمەتەوە کاربکەین .

چۆن لەو بارودۆخە ناهەموارەدا ناژین کە ئەمڕۆ تێی کەوتووین کاتێ کە ڕێژەی یان ناوەندی ڕێژەی کارکردن لە نیشتمانی عەرەبیدا لە ١٢ خولەك تێپەڕ ناکات !! وە هەندێ جار دادەبەزێ بۆ (٥) خولەك کە لە بنچینەدا (٨) کاتژمێرە !! لە ئەڵمانیا پیاو نزیکەی ٧ کاتژمێر و سێ یەکی کاتژمێرێك کاردەکات .... وە لە یابان حکومەت دەیەوێ مۆڵەت بدات بە فەرمانبەران ، بەڵام فەرمانبەرەکان خۆیان نایانەوێت ، ئەنجامەکەشی دەبینی کە ڕێژەی کارکردنی فەرمانبەر لەوێ لە (٨) کاتژمێر تێپەڕ دەکات ...

لە گەڵ مندا تەماشای ئەم بۆشاییە گەورە بکە ... ئایا مەترسیدار نیە ؟ ئایا شەرم هاوەر نیە ؟! دەبینم سووربوون و عەزیمەت خەریکە دەچێتە دڵی هەندێکتانەوە... وە هەندێکی تر دەڵێ : ئەمە تواناکانی ئێمەیە و ئەوەش تواناکانی ئەوانە ... پێویستە بەرەنگاری ئەو ماندوێتی و تەمبەڵیە فیکری و دەروونی و جەستەییە ببینەوە ... وە بڕوامان هەبێت کە بەرهەم هێنان بەشێکە لە ئاینەکەمان ... بۆ هاتنە دی ئەو فەرمودەیەی کە دەفەرموێ (( العمل عبادە )) کارکردن پەرستشە .

وە کەسێك دەبینیت سەعات (٢) ی شەو دەخەوێت و کارەکەی سەعات (٨) ی بەیانی دەست پێ دەکات ، وە بە ماندوویی و دواکەوتووی و زۆر لە خۆکردن دەڕواتە سەر ئیشەکەی ... ئەوە تەمبەڵی فیکری و دەروونیە کە دەربارەی دەدوێین .

کەسێك مومارەسەی هیچ جۆرە وەرزشێك ناکات ، وە لە کاتی گونجاوی خۆیدا و بە ڕادەی پێویستی ناخەوێت، وە هەست بە داڕوخانی دەروونی دەکات ، ناتوانێ هەست بە ئینتیما بۆ نیشتمان بکات ... وە هەروەها ناتوانێ بەشداری کاری گەشەپێدان بکات ... چۆن دوای ئەوە دەگەڕێ بە دوای گۆڕانکاریدا لە ژیانیدا و بەدوای بەختیاری و سەرکەوتندا ؟

ماندوو بوون ، تەمبەڵی فیکری و دەروونی .... تەمبەڵی جەستیی ... ئایا ئەمە حاڵی لاوی خەمخۆری لێهاتووە؟!

وێنای بکە ئەگەر ئەم سێ دیاردە خراپە تووشی ملیۆنەها کەس بێت لە جیهانی ئیسلامیدا ... شێخ شەعراوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت ووتەیەکی زۆر جوانی هەیە دەڵێ : ئەوەی لە بەرهەمی وەشاندنی داسەکەی خۆیەوە نەخوات ئەوە بڕیار بە دەستی خۆی نیە )) ( الذي لا ياكل من ضربة فاسه لا يملك قراره من راسه )

چۆن بڕیار بە دەستی خۆی دەبێت لە کاتێکدا پشت بە کەسی تر دەبەستێ لە ڕۆزی و خواردنیدا .

## هونەری دزەکردن !!

چۆن نەتەوەیك دەتوانێ هەڵسێتەوە لە کاتێکدا پیاوانی ئەو نەتەوەیە دەچن بۆ سەرکارەکانیان بۆ خەوتن ... یان بۆ یاریکردن خۆیان و فیکریان ماندوو دەکەن بۆ دۆزینەوەی هونەرەکانی دزەکردن ... چۆن درۆ لە گەڵ بەرێوەبەرەکەیدا دەکات لە فلاَن شت و فلاَن شتدا ... بەلاَم باس لە هونەری بەرهەم هێنان ناکات ... وە هۆکارو کارەساتەکە لەو ووتە بەناوبانگە دایە کە دەبیستن بە ڕادەی وەرگرتنی پارەکە کاردەکەین!...

برایانم .... ئازیزانم ..... ئەم ووتەیە بەرەو شتێکی نادروست دەمان بات .... چونکە هەرکرێکارێ کاتێ ڕێ دەکەوێ لە سەر مووچەیەك ... ئەوە مەرجی خاوەن کاری قبوڵ کردووە ... ئەگەر پێچەوانەی ڕێکەوتنەکەیان بوو ئەوە ماڵەکەی حەرامە .... زۆرێك لە فەرمانبەران ئەگەر بچیت بە سەریاندا یاری (game)دەکەن لە پشت کۆمپیوتەرەوە ..

بەڕێوەبەر یان کەسێکی تر بچێت بەسەریدا بە یەك کلیك دەیگۆڕێت .... وە چەندین شێوەی تر لە کاتی دزەکردن بە خوا بینیومانە لە زۆرێك لە فەرمانگە و کۆمپانیاکاندا لە لایەنە فەرمانبەرەکانەوە .

ئێمە لە نێوان دوو پیاوداین : یەکێکیان کار ڕەت دەکاتەوە ، چونکە پێی وایە لە گەڵ بەهرەکانیدا ناگونجێت ، لە گەڵ درێژی و پانی سمێلیشیدا هێشتا خەرجی لە باوکی وەردەگرێ !... ئەویشیان ناچارە هەر جۆرە کارێك هەبێت بیکات ئەمەشیان بە گیان و حەماسەوە ئەو کارەی ناکات .... هەردوکیان نەتەوەکەیان بەرەو سەرکەوتن و سەرفرازی نابەن ...

بینیتان حاڵی نەتەوەی ئەمڕۆمان چی یە ؟!! بە خوا جاران لە حاڵێکدا بووە و ئێستاش لە حاڵێکی تردایە ... پەروەردگار هەموو شتێکی پی داوین ، وە نامانەوێ سود لە هیچ شتێك وەربگرین .... ئیتر چۆن تەپ و تۆزی پەککەوتەیی لە خۆمان لابەرین و سەر لەنوێ بە لێبڕاوانە بێینەوە مەیدانی کار ؟!

## ئەم هەموو بێ چارەیی و پشت بەستنە بۆچی ؟

زەویەکانمان مادەی سەرەتایی و و گرنگ و هەمە جۆر بەرهەم دێنێ ، بەڵام ئێمە ژێریمان لە دەستداوە ... بۆچی بە چەند دۆلارێکی کەم دەیفرۆشین و پاشان دەیکڕینەوە دوای دروستکردنیان بە سەدان دۆلار ؟ بۆچی ؟ ... لە پێناوی پشت بەستندا ! نازیزانم ... هێشتا کەسانێك هەن بە ڕادەی ڕازی کردنی بەڕێوەبەرەکەیان کار دەکەن نەوەك بە ڕادەی داهێنان .... دەیبینیت کار دەکات تا بەڕێوەبەرەکەی لێ ی ڕازی بێت .... ئەگەر ڕازی بوو لەو ئاستەدا دەوەستێ و داهێنانەکەی لە بیر دەکات ، بەڵام لەوانەیە بگاتە پلەیەکی بەرزتر ئەگەر هەوڵ و تواناکانی زیاتر بە گەڕ بخات .

پێغەمبەر ﷺ خۆی کرد بە مزگەوتدا کە کاتی نوێژ نەبوو ( ئەبو ئومامە ) ی بینی لەوێ و لێ ی پرسی (( یا ابا امامة ، ما یجلسك ؟ فقال : دیون و هموم ... فعلمه رسول الله هذا الدعاء : اللهم اني اعوذ بك من الهم و الحزم و اعوذ بك من العجز و الكسل )) الترمذي : ٣٥٠٣ ، ٣٥٧٢ ... واتە : ئەی ئەبو ئومامە چی تۆی دانیشاندووە لێرە ؟ ووتی : قەرزو

غەم ... پێغەمبەریش ﷺ ئەم دوعایەی فێرکرد : پەروەردگارا ، پەنا بە تۆ ئەگرم لە غەم و خەفەت ، وە پەنا بە تۆ ئەگرم لە بێ دەسەڵاتی و تەمبەڵی ))

کەواتە بێ دەسەڵاتی و تەمبەڵی دوو دەردی ترسناکن و دەبێ پەنا بە خوا بگرین لێیان ... ئێستە کۆمەڵێ کەس دەبینن بەتاڵیان پێ باشترە تا کارکردن ، بۆچی ؟ چونکە کارکردنەکە ناگونجێت لە گەڵ بروانامەکەیان و بەهرەکەیان و .... و ....... و .....

پەروەردگار دەفەرموێ ((هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ )) الملك /١٠ واتە :﴿ ئەو پەروەردگارەی کە زەوی بۆ زەلیل و ملکەچ کردوون ، دەی بگەڕێن بە هەموو گۆشە و کەناریدا لەو ڕۆزیەش بخۆن کە پێشکەشتانی دەکات ، دڵنیا بن کە سەرەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە﴾ .

وە هەروەها دەفەرموێ ((وَلَقَدۡ مَكَّنَّـٰكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَـٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿١٠﴾ )) الاعراف /١٠واتە : ﴿ بەڕاستی ئێمە ئێوەمان نیشتەجێ کرد لەم زەویەدا و جۆرەها کاری ژیانمان تیایدا بۆ سازاندون ، کەچی سوپاسی کەمی نیعمەتەکان دەکەن یان کەمتان سوپاس گوزارن ﴾

وە دەفەرموێ (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ) الجمعة /٩ واتە :﴿ئەی باوەڕداران ، ئەگەر لە ڕۆژی جومعەدا بانگ کران بۆ نوێژکردن ، بە پەلە بچن بە دەم خواوە ﴾ تەماشای چالاکی و حەماسەت بکە .

(فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠﴾ الجمعة/١٠ واتە : ﴿کاتێك نوێژ تەواو بوو بڵاو

بنەوە بە زەویداو بە تەمای بەخششی خوا هەوڵ و کۆشش بدەن ، وە یادی خوا زۆر بکەن ، بە ئومێدی ئەوەی سەرفرازی هەمیشەیی بن )

ئایا دەبینیت چۆن پەروەردگار شێوازی پەرستشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ؟ ئەوەی کە پێویستە : نوێژە، وە هەروەها هەوڵدان بۆ بەدەست خستنی ڕۆزیی ... نابێ دەستەپاچە دانیشین و چاوەڕوانی ڕۆزی بین وەك خێرو سواڵ بێت بۆمان و ئێمە تەمبەڵ بین ...

تەماشای ئەم ئایەتانە بکە کە پەروەردگار باسیان دەکات دەربارەی شەونوێژ پاشان کۆتایی پێ دێنێت بەم ئایەتە (( عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ )) المزمل / ٢٠ واتە :﴿ (خوا)زانی کە لەمەولا نەخۆشتان زۆر دەبێت وە هی تری واتان دەبێت کە ڕێ دەکەون بە زەویدا بەشوێن ڕۆزی خوادا دەگەڕێن وە کۆمەڵێکیش دەجەنگن لە ڕێی خوادا﴾ئاگادار بە ... ئەمە بانگەواز نیە بۆ شەونوێژکردن ... بەڵکوجەخت کردنە لە سەر گرنگی کارو چالاکی و گەڕان بە دوای ڕۆزیدا .....

## گوفتارو کرداریان یەك نیە !!

هەمیشە چەمکانێکی هەڵە دەبینین .... وەك ئەوەی کەسێکی ئایندار دەبێت بەڵام شکست خواردووە لە کارەکانیدا بە بیانووی ئەوەی گرنگی بە هیچ نادات بێجگە لە پەرستش نەبێت ... چۆن شتی وادەبێ لە کاتێکدا هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموویان کاریان دەکرد ؟!! وە ئایەتەکانی قورئان هەمووی ئیمان و باوەڕ دەبەستێتەوە بە کردەوەی چاکەوە ... وە ئایا ئەو پزیشکەی ئازارەکانی خەڵکی کەم دەکاتەوە ئەوە ڕێگای لێ دەگرێت کە کردەوەی چاك بکات ؟ یان ئەو کارەی لە کردەوە چاکەکان نیە ؟؟ پەروەردگار دەفەرموێ ( ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ) سبأ /١٣

واته ﴿ئەی شوێنکەوتوانی داود ﷺ ئێوە بە کردارو گوفتار سوپاسگوزاربن ، هەرچەندە کەمێك لە بەندەکانم سوپاس گوزارن ﴾

بڕوام پێبکەن ... ئەگەر داهێنانکاربین و بە باشی کاربکەین هەموو ساتەکانی کار دەگۆڕێت بۆ ساتەکانی خێر .... مەسەلەکە هەمووی پێویستی بە جوانکاری و نیەت پاکی هەیە کە ئەو کارە لە خزمەتی نەتەوەی موسڵماناندا بێت .

پێشەوامان عومەری کوڕی خەتاب ﷺ زەویەکی هەبوو لە گەڵ یەکێك لە پشتیوانان ( انصار ) بە نۆرە کشتوکاڵی تێدا ئەکرد ... ڕۆژێك دەیکێڵاو ڕۆژێکیش دەهات بۆ مانەوە لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژانە گلێردەبووە لە گەڵیدا یان بۆ ئەوەی بزانێ چی کردووە بە زەویەکە ، یان ئەوەی لە پێغەمبەرەوە بیستویەتی لێ ی وەربگرێت .... ئەمە عومەری کوڕی خەتابە .

بەڵام پێشەوامان ئەبوبکر ﷺ کە باوەڕەکەی یەکسانە بە باوەڕی نەتەوەیەك ، سێ جار سەروەت و سامانی دەبەخشیێ بە موسڵمانان : جارێکیان ڕۆژی کۆچکردن ، وە جارێکیان ڕۆژی جەنگی تەبوك ، وە جارێکیان ڕۆژەکانی جەنگی الردە (هەڵگەڕانەوە) پێشەوامان ئەبوبەکر ﷺ بازرگانێکی بەڕێز بوو

وە پێشەوامان عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ وە هەروەها پێشەوامان عبدالرحمنی کوڕی عەوف ﷺ ئەگەر ئەو بازرگانیەیان نەبوایە کە بەباشی دەیانکرد نەیان دەتوانی ئەو هەموو بەخشش و خەیراتە بکەن کە لە پێناویدا بوون بەوانەی کە مژدەی بەهەشتیان پێ درا.

وە تەماشای ووتەی عومەری کوڕی خەتاب بکە ﷺ : بە خوا حەزناکەم مەرگم بۆ بێت بە یەکێك لەم دوو شێوازە نەبێت : یان موجاهیدێك بم لە پێناوی خودا ، یان هەوڵدەرێك بم بۆ بەدەست خستنی ڕۆزی ) ئایا لە گرنگی کارکردن تێ گەیشتن ؟؟

بە خوا ئەگەر ئێمە بە ڕاستی پشتمان بە خوا ببەستایە ڕۆزی دەداین وەك چۆن ڕۆزی باڵندە دەدات .. وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( تغدوا خماصا و تعود بطانا ) واتە:( برسیەك تێرکە بە تێری دەگەڕێتەوە)

## ئایا ڕازی دەبیت وەك باڵندەی گۆت وابیت ؟

دەگێڕنەوە کە بازرگانێك لە سەردەمی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمدا دەیەوێت واز لە کارکردن بێنێت بۆ خوا پەرستی .... چوو بە بیاباندا ، باڵندەیەکی گۆتی کوێری بینی . پیاوەکە سەری سوڕما ئەم باڵندەیە چۆن خۆراك پەیدا دەکات .... تەماشای کرد باڵندەیەکی تر خواردنی بۆدێنێت ، بۆیە بڕیاریدا واز لە کاکردنەکەی بهێنێت ، ئەم هەڵوێستە زیاتر ئەمی دڵنیا کرد کە بێگومان ڕۆزی بۆ دێت ، کاتێ بە سەرهاتەکەی بۆ ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم گێڕایەوە .... ئەویش پێی ووت : ئایا ڕازی دەبیت ببیت بە باڵندەی ئیفلیج ؟؟؟؟ دەستی بەرز باشترە لە دەستی نزم {مەبەست لە دەستێکە بەخشێت و دەستێکیش وەربگرێت . وەرگێڕ}

کارکردن پەرستشە ، بەلاَم پێویستە هەقی تەواوی پێ بدرێت ، لە ژێریەوە نیە واز لە نوێژ بێنین چونکە کاردەکەین .... یان واز لە کارکردن بێنین بە بیانووی پەرستشەوە .

پێغەمبەر ﷺ جارێکیان تەوقەی لە گەڵ پیاوێکدا کرد ... بینی دەستی زبر بووە بە هۆی زۆر ئیش کردنەوە فەرمووی ( هذه يد يحبها الله )) واتە : ﴿ئەمە دەستێکە خوای گەورە خۆشی دەوێت ...﴾

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( التاجر الصدوق الامين مع النبيين و الصديقين و الشهداء) الترمذي /١٢٠٩ واتە : ﴿بازرگانی ڕاستگۆی دەستپاك لە گەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان دایە﴾ ...وە هەروەها دەفەرموێ ( من زرع زرعا او غرس غرسا تاكل منه بهيمة او طيرا او انسانا غفر له بكل ثمرة تؤكل من هذا الزرع ) الامام الاحمد في مسنده (٥٥/٤) واتە ( ئەوەی ڕووەکێ بچێنێ یان نەمامێ بچێنێ بە زەویدا ، ئاژەڵ یان باڵدار یان مرۆۋ لێی بخوات بە ڕادەی ئەو بەروبومەی کە دەخورێت لێ ی خوای گەورە لیَ ی خۆش دەبێت )

وە هەروەها فەرموویەتی :﴿ من بات كالا من عمل يده بات مغفورا له ) واتە﴿ ئەوەی لە بەرهەمی دەستی خۆی بخوات خوای گەورە لیَ ی خۆش دەبێت﴾

وە هەروەها ( ان الله يحب المؤمن المحترف ) المنذري في الترغيب و الترهيب (٥٢٤/٢) واتە :﴿ خوای گەورە مرۆڤی پیشەوەری خۆش دەوێت )

پێشەوامان عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەگەڕا بە مزگەوتەکاندا بۆ ئەوەی بزانێ کێ لە مزگەوتدا دانیشتووە لە کاتەکانی غەیری نوێژدا ... جارێکیان کۆمەڵێکی بینی دانیشتبوون

لە مزگەوتا کە کاتی نوێژ کردن نەبوو ... پرسیاری لیّ کردن : بۆچی دانیشتوون ؟ ووتیان : هاتووین داوای ڕۆزی لە خوا بکەین ....عومەریش دارێکی دەرهێنا و دەستی کرد بە لێدانیان و ووتی : نەگبەتی بۆ ئێوە ، کەستان دانەنیشن بۆ داواکردنی ڕۆزی و بڵێ : ئەی خوایە ڕۆزیم بدە ، لە کاتێکدا لێرە دانیشتووە ... ئاسمان زێرو زیو ناباریێنێت .

ئەی گروی موسڵمانان ، ئایا ڕازی دەبن وەك باڵندە ئیفلیجەکە وابن لە بری ئەوەی باڵندەیەکی نان پێدەربن ؟؟ تکاتان لیّ دەکەم وا مەبن .... بیهێننەوە بیرتان کە خوای گەورە زەکاتی فەرز کردووە لە سەر ماڵی خەوتوو نەك لە سەر ماڵی سود پێگەیەنەر یان ئەو ماڵەی کاری پێدەکرێت ...تەماشای ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ بکە کە دەیهێنێتەوە یادمان کە پەرە بە بەرهەمی نیشتمانی بدەین دەفەرموێ ( ما اكل احد منكم طعاما خيرا من ان ياكل من عمل يده ) الامام في مسنده ( ١٣٢/١٣١/٤) واتە ( هیچ خواردنێ بەڕادەی ئەوە خێری نیە کە مرۆڤ لە بەرهەمی دەستی خۆی بخوات) ، لە یادتان بێت بوژاندنەوەی نەتەوەی ئێمە پشت بە دڵسۆزی هەریەکەمان دەبەستێت لە کارەکەیدا ... ئەوەی کارێکی دەست ناکەوێ کە بگونجێ لە گەڵی، با مومارەسەی شتێکی نوێ بکات .

ئەگەر بە باشی لێبڕێین چارەسەر دەدۆزینەوە، بەڵام هەرگیز بەبێ کارکردن هەڵناسینەوە، ئاستی بەرهەمەکانتان بەرزکەنەوە...ڕێژەی کارکردنتان لە ١٢ خولەکەوە بەرزکەنەوە بۆ ٣ یان ٤ سەعات ئەو کاتە نەتەوەکەمان پێشکەوتنێکی بەرچاو بەخۆیەوە دەبینێت...

یادی ئامۆژگاریەکەم بکەنەوە...گۆڕانمان بەسەردا نایەت مادام پشت بە کەسانی تر دەبەستین لە ڕۆژیماندا.

# ئامانجی خۆت دیاری بکە

## ئایا چ ئامانجێکت هەیە لەم ژیانەدا؟....

لەوانەیە بپرسیت:ئەم پرسیارە چ پەیوەندیە کی بەگۆڕانکاریەوە هەیە ؟ بێگومان وەڵامت ئەیەمەوە :

ئەگەر ئامانجێکت هەبێت لەژیاندا، بێگومان لێ بڕاویشت دەبێت...کارەکان بەباشی ئەنجام دەدەیت ،ئەگەر ئامانجێکت هەبێت لەژیاندا باشتر کارگەر دەبێت وزانستخواز دەبێت و بەرهەمداردەبێت وبەهای کات دەزانێت ،وەزیاتر لەخواترس دەبێت و دووردەکەویتەوە لەگوناهکاری ،هەموئەمانە کاتێك دێنە ئاراوە ئەگەر ئامانجێك هەبێت لەژیانتداو ڕاپیەڕێنیت بە بەختەوەریەوە ...ئایا ژیرانەیە هەزاران مرۆڤ ژیان بەسەربەرن تەنها بۆئەوەی بخۆن و بخۆنەوە وڕابوێرن ونەوەیان لێ ببێتەوەو هیچ ئامانجێکیان نەبێت !!؟؟ پرسیارێکەو وەڵامەکەی

خەفەتبارە لەوانەیە یەکێك بڵێت : هەموو ئەم قسانە ئاراستەن بۆ لاوان و گەنجان ....بەلاّم ئایا مرۆڤێك لەتەمەنی شەست ساڵیدا دەتوانێ ئامانجی خۆی دیاری بکات ؟..بەڵێ..بەڵێ لەتوانادا هەیە مادام مرۆڤەکە لەتوانایدا هەیە هەناسە بدات ...شایانی باسە زۆرێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ کەموسوڵمان بوون بەتەمەن بوون وەکاری مەزنیان ئەنجامدا بۆ خزمەت وسودی ئیسلام و ئاینەکە .

## چیرۆکێکی خەمناك....

باسی بەسەرهاتی مرۆڤێکت بۆدەکەم کەلەژیاندا هیچ ئامانجێکی نەبوو..بەمنداڵی باوك ودایکی دەیخەنە قوتابخانە ...ئەویش نایەوێت بڕوات ،ئەوانیش زۆری لێ دەکەن،وای لێ یەت بەبێ چاودێری نەبێت وانەکان ناخوێنێت .. بەتەمەڵی وسستی دەیخوێند ..گەیشتە قۆناغی ناوەندی لەکۆتایداڕێژەیەکی مام ناوەندی هێنا فلاّن کۆلێج وەری گرت.

چونکە بەهۆی ڕێژەکەیەوە تەنها ئەوکۆلیژە وەری دەگرت ...لەوێیش چوارساڵ خوێندی وتەواوی کرد، پێ یان ووت:ئەوەی ئەو بڕوانامەیەی هەبێت دەبێ لەفلاّن کۆمپانیادا وەرگیرێ...بۆیە چوو بۆکۆمپانیاکەو دامەزرا و کاری کرد و موچەی وەرگرت ...پاشان داوای ژنی کرد، بۆچی ؟چونکە هەموو هاوتەمەنەکانی خۆی ژنیان دەهێنا ...بۆیە فلاّن ئافرەتی مارەکرد پاشان بوو بە خاوەنی منداڵیش ... بەردەوام کاری دەکرد و ماندوو دەبوو بۆئەوەی بژێوی بۆ خێزانەکەی مسۆگەر بکات و ئایندەیان بۆدابین بکات..پاشان وەفاتی کرد..ئەمە هەموو ژیان و بەسەرهاتی ئەو بوو...کارەکانی ئەو خراپ و ناقۆلاّنەبوون ... بەلاّم بەبێ ماناو بێ ئامانج بوو...هیچی تیادا بەدەست نەهێنا ...ئەم سەرگوزەشتەیە بەسەر زۆرێکماندا دەچەسپێت ؟! دەگەڕێینەوە بۆپرسیارەکە:چ ئامانجێکت هەیە لەژیاندا؟؟ئامانجم ئەوەیە کار لەکۆمپانیایەکی بەرێزدا بکەم .ئەمە.هۆکارە ..ژن هێنان هۆکارە. ئەمانە کۆمەڵێ هۆکارن بەمەبەستی ئامانجێك،خۆیان لەخۆیاندا ئامانج نین..ژیان بەبێ ئامانج ناخۆشەو بێ مانایە..ئەوەتا ئەو مرۆڤەی کەبەختەوەری ژیان بەسەردەبات و تام وچێژی هەیە ،ئەوکەسەیەکەخاوەنی ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرایە .

## هەرلەمنداڵیەوە ۰۰۰۰ دیاریکردنی ئامانجی فێردەکەن

منداڵان لەئەمەریکاو لەقوتابخانە بیانیەکاندا هەرلەتەمەنی حەوت ساڵیەوە لەهەفتەیەکدا وانەیەکیان هەیە کە زۆربەگرنگ دەیگرن ۰۰ئایادەزانی ئەو وانەیە چی یە ۰۰وانەی (( ئامانجی خۆت دیاری بکە لەژیاندا )) بێگومان منداڵان لەوکاتەدا لەماناکەی تێناگەن بەڵام بەپێ داگرتنی وردە وردە هەست بەگرنگی بیرۆکەکە دەکەن : ئامانجی خۆت دیاری بکەلەژیاندا ۰۰ هەموهەفتەجارێك تابابەتەکە لەمێشکیدا بچەسپێت .. وەجار دوای‌جار هەموو منداڵێك دەست دەکات بە گەڕان بەدوای ئامانجدا۰۰ لەپشوی سەری ساڵ و هاویندا بە کەسوکاری دەڵێن: منالەکەت دەیەوێ ئامانجی لەژیاندا بەوشێوەیە بێت ۰۰ بۆیە چاودێری منالەکەت بکە لەهاویندا ۰ ئەی دایکان و باوکان ۰۰ ڕۆڵی ئێوە تەنهاهەر ئەوەنیە خواردن بۆمنداڵەکانتان دابین بکەن و هەڵیانسێنن لەخەو تابەرەو قوتابخانەبڕۆن ۰۰ ئەمەپەروەردە نیە ۰۰ ئەمە کارگێڕیی پەروەردەییە۰۰ بەڵام هێشتا بەکاری پەروەردە هەڵنەستاون ۰۰ کە شتێك فێری منالەکەت بکەیت ۰۰ کە دانیشتیت لەگەڵیدا ۰۰ لێی بپرسیت ئارەزووەکانت چی یە ۰۰ گوێ ی لێبگریت و کاتێ کە ئامانجەکانی دیاریدەکات لەژیانیدا ۰۰ وەلەناخیدا بیچێنیت، ئەوە پەروەردەیە ۰۰ داوای لێبوردن دەکەم لەوە ی کەدەڵێم ئەو مرۆڤەی بەبێ ئامانج ئەژی ۰۰ دەژی لەپێناوی خواردن و خواردنەوە و خەوتن و خێزانداری ومناڵ بتخێوکردندا،پاشان دەمرێت ۰۰ وەکو دروستکراوەکانی‌تر وایە کەئەوان تەنها بۆئەوە دروستکراون ۰۰۰ زۆرگرنگە ئەگەر مرۆڤ لەپێناوی ئامانجیدا بژی هەوڵ بدات بۆبەدیهاتنی وە ئامانجێکی هەبێت لەژیاندا ۰۰ سودی نیە ژیان تۆلە گەڵ خۆیدا بەرێت... پێویستە تۆ جڵە وی ژیانت بەدەستەوەبێت ۰۰ مێشکت لەکارمەخە لەمێشکدا ماسولکەیەك هەیە کە هی بیرکردنەوە و زیرەکیە بەکاری بهێنە چونکە تواناکانی زۆر لەوەزیاترە کەبەکار دەهێنرێت .

## بۆچی دروست کراوین؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە : ئامانج لە ژیانی تۆدا چی یە ؟ پێویستە وەڵامی پرسیاری یەکەم بدەیتەوە.... بۆچی دروست کراوم ؟؟..

ئایا بروا دەکەن ئەم پرسیارە فەیلەسوف و زاناکانی سەرسام کردبوو ... وە کەس نەیتوانی وەڵامی بداتەوە بێجگە لە ئیسلام... زۆر بە ڕوونی و ئاسانی : .. سەرنجی ئەفلاتون بدە : لە ژیانیدا بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەگەڕا لە کۆتاییدا ئامانجێکی هەڵە و لۆژیکێکی نەخۆشخانەی دەستگیربوو ئەویش ئەوەبوو : پەروەردگارمان ئەم گەردوونەی دروست کردووە پاشان لەبیری کردووە –پەنابەخوا–ئەم ئایەتە وەڵامی ئەو جۆرە بۆچوونەیە ((وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّاً)) مريم /٦٤.. فەیلەسوفێکی تر سەری هەڵدا ئەویش مارکس بوو : وەڵامێکی تری دۆزیەوە کە زۆر سەیر بوو ئەویش ئەمە بوو : پەروەردگارمان گەردوونی بۆ گاڵتە دروست کردووە –پەنا بەخوا– ئەم ئایەتەش وەڵامی ئەو بۆچوونە دەداتەوە ((أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ)) مؤمنون :١١٥ واتە: ﴿ئایا پێتان وایە ئێمە بە بێهودەو بەبێ مانا ئێوەمان دروست کردووە و ، ئێوە ناگەڕێنەوە بۆلای ئێمە .

پاشان (ئیلیا ئەبو ماضی ) بۆچونێکی تری هەیە هۆنراوەیەکی درێژی نوسیوە بەناوی (تەڵسمەکان) تیایدا دەپرسێت : ئێمە لەم جیهانەدا بۆچی دروست کراوین ؟.. لە هۆنراوەکەیدا دەڵێت :

نازانم من لە کوێوە هاتووم ..بەڵام هاتووم ..لەبەردەمی خۆمدا ڕێگایەکم بینی ...پیایدا ڕۆشتم بەردەوام پیایدا دەڕۆم بمەوێ یان نەمەوێ ..چۆن هاتووم نازانم .. بۆکوێ ئەچم نازانم .. بۆچی هاتووم نازانم ..؟؟

ون بوون و تەمەن دەگوزەرێت.. کەس ناتوانێ وەڵامی ئەوانە بداتەوە بێجگە لە قورئانی پیرۆز.... با ئەم ئایەتە بخوێنینەوە ((وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)) الذاريات :٥٦ واتە : ﴿پەری و مرۆڤم دروست نەکردوە تەنها بۆ پەرستشی من نەبێت )) مانای چیە ئایا هەموو کاتەکانمان نوێژ بکەین و خوا پەرستی بکەین؟؟٠٠ بێ گومان نەخێر ٠٠بەشێوەیەکی سروشتی مومارەسەی ژیانی خۆت دەکەیت ٠٠بەڵام ئامانجی هەرەگەورەت کە ڕەنگ بداتەوە لەهەموو کردەوەکانتدا دەبێ ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت ٠٠مومارەسەی هەموو ژیانێکی ئاساییانەی خۆت بکە بەمەرجێ هۆشت بەیەك شتەوە سەرقاڵ بێت ٠٠ئەویش ئەوەیە کەهەموو شتێك موڵکی خوایەو هەموو کارێك کە دەیکەیت تەنیا لە ڕەزامەندی ئەودایە ٠٠بەمەبەستی شارەزابونت بەدیداری پەروەردگار لەڕۆژی دواییدا

٬ئەگەر ئەمەیەکەمین ئامانجت بێت ئەوەچەندین ئامانج دەستەبەردەکەی بەگەیشتنت بەڕەزامەندی خوا •

تۆئەی خوشکی بەڕێز ••بۆچی حەزدەکەی مندالّت ببیّ ؟؟••بۆئەوەی دلّخۆش بیت و یاریان لەگەلّدابکەیت ؟••نەخێر ٬پێویستە مەبەستت لەبونی مندالّدا ئەوەبێت کەپێویستە لەسەر پەرستشی پەروەردگار پەروەردە بن ٬تاگەورە بن و سودمەندبن بۆکۆمەلّگای ئیسلامی و حکومەتی ئیسلامی ••کەواتە هەموخولەکێك بەخەرجی دەدەیت لەپەروەردەکردنی مندالّەکەتدا بەپەروەردەیەکی ئیسلامیانە بەپەرستش دادەنرێت ••هەموو شیرپێدانێکت لەپێناوی بەندایەتیدا پاداشتی لەسەروەردە گیرێت •

## ئامانجت چی یە لەکۆکردنەوەی مالّ و ساماندا ؟؟••

پرسیارێکەوخوێنەری ئاراستەی تۆی دەکەم :بۆچی دەتەوێت مالّو سامانت هەبێت ؟؟بێگومان دەلّێی بۆئەوەی دلّ خۆش بمو خۆش گوزەران بم و ئەوەی دەمەویّ هەمبێت ••
..نەخێر..ئەوئامانجانەت بەجیّ نەنەهێنا کەتۆلەپێناویدا دروست کراویت ...پێویستە بلّێیت ئەمەویّ مالّوسامانم هەبێت لەپێناوی خوادابی بەخشم ..وەمندالّەکانم پەروەردەبکەم: بەپەروەردەیەکی ئیسلامیانە تاوەکو ئەوانیش خواناس بن ..
وەبەمالّو سامان خۆشەویستی خەلّك دەستەبەربکەم و یارمەتی دەریان دەبم لەخیّ بەحیّ کردنی پێویستیەکانیاندا ..وەسەروەت و سامان بەکار دەهێنم لەپرۆژەی خێریدا کەیا مەتی دەری هەژارەکانە لەپێناوی خوادا..کەواتە سامانەکەت و کردەوەکانت بەندایەتی یە بۆ خوا..بەوشێوەیەهەموو تاکە دینارێك و هەموونوکەخامەیەك بە پەرستش و بەندایەتی ئەژماردەکرێت .
برایانم ...هەمومان ماوەیەکی کەم دەژین و دەڕۆین ....
تکادەکەم تەمەنمان لەپەرستش و بەندایەتی ورەزامەندی خودابەسەربەرن..بەورێنماییە دەتوانیت ئامانجی حۆت دیاری بکەیت ..ئایا ئێستەئەزانیت بۆچی دروست کراویت ؟؟..بۆئەوەدروست کراویت کەبناسیت و بپەرستیت ..

